# نووسین بە ئاوی خۆڵەمێش

ژیاننامە و بیرەوەری

شێرکۆ بێکەس

لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی

ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

زنجیرەی کتێب ١٨

# نووسین بە ئاوی خۆڵەمێش

## ژیاننامە و بیرەوەری

بەرگی ٢

## شێرکۆ بێکەس


- بەرگ: فەرزاد ئەدیبی
- پێداچوونەوە و ڕێکخستن: مەریوان عەلی
- چاپ: یەکەم- ٢٠١٣
- چاپخانە: کارۆ
- تیراژ: ٣٥٠٠ دانە
- نرخ: ٢٠٠٠٠ دینار (نرخی دوو بەرگ)
- بڵاوکار: ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

لە بەڕێوەبەرایتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ١٧٤٤ی ساڵی ٢٠١٣ی پێ دراوە.

بڕیارمدا هاتوچۆی قاوەخانەی "هاڤانا" کەمبکەمەوە، نەک لەبەرخۆم، بەڵکوو ئەترسام بەهۆی منەوە لەو شاعیرو ئەدیبانەی سوریا بپێچنەوە .

هەر لەو چەند مانگەداو لەشام، ڕۆژێک لەچایخانەی "هاڤانا" پیاوێکی لەمن کورتترو لاوازترو چاو کزیش زۆر لەسەرخۆ هاتە لامەوەو وتی: (تۆ شێرکۆ نیت؟!) وتم بەڵێ: (وتی من "هادی ئەلعەلەوی")م، دیارە ناوو ناوبانگیم بیستبوو، بەڵام نەمدیبوو، ڕێزێکی زۆرم لێگرتو دانیشت. وتی: (من لای خۆمەوە نامەم بۆ ئەدۆنیسی شاعیر نووسیوە کە پێویستە تۆ بناسێتو هەوڵبدات لەگۆڤاری "مواقف"دا شیعرەکانت بڵاوبکاتەوە، جگەلەوەیش تۆ چوویت سەردانی "جەواهیری" بکەیت؟!) وتم: (نەخێر). وتی کەواتە سبەی پێش نیوەڕۆ بەیەکەوە ئەچینو سەری لێئەدەین. نابێ نەیبینی. چونکە ئەو شیعری "أخي بيكس"ی بۆ باوکت نووسیوە) .

ئەوە یەکەمجاربوو "هادی ئەلعەلەوی" ببینم، پیاوێکی سادەو ساکاربوو، بەڵام لەڕادەربڕیندا دەربارەی هەر شتێ بوایە، ڕاستوڕەوان و بێ پێچو پەنا قسەی خۆی ئەکرد .

هەواڵی مام جەلالی پرسیی و هەر خۆیشی وتی: (قسەم زۆرە بۆ ئەو، مەگەر خۆی ببینم و ڕووبەڕوو پێی بڵێم). سبەی پێشنیوەڕۆ لەکاتو شوێنی بۆدانراودا

یەکترمان بینی‌و هەر بەپێی بەرەو سەدام و بەعسییەکان بهاتایە ئەو ئەیوت "البلطـچیە."

ئەوکاتە هەمووی چەند ڕۆژێ بوو بیریاری ناسراو "حسەین مەروە" بەدەستی ئیسلامە توندڕەوە تیرۆریستەکان لەبەیروت کوژرابوو. کورتە شیعرێکم بەکوردی بۆ نوسیبوو، لەدواییدا تەرجەمەکراو لەڕۆژنامەیەکی بەیروت-دا بلاوکرایەوە. گەیشتینە ماڵی جەواهیری، خانوویەکی گەورەی بەرفراوانی بەباخچە و گوڵ، "هادی ئەلعەلەوی" وتی: (ئەمە وەختی خۆی ماڵی "ئەمین حافز" بوو، ئیستا ئەسەد داوێتی بەجەواهیری) لەزەنگمانداو چووینە ژوورەوە. لەهۆڵە گەورەکەی ئەم خانوەدا، "جەواهیری"مان بینی و هادی ئەلعەلەوی منی پێناساند.

من؛ وەختی خۆی بۆ یەکەمجار لەسلەیمانی‌و دوایی لەبەغداو کەرکوک دیبووم، بەڵام ئەوە سالانێکی زۆری بەسەردا تێپەڕیبوو، لەبیری نەمابوو. دووسێ جار لەسەریەک بەخێرهاتنی کردم، جەواهیری بەتەمەن بوو، بەڵام ئەوکاتە تەندروستی باش بوو. ژنەکەیشی "دایکی فورات" لەگەڵماندا دانیشتبوو. دیاربوو بەتەمەن لەجەواهیری بچووکتر بوو. جەواهیری کلاوەکەی سەری هەر هەمان کلاوبوو کە "کوردستان"ی لەسەر چنرابوو. لەجگەرە کێشانیشدا هیچی وای لە من نەگەڕابۆوە. نانی ئەونیوەڕۆیەمان پێکەوە خوارد.

جەواهیری؛ بۆ تیرۆرکردنی "حسین مەروە" بەخەم و پەژارەبوو، زۆربەی قسەکانی ئەو ڕۆژە دەربارەی ئیسلامی سیاسی و ئەو تیرۆرکردنەی حسەین مەروە بوو. لەوەختی قسەکردندا جەواهیری هەستاو چووە دەرەوە. دایکی فورات ڕوویکردە هادی ئەلعەلوی و وتی: (ئەم پیاوە، کە باسی مردنی لابکرێ زۆر ئەترسێ‌و جێگە بەخۆی ناگرێ. لەماڵەوە کەس ناوێرێ وشەی مردنی لەدەم بێتە دەرەوە). پاش چەند دەقیقەیەک جەواهیری هاتەوەو ئیتر ئێمەیش هەستاین‌و ماڵئاواییمان لێکردو چووینە دەرەوە.

جارێکی تریش لەساڵی (١٩٩١)دا لەبەیروت لەکۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقییەکاندا کە لەوێ بەسترا بۆ دواجار جەواهیریم بینییەوە. پێموایە یەکجاری تریش چاوم بە "هادی ئەلعەلەوی" کەوتەوەو ئیتر سەفەری ئەوروپامکرد.

وەختێکیش خەلاتی "تۆخۆلسکی" ئەدەبیم لەسوید وەرگرت، هادی ئەلعەلەوی یەکێک بوو لەو کەسانەی کەنامەی پیرۆزبایی بۆ ناردبووم. بەداخەوە لەساڵی (١٩٩٨)شدا لەشام کۆچی دواییکرد.

*من ئەوکاتە لە سلەیمانی بووم‌و چلەیەکی گەورەی لەهۆلی بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری بۆ گیراو، منیش یەکێک بووم لەو کەسانەی کە پەخشانێکی شیعر* ئامێزم بۆ نووسیبوو بەناونیشانی "ئەو پیاوەی بوو بە تاقگەیەکی تری زەلم"و هەر لەوێدا خوێندمەوەو دواتریش لەکتێبی پەخشانی "چراکانی سەر هەلموت"دا بلاوبۆوە.

چەند مانگێ بوو لە شام بووم، دۆستایەتی و ئاشنایەتییەکی زۆرم لەگەل سورییەکان‌و فەلەستینییەکاندا پەیدا کردبوو، بەلام لەبەر سۆراخ و تاقیبی موخابەراتی سوری هەمیشە دەستم هەر لەسەر دلم بوو! شپرزەو نائومێدبووبووم، هات و چۆی نووسینگەی "ی. ن. ک"م نەئەکردو د. خەسرەوم نەئەبینی، دلم لێی ڕەنجابوو. جاروبار کاک "عەبدولڕەزاق کۆیی"م ئەبینی‌و ئەگەر دەنگو باسێک هەبوایە پێی ئەوتم. ئەو ڕۆژگارانە لەشام بەدەیان ڕێکخراوو کۆمەلەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لێبوون، لەڕۆژێکدا بەدەیان بەیاننامەو بلاوکراوەیان دەرئەچوو. هەریەکەو لە ئاشێکی ئەکرد. لەچایخانەی "الروچە" کێت بویستایە ئەتدۆزییەوە. ناوەناوە سەری ئەویشم ئەدا .

لەنێو ئەو ڕووناکبیرە فەلەستینییانەدا "فەیسەل ئەلدەراج"یشم ناسیبوو، ئەو یەکێک بوو لەو کەسانەی لە کۆڕەکەی موخەیەم یەرموکیشدا دانیشتبوو. شیعرەکانی منی بەلاوە جوان بوو، چەند جارێکیتریش لە"هاقانا" یەکترمان بینییەوە، هەرخۆیشی بەرامبەر کێشەی کورد باش بوو. یەکێک لەو جیاوازییە زەقانەی لەنێوان عەرەبی سوریاو عەرەبی عێراقدا بەدیمکرد، زۆربەی زۆری سورییەکان ناسک‌و لەسەرخۆو هێواش بوون، ئەمە لەکاتێکدا عەرەبە عێراقییەکان هەمیشە زبرو شەڕانی‌و تووڕەبوون. من گەلێ ولاتم دیوە، بەلام وێنەی ژنی جوانی سوریام لەدنیادا کەمدیوە. تێکەلێکن لەنێوان ئەسمەر و سپی‌و چاوشین‌و چاوڕەشدا. هەندێ کەس ڕایان وایە ئەم جوانییە لەنەژادی فینیقییەکان‌و دواتریش لەفەڕەنسییەکانەوە هاتووە. جارێکیان پیاسەم ئەکردو چ کارێکم نەبوو، لەسەر شەقامێکی گەورەو لەپەنا کۆشکێکدا وەستابووم، لەدلی خۆمدا وتم، باسەر ژمێرێکی ژنە جوان‌و ناشیرینەکانییان بکەم، بابزانم لەکۆی سەد ژن‌و لەچاوی خۆمەوە چی ئەبینم؟!. لەوانەی بەرامبەرم ئەهاتن لێیان ورد ئەبوومەوە، بەکورتی لەکۆی ئەو سەد ژنە لەنەوەد زیاتر جوان و شۆخ‌و شەنگ بوون. هاوڕێکانم وتیان: (ئەگەر بچیت بۆ شاری "حەلەب" فریشتەی زۆر جوانتر

لەمانەی ئێرە لەوێ نەبینی!). وەک بیتەوە بیرم لەکۆنیشدا "جاحظ" ئەم سەرسوڕمانەی خۆی بەرامبەر ژنی جوانی سوریا دەربڕیوە!

ئەو چەند مانگەی لە شام بووم؟ لەڕێی نامەوە پەیوەندیم لەگەڵ دۆستو ناسیاوەکانی ئەوروپادا هەبوو. کاک "ئەحمە دەرویش" لەئیتالیابوو، نوێنەری ی. ن. ک بوو لەوێ، هەوڵیان ئەدا ڤیزەیەکی ئیتالیام بۆ وەربگرن. پێشتریش هەڵبژاردەیەک لەشیعرەکانم بۆناردبوون بۆ ئەوەی لە دەرفەتێکدا کەسانی شارەزا بدۆزنەوە تابیانکەن بە ئیتالی، بەلام ئیتر دەنگیان نەماو منیش لای خۆمەوە نائومێد بووم.

ڕۆژێکیان هەر لە هاڤانا دانیشتبووم، پێموایە کاک عەبدولڕەزاق بوو هاتو سلاویکردو وتی: (مژدەم بەرێ ڤیزەی ئیتالیات بۆ دەرچووەو بچۆ بۆ سەفارەتەکەیان لەفلان شوێن، پەساپۆرتەکەت بەرەو وەریبگرە!). ئەم هەواڵە ئەوەندە خۆش بوو، بڕوام نەئەکرد. ئیتر هەر یەکسەر کاغەزو قەڵەمو شتو مەکی پەرش و بلاوی سەرمێزەکەم کۆکردەوەو جانتاکەم خستە بندەستو تاکسییەکم گرت و چووم بۆ سەفارەتی ئیتالیا. پەساپۆرتیش ئامادە لەگیرفاندا. لەوێ لە پرسگەکەیان تەماشای تۆمارێکیان کردوو پەساپۆرتەکەیان لێوەرگرتم و وتیان (دوو ڕۆژی تر وەرەوە) .

هەر لەماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا لەئیتالیایشەوە ئەو برادەرانە ئاگاداریانکردمەوە کە ڤیزەکەم گەیشتۆتە سەفارەت. لەوەختی خۆیدا چوومەوە بۆ سەفارەت و ڤیزەیاندا لەپەساپۆرتە شڕەکەم، ئەو پەساپۆرتەی کە من هەرگیز بڕوام نەئەکرد ئەو هەموو خێرەم بۆ بداتەوە!. کەواتە ئیستا هیچ نەماوە، ئەوە نەبێت، بلیتی فڕۆکە ببڕم. هەر لەهێڵی ئاسمانی سوریا بلیتم بڕیو ئەو برادەرانەی ئیتالیایشم لەژمارەی گەشتی فڕۆکەکەو کاتی گەیشتنم بۆ فڕۆکەخانەی ڕۆما ئاگادار کردەوە.!

جەزائیر حەوت گۆڵی کردو
ناوی منیش لەسەر مقەبایەک بەرز کرابۆوە!

ئەوەتا، وائێستا بەئاسمانەوەم و بەرەو ڕۆما ئەفڕم. کەواتە لەم ساتەوە قۆناغێکی نوێو جیاوازی ژیانم دەستپێئەکاتو ئەزموونێکی تازەتریش بۆ شیعرو نووسینم دێتەکایەوە .

لەپەنا پەنجەرەکەدام و دەریای سپی ناوەڕاست لەخوارەوە ئەڵێی شیفۆنێکی شینی کاڵەو ئەبریسکێتەوە. لەم بەرزاییەوە، کەشتییەکانی ناو زەریا هەر ئەوەندەی ئەو کەشتییە بچکۆلانانە دیارن کەمنداڵێک لەناو حەوزێکدا یارییان لەگەڵدا ئەکات. بیرم ئەکردەوە: ئەبێ ئێستە نەسرینو دایکم و منداڵەکان لەکوێ بن؟! هاوڕێ خۆشەویستەکانم خەریکی چیبن؟!. چۆن بژین؟! من لەکوێ و ئەوان لەکوێ! تۆ بڵێی جارێکی تر بەدیداریان شادببمەوە؟ !

بیرم ئەکردەوە: ئەگەڕامەوە بۆ بەرگەڵوو بۆ میوانخانەکەو قسەی خۆشی برادەرەکانم و بۆ ژوورەکەم و نایلۆنی پەنجەرەکەو بۆ سلەیمانی و چایخانەی "شەعب" و چایخانەی "مام عەلی"و چایخانەی "کاروخ" و شەوانی یانەی سلەیمانی و یاری دەنکە شقارتەو لای مامۆستا عومەر عەبدولڕەحیم و گاڵتەکانی شێرزاد شەوقی و نوکتەکانی کەمال سابیر و گۆرانییەکانی بێگەرد و قاقای پێکەنینەکانی شێخ حەسیب قەرەداخی و بەزمی خشەی دێ و ئەچوومەوە ناو کۆڕی ئێوارانی یەکێتی نووسەران و ئەو سەردەمەی کە مامۆستایان: شێخ

محەمەدی خاڵ و مستەفا کوردی و هەردی و شاکیر فەتاح و موحەڕەم محەمەد ئەمین لەلقی یەکێتی نووسەرانی کورددا و لەگەڵ ئێمەدا کاریان ئەکرد. کاک مستەفا ساڵح کەریم؛ ڕێکخەرو دینەمۆی چالاکییەکان بوو. ئای مامۆستا شاکیر فەتاح! مامۆستا موحەڕەم یادتان بەخێر ..!

"شاکیر فەتاح" لەپێشەنگەکانی ڕووناکبیری سەردەمی خۆی بوو پیاوێکی باریکەلەی هێواش، لەبیرکردنەوەدا لەسەلامە موسای میسرەوە نزیک بوو، شارستانی بوو. لەڕیزی یەکەمی چیرۆکنووسانی کورددا بوو. پرۆژەی خوێندەواری ئەو زنجیرە نووسینە بوون کە لەشێوەی نامیلکەی بچووک بچووکدا و لەسەر ئەرکی خۆی چاپی ئەکردن و هەرجارەو خوێنەری کوردی ئەوکاتەی بەناودارێکی دنیا و سەرچاوەیەکی ڕۆشنبیری ئەناساند. لەدوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، بەداخەوە مامۆستا شاکیر فەتاح بوو بە ئەندامی ئەنجوومەنە تەشریعییەکەی حکومەت، ئەمەیش لەبەر دڵی ئێمەو هەموو خەڵکی گران و ناخۆش بوو. ئێمە وامانزانی کە ئیتر ئەمە کۆتایی ژیان و هەڵوێستی "شاکیر فەتاح"ە .!

بەڵام بەپێچەوانەوە، مامۆستا شاکیر لەناو ئەو ئەنجوومەنەوە بوو بەدەنگی گەلەکەیی و بەقەڵەمێکی نەترس و ڕووبەڕووی ڕژێم وەستایەوەو پەنجەی کرد بەچاوی بەعسییەکانداو گرتیان و داوای پەشیمان بوونەوەیان لێکرد، بەڵام ئەو نەک هەر پەشیمان نەبۆوە، بەڵکوو سوورتر بوو لەسەر قسەی خۆی. ئەوانیش هەر لەزینداندا شەهیدیانکرد !

"مامۆستا موحەڕەم محەمەد ئەمین"م لەو وەختەوە ئەناسی کە لەناوەڕاست و کۆتایی پەنجاکاندا ئەویش ناوبەناو هامشۆی چایخانەکەی "مام ساڵح"ی ئەکرد لە شەقامی مەولەوی. کورتە باڵایەکی لاوازی سەر ڕوتاوەبوو، لەچیرۆکنووسە دیارەکانی ئەو سەردەمە بوو. ئەو وەختەی کۆمەڵە چیرۆکی "سەیرانەکەی ئەزمڕ"ی دەرکرد، ئێمە تازە لەسەرەتای ڕێگەدا بووین. هەر بەیەکەم کۆمەڵە چیرۆک، دەرگایەکی ڕووناکی لەسەر خۆی کردەوە. لەدنیای کورتە چیرۆکی ئێمەدا، موحەڕەم محەمەد ئەمین، بەیەکێک لە پێشەنگە نوێخوازەکان لەقەڵەم ئەدرێت. کۆتایی ژیانی ئەم نووسەرە گەورەیەیش، تراژیدییانەبوو، خۆی نەخۆش بوو، سەرەڕای ئەوە ئاسایشی سلەیمانی بۆ لێپرسینەوە ڕاپێچی ئەکەن. ئەم گوشارە لەناکاوەی دوژمن ئەوەندەی تر تەندروستی خراپ ئەکاو بەرگەی

ئەو شالاوە ناگرێ و دڵە گەورەکەی لەلێدان ئەکەوێ و بۆ هەتاهەتایە بەجێماندێڵێ.

فڕۆکە ئەچێتە هەورو سەرو هەورو لەژێرەوە دەشتێک لەشێوەی لۆکەی شیکراوەدا ئەبینم. بەڕێکەوت دەست ئەدەمە ڕۆژنامەیەکو لاپەڕەکانی هەڵئەدەمەوەو لەلاپەڕەی وەرزشدا ناوی هەڵبژاردەی تیپی تۆپی پێی جەزائیرم بەرچاو ئەکەوێتو ئیتر ئەم ناوەو ئەم تیپە ئەمگەڕێنێتەوە بۆ سی ساڵێ لەوەوبەر..

بەچەند مانگێ دوای کودەتای تەمووزی (١٩٥٨)، هەواڵێ لەسلێمانیدا بلاوبۆوە کە تیپی هەڵبژاردەی تۆپی پێی جەزائیر گەیشتۆتە بەغداو دوای یارییەکانی ئەوێ، سەریش لەچەند لیوایەکی عێراق ئەدەنو یاری لەگەڵ هەڵبژاردەی سلەیمانیشدا ئەکەن. ئەوکاتە من تەمەنم هەژدە ساڵ بوو. ناو بەناویش ئەچووم بۆ سەیری ئەویارییانەی کە تیپەکانی سلەیمانی لەنێوان خۆیاندا ئەیانکرد. ڕۆژێک وتیان فلانە ڕۆژ یارییەکەیە. دنیا تەواو ساردی کردبوو، پێشتر بارانیش باریبوو، ئەرزی بەتەواوی تەڕکردبوو. ئێمەیش پێش وەخت چووینو هەر لەشوێنی یاریگەی ئێستەی سلەیمانی، بەگەچ خەتەکانیان کێشابوو، کایەکی زۆریان بەیاریگاکەوە کردبوو. سەرپەرشتیکەرانی وەرزش سەرقاڵبوون و لە هاتوچۆدا بوون. خەڵکێکی زۆر هاتبوون بۆ سەیری یارییەکە. تیپی هەڵبژاردەی جەزایر فانیلەکانیان سەوزو سپی بوو، ئارمی بەرەی ڕزگاریخوازی جەزائیریان بەسەرەوەبوو. یاریەکە دەستیپێکرد، مامۆستا قادر خەلیل ناوبژیوان بوو. ئەوانەی لە یاریزانانی سلەیمانی بێنەوە بیرم ئەمانەبوون: "قالە ڕەش گۆڵچی بوو، یاسین حەمە ساڵح و شێخ تالیب و مەلا قادر و حەمە فەتاح و حەمە بۆر یان تێدابوو". ئێمە لەبەرئەوەی تیپی بەهێزی وڵاتانی ترمان نەیدبوو، وامانئەزانی هەڵبژاردەی سلەیمانی وێنەی کەمە هەر لەدەقیقەکانی یەکەمدا جەزائیر گۆڵێکی کردوو، بەیاریکردنیان ئێمەیان سەرسامکردبوو، بەکورتی جەزائیر حەوت گۆڵی کردوو لەدوایشدا پەناڵتیەک بۆ سلەیمانی دروستبوو کە جێی گومان بوو، پێموایە یاسین شوتەکەی لێداو بوو بە حەوت بەیەکو یاریەکە کۆتایهات.

دەنگی کاپتنی فڕۆکەکە وریای کردمەوە "دوای دە دەقیقەی تر لەفڕۆکەخانەی نێو دەوڵەتی ڕۆما ئەنیشینەوە."

دابەزین و دوای ئەوەی جانتاکەم وەرگرتەوە، جانتاکەم ئەمجارەیان جانتایەکی گەورە بوو جلوبەرگ و پێداویستی زیاتری تێدا بوو، جگە لەدیوانەکان و

کۆمەڵێ کتێبی تازەیش، بەخۆم و عەرەبانەکەوە ڕوومکردە دەرگای دەرەوە، بەلاَم کۆنترۆڵی پشکنین ڕایانگرتم و منیش لامداو دووکەس هاتن و بەخۆم و جانتاکەوە بردمیانە ژوورێکەوە دەستیانکرد بەپشکنین، بەلاَم چۆن پشکنینێ بەوردی بێئەوەی شتێکی لێدەربکەن، گیرفانی جلەکانی ناو جانتاکەیش ئەگەڕان، تەنانەت تەماشای ناو پاکەتە جگەرەیشیان ئەکرد. ئینجا خۆیشمیان ڕووت و قووتکردەوە. هەندێ لەدیوانەکان جزوبەند کرابوون، ئەوانەیشیان هەڵچڕیو تەماشایانکردن. من تێنەگەیشتم ئەمە چییە، لە دواییدا زانیم ئەمە هەمووی گەڕانە بەشوێن تلیاکو هێرۆینو ماددە بێهۆشکەرەکانداو ئەم گوشارەیش لەسەر خەتی ئاسمانی وڵاتە عەرەبییەکان زۆرترەو چەند جارێک لەم خەتانەدا خەڵکیان بەو ماددە قاچاخانەوە گرتووە. بەهەرحاڵ منیان ئێجگار ماندووکرد، هەناسەبڕکێم پێکەوتبوو. ئینجا سەرلەنوێ جانتاکەم ڕێکخستەوە. لاموایە من دواکەس بووم چوومە دەرەوە. خەمی ئەوەم بوو ئەو کەسەی هاتووە بە پیرمەوە وەڕسبووبێو ڕۆشتبێ. کە چاومگێڕا ناوی خۆم لەسەر مقەبایەک بینی کە یەکێک بەهەردوو دەستی بەرزی کردبۆوە. من پێشتر ئەو کەسەم نەدیبوو. چوومە لایەوەو وتم من فلاَنم و ئیتر باوەشمان بەیەکدا کرد.

بەرەو مایكل ئەنجیلۆو دانتی؛
تیلماسێم بەرەو ئاینده..

کاک "سەردار عەلی عەزیز" لەفلۆرەنساوە هاتبوو، یەکێک بوو لەو کەسانەی دڵسۆزانە کاری بۆ وەرگرتنی ڤیزەکەم کردبوو، جگەلەوەیش ئەم بانگهێشتەی من بۆ ئیتاڵیا- فلۆرەنسا لیژنەی مافی مرۆڤی ئەو شارە لەئەستۆی گرتبوو، کە خاتوونێک سەرۆکی بوو، بە داخەوە ناوەکەیم لە یاد نییە!

کاک سەردار عەلی عەزیز؛ لەم لیژنەیەشەوە زۆر نزیک بوو، پەیوەندی بەردەوامی لەگەڵیاندا هەبوو، ئیتر بە هەوڵی کاک سەردارو هەمووان، وەرگرتنی ڤیزەو ئینجا بانگهێشتەکە بۆ ماوەی دەڕۆژ جگە لەبلیتی فڕۆکە بەئوتێلو خواردنو خواردنەوەوە جێبەجێبووبوو. پێموایە ئەوکاتە کاک سەردار بێلایەن بوو، پەیوەندی بەهیچ حزبێکەوە نەبوو. لەلایەکی تریشەوە کاک "ئەحمەد دەرویش"و برادەرانی تر لەم هەوڵەدا درێغیان نەکردبوو. داوتریش هەرماڵی ئەوان بوو بە ماڵم! کاک سەردار ئەرکێکی زۆری کێشابوو لەفلۆرەنساوە بەشەمەندۆفێر هاتبوو بەپیرمەوە. پێی وتم: (بلیتی شەمەندەفەرم بۆ تۆیش بڕیوەو هەر ئەمڕۆیش دوای پشوودانێک ڕووەو فلۆرەنسا بەرەو ژوور ئەبینەوە) .

لەڕۆما فریای ئەوە نەکەوتین سەردانی هیچ شوێنەوارێک بکەین، چاویشمان بەکەس نەکەوت. بەڵام هەموو دیمەن و شوێنەکان بۆ من تازەو نەبینراوبوون.

دووراو دوور پایەو پاردەو قوللەی ئاسەوارە کۆنەکانم ئەبینی. تێبینی ئەوەمکرد ئەم هەموو ڕێبوارو خەڵکە لەجووڵەیەکی خێرای بەردەوامدان‌و کەسیش تەماشای کەس ناکاو کەس لەسەر شۆستەکان ڕانەوەستاوەو هەریەکەو سەرقاڵی ئیشی خۆیەتی‌و لەم پوورە هەنگەدا کەسێک لە کەسێک ناکەوێت .

دوای ئەوەی نانمان خواردو بۆ یەکەمجاریش تامی شەرابی سووری ئیتاڵی- مکرد، کاک سەردار وتی: (ئیتر ئەبێ بەرەو وێستگەی شەمەندۆفێر بڕۆین). وێستگەی شەمەندۆفێرەکە جەمالۆنێکی ئێجگار بەرزو بڵندی هەبوو، ناوەکەیشی ئێجگار بەرفراوان و گەورەبوو. جمەی ئەهات لەگەشتکەران‌و تابلۆیەکی ئێجگار گەورەیش لەناوەڕاستدا هەڵواسرابوو، کە زوو زوو ناوی شوێن‌و گەشتەکان ئەنوسران و ئەگۆڕان و خەڵکەکەیش چاوێکیان هەر لەسەر ئەو دیوارە هەڵواسراوە بوو. لەکاتی خۆیدا سواربووین‌و کەوتینە کابینەیەکی جوانەوەو من لەسەر کورسی لای پەنجەرەکەو کاک سەرداریش لە تەنیشتمەوە دانیشت. لە ڕۆماوە بۆ فلۆرەنساو بەشەمەندۆفێر ڕێگایەکی دووروودرێژە، بەڵام هەستمئەکرد تابەرەو ژوور بینەوە دیمەنەکان جوانترو جوانتر ئەبن .

ئەم دارستانانە لەدارستانی لای خۆمان ناچن. ئەمان سەوزسەوزو ئاوی چاو ئەبەن‌و ئەوانەی لای ئێمە تۆزو خۆڵاوین. کەم شوێنم ئەبینی ڕووتەن و بێ دارو درەخت بێ. شوێن نەبوو هاوینە هەوار نەبێت و وەختێ تەماشای دوورترین شاخ و لوتکەم ئەکرد. دەستی شارستانی و ئاوەدانی گەیشتبوونێ و هەر لەلایانەوە تەلارو قوببەی ڕەنگاوڕەنگ چووبوون بە ئاسماندا‌و ئەبریسکانەوە .

لەڕێگە تۆزێ بەدوورو درێژی باسی بارودۆخی کوردستان و ژیانی پێشمەرگەیاتیم بۆ کاک سەردار کرد. کاک سەردار کوڕێکی بێدەنگ بوو، ئەیزانی لەکوێدا قسە ئەکات‌و چی ئەڵێ. قسەی لەبەر قسە نەئەکرد. ئەوەی برینی گەورە بوو لەدڵی ئەودا و بەردەوام باسی ئەکرد شەڕی ناوخۆ بوو. ئەیوت: (گیروگرفت دڕندەیی دوژمن نییە. نەهامەتی گەورە خۆمانین) .

هەر لەیەکەم دەقیقەوە ئەم گەنجەم خۆشویست‌و چووە دڵمەوە. شەمەندۆفێر هەر ئەڕواو ڕێ ئەبڕێ و منیش لە پەنجەرەوە تەماشام مەستی جوانی سروشت و خەیاڵم ئاونگاوی و شیعر لەدڵما خەریکی قوزاخە هەڵپێچانە، لەناو زمانێکدا کەهێشتا نەکەوتۆتە سەر کاسەی کاغەز. بیرم ئەکردەوە: وڵاتەکەی ئێمەیش چەند جوانە. بەڵام چەند بەدبەخت و کڵۆڵە چەند چەوساوەو سەرکوتکراوو دەم

بەستراوە. دنیایەکیشە کەس ئاگای لە کەس نییە. هەموو جیهانیش لەئاستی کورددا کەڕەواڵەیە، کوردیش خۆی لەگەڵ خۆیدا جانەوەرەو لەبەردەم داگیرکەرانیشدا زەلیل و بچووک .

کاک سەردار لەڕێگە هەر زوو ئەوەی تێگەیاندم کە ئیتاڵیا پەناهێندە وەرناگرێ، ئەو کۆمەڵە کوردەیش کەلەوێ ئەژین زۆربەیان خوێندکارن و کەس و کاریان لەوڵاتەوە پارمەتییان بۆ ئەنێرن، یاخود خۆیان لەلاوە کرێکاری ئەکەن و لەچێشتخانەکاندا ئیش ئەکەن و بەو داهاتانە خۆیان ئەژێنن. کۆمەڵێکیش لەو وێنەکێشە کوردانەی کە لە فلۆرەنسان، بۆ بژێوی ژیان، ناچارن لە گۆڕەپان و شوێنە گشتییەکاندا دابنیشن و بەخێرایی پۆرتریتی ئەو گەشتکەرانە بکێشن کەئەیانەوێ بۆ یادگار ئەو وێنانە لای خۆیان هەڵبگرن.

ئاسۆی بەرفراوان و هەورو ساماڵی تێکەڵ و بریسکە بریسکی ڕووباری بەر هەتاو، هەست و نەست ئەجووڵێنن و ئەتخەنە سەر باڵی خەیاڵ و ئەدەن لە شەقەی باڵ و ئەتبەن. جا گەڕانەوە بێ بۆ جاران و یان بەرەو چارەنووسی نادیار. تۆبڵێی شیعرەکان بە باشی تەرجەمەی ئیتاڵی کرابن؟! یان هەموو وەرگێڕانێک وەک سەرئەنجام هەر ساردو سڕ دەرئەچن و ئەبێ بەمیوەی گوشراو! لەدەمێکەوە ئیتاڵییەکان وتویانە: (وەرگێڕانی شیعر جۆرێکە لە خیانەت).

'ڕەسووڵ حەمزاتوف'ی شاعیریش وتویەتی: (وەرگێڕانی شیعر لەگوڵی ئەودیوی قاڵی و مافوور ئەچێ). بۆ خۆیشم جارێک لە دیدارێکدا وتم: (وەرگێڕان لەماچی نێوان دوو خۆشەویست ئەچێ، بەڵام لەودیوی دیوارێکی شووشەوە!). بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا هیچ ڕێگەیەکی تر نییەو ئەبێ ئەم پردە هەر ببەسترێ، تازمانە جیاجیاکانی ئەم دنیایەی بەسەردا بپەڕنەوەو بگەنە لای یەک. لێرەیشدا جیاوازییەکە هەر ئەوەیە: وەرگێڕانی باش هەیە و وەرگێڕانی خراپ. ئەگینا مەحاڵە هەناسەو ترپەی دڵ و کسپە تەرجەمە بکرێن، مەحاڵە مۆسیقای وشەو ڕستە وەربگێردرێن .!

وەرگێڕانی ئەدەبی پەخشان، ڕۆمان و چیرۆک، یان شانۆنامەکان، گیروگرفتی وەرگێڕانیان کەمترە، چونکە ئەوان زمانی مەنتیق و عەقڵیان لەگەیاندندا زاڵترە، هەرچی شیعریشە هێماو ڕەمز و خواستە و لێکچوون و ئاماژەی ناڕاستەوخۆو نۆتەی مۆسیقاو ئاهەنگی هەنگاوو بڕگەن و ناگوێزرێتەوە بۆ ناو زمانێکی تر، زمانی مەجاز، وەرگێڕانی، گەلێ ئەستەمەو هەرگیز وەک بوونی لەناو زمانەکەی خۆیدا بۆ ئەویتر ناگوێزرێتەوە. وەرگێڕ نووسەری دووەمی هەموو دەقێکە. ئەم

هەر وشە ناگوێزێتەوە. بەڵکوو هەوڵەدا ڕۆحی ماناو دەستەواژەکان لەزمانەکەی تردا بدۆزێتەوەو ئینجا ئاوێتەی یەکتریان بکات! هونەری وەرگێڕان بەتەنها کورت ناکرێتەوە بۆ ئەوەی کە وەرگێڕ پێویستە هەردوو زمانەکە بزانێت و بەس! لێرەدا پرسیارێکی گرنگ یەخەمان ئەگرێت: ئایا ئەو زانینی زمانانە، بۆ وێنە لە زمانی ئینگلیزیدا، لەکام بواردا و لەچیدا؟! زمانی ئەدەب؟! زمانی زانست؟! زمانی ئابووری؟! کام زمانیان؟ !

دیارە قورسترین جۆری زمانیان، زمانی ئەدەبییە، چونکە پانتاییەکی ئێجگار بەرفراوانی لەهەموو کولتوورێکدا گرتووە. جگەلەوەیش پێویستە وەرگێڕ شارەزای ئەزموونی ئەدەبی ئەو ئەدیبەبێ کە کارەکانی وەردەگێڕێ، لەیەکەم هەنگاوەوەو ئاگای لەهەڵکشان و داکشان بێ. تەنانەت پێویستە بەشێوەیەکی گشتی ئاگای لەکلتووری وڵاتی ئەو نووسەرو شاعیرەیش بێ کە ئەم کارەکانی وەردەگێڕێ .

وەرگێڕان؛ هونەرەو سەلیقەیە و زمان زانینەو کارکردنی بەردەوامەو درککردنە بەپێچ و پەناو نهێنیەکانی ناو زمان. وەرگێڕان وەستایەتییە. من بۆ خۆم سەبارەت بەوەرگێڕانی شیعر، ڕام وایە ئەگەر شاعیر بیکات جوانتری ئەکات .

زۆرجار ئەو شیعرانەم کە وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی عەرەبی، ئەیانخوێنمەوە، بەڵام نایانناسمەوە! لەڕۆحەوە شێوێنراون. چونکە وەرگێڕ بەتەنها لەڕواڵەتی زمانەکەدایەو بەرەو قوڵایی شۆڕنەبۆتەوە. وەک چۆن لەکاتی نەشتەرگەریدا بڕینی دەمارێک بەهەڵە ڕەنگە لەسەر ژیانی خاوەنەکەی بکەوێت، هەروایش بەهەڵە وەرگێڕانی وشەیەک و وێنەیەک ڕەنگە لەسەر ژیانی شیعرەکە بکەوێت. من لەبەرئەوەی ئەو زمانانەی تر نازانم و شارەزانیم کە شیعرەکانیان بۆ وەرگێڕدراوە، لەبەرئەوە ناشزانم چۆنییەتی وەرگێڕانەکان چۆنن.!

بەهەشتێکی تری سەرزەمین، باکووری ئیتاڵیایە! هەندێجار وامئەزانی ئەمە خەوەو ڕاستی نییە. کاک سەردار وتی: (سەعاتێکی تر ئەگەینە فلۆرەنسا). من لەگەڵ هەموو ناوهێنانێکی فلۆرەنسادا "مایکل ئەنجلۆو دانتی"م بیرئەکەوتەوە. تائێستە هەر لەوێنەدا ئەودیمەنانەم بینیبوو، پەیکەرەکانی ئەنجیلۆو، گۆرەپانەکانی فلۆرەنسا، بەڵام وائێستە خەریکە ئەم خەونە دێتە دی و چەند دەقیقەیەکی تر ئەگەمە لایان‌و دەستیان تێوەئەدەم .

لەئوتێلێکی جوانی شەش حەوت نهۆمیداو لە فلۆرەنسادا ژووریکیان بۆ گرتبووم. وەختێ جانتاکەمیان هەڵگرتو منیش بەدوای پێش خزمەتدا خۆمان کرد بەژوورەکەدا. ئەو جانتاکەی داناو ئیتر چووە دەرەوە. کە تەماشای ژوورمکرد ڕازاوەو پاک و خاوێن و ئەوە یەکەمجاربوو لەژیانمداو لە ئوتێلدا ژووری وا دڵفرێنم ببینێ. سیسەمێکی دووکەسی زۆرگەورە. بەشێکی ژوورەکە ئاوێنە بەندو چلچرایەکی کریستاڵ لەناوەڕاستی بنمیچەوە شۆڕبووبۆوە. تەلەفزیۆن‌و مێزو کورسی، بەڵام نەخشەسازییەکان لەسەر تەرزی سەدەکانی ناوەڕاست نەخشێنرابوون. بانگهێشتەکەم بۆ ئەم ئوتێلە لەسەر بودجەی لیژنەی مافی مرۆڤی فلۆرەنسابوو. هەر لەقاتی خوارەوەیش چێشتخانەیەکی گەورە هەبوو بۆ هەر سێ ژەمەکەو، بۆ دووکەس، ئەویشیان بەرەو ڕووکردبوومەوە. ئیتر لەیەکەم ڕۆژەوە کاک "ئەحمەد دەرویش"م لەگەڵدا بوو، هەروەها چەند هونەرمەندێکی کوردی دانیشتووی شاری فلۆرەنسا، کە دواتر یەکەیەکە هەموویانم لەنزیکەوە ناسیی و هەر هەمووشیان دڵسۆزانە بۆ گەڕان و بینینی شوێنەوارە گرنگەکان لەگەڵمدا بوون‌و قەرزاریانکردم .

لەگەڵ ئەو برادەرە نزیکانەدا چووین بۆلای خاتوونەکە، ئەو کاتە تەمەنی نزیکی شەست ساڵ ئەبوو، بەڵام هەموو گیانی پڕ لەچالاکی و جووڵەبوو. جانتایەکی چەرمی دەستی بەدیاری پێشکەشکردم.

قسەمانکردو پێیوتم: (هەر لەو ڕۆژانەیشدا لەفلۆرەنسا، کۆڕێکی شیعر خوێندنەوەم بۆ ڕێکدەخەن). دیارە زۆر سوپاسمکردن، کە لەوەختێکی تەنگانەداو لەبارێکی دەروونی زۆر ئاڵۆزدا فریامکەوتن و ڤیزەیان بۆ نادرم و هاتمە ئیتاڵیا. بەڕاستی بایەخی زۆریان پێدابووم. هەر لەو دانیشتنەدا یان بۆ ڕۆژی دوایی بوو کاک ئەحمەد دەرویش و هاوڕێکانم "گابریل" کاندیدی پەرلەمان و ئەندامی دیارو ناسراوی حزبی سەوزی ئیتاڵیا، کە بەتایبەتی بۆلای من هاتبوو پێناساندم .

ئەم پیاوە مرۆڤ دۆست و ئازادیخوازە، بەڕاستی دۆستێکی نزیکی گەلی کوردو پاڵپشتێکی گەورەی مەسەلەی چارەنووسی ئێمە بوو. لەو وەختەدا، تەمەنی چل ساڵ ئەبوو. ڕیشێکی تەنکی هێشتبۆوە. شیکو قۆزو دەم بەپێکەنین، دیارە ئەمیش هەر لەسەرەتاوە یەکێک بووە لەوانەی لەگەڵ خاتوون، کاری بۆ جێبەجێکردنی ڤیزەکەم و ئەم سەفەرو مانەوەیەم کردووە. دوای چەند ڕۆژێ، کاتو شوێنی کۆڕەکەم دیارییکرا. بۆ من چی لەوە خۆشتربوو، وەختێ

بەشەقامەکانی فلۆرەنسادا پیاسەم ئەکرد، ئەمبینی بەدیوارو پایەکانەوە پۆستەری کۆرەکەم کەدریژی مەتریک زیاترو پانی نیو مەتر ئەبوو، هەڵواسرابوون و بەخەتی گەورەو بەجوانی لەسەریان نووسرابوو، ئەمەیش بۆ یەکەمجار بوو لە فلۆرەنساو ئیتاڵیادا کۆری لەمجۆرە بۆ شاعیرێکی کورد ببەستریێ. (تا ئێستەیش نموونەیەکی ئەو پۆستەرەم لای خۆم هەڵگرتووە) .

ئەم پێشوازییە، گورو تینێکی تازەی دایەوە بەجەستەم و هەستمکرد دنیا هێشتا ئەو مرۆڤ دۆست و خەمخۆرانەی کوردی هەر تیاماوەو لەم تاریکستانەی ئێمەدا ناوبەناو مۆمێک لێرەو مۆمێک لەوێ تروسکەیاندێ و لەرێی تیلماسکێکی باریکیشەوە بێت نائومێدمان ناکەن، لەوەی ئەشێ ئاینده پەنجەرەی زۆر رووناکتر لەگەڵ خۆیدا بێنێ .!

لەفلۆرەنسا؛

شیعری مامەڕیشەم نەخوێندەوە!..

وەک وتم؛ پێشتر چل پارچە شیعرم بۆ ئەو براو دۆستە کوردە خۆشەویستانەی ئیتاڵیا ناردبوو، تا وەربگێڕدرێنە سەر زمانی ئیتاڵی. ئەوانیش بەخۆیان‌و بە هاوکاری هاوڕێ و دۆستە ئیتاڵییەکانیان وەریانگێڕابوو .

وەختێ من گەیشتم، هێشتا دە پانزە شیعرێکیان تەواو نەبووبوون، بەئاگاداری خۆیشم دوای ئەوەی پرسیاریان ئەکرد، ئەو کۆمەڵەیش تەواو کران و بەمجۆرە نزیکەی چل و دوو کورتە شیعر لەبەردەستدا بوون بۆ ئەوەی لە کۆڕەکانی ئیتاڵیادا بیانخوێنمەوە. کورتە شیعرەکان لەبەرئەوەی یەک وێنەو بیرۆکەو هەڵوێستییەک لەشێوەی هێشوویەکی ماناو فۆڕمدا ئەگرنەخۆ. یان یەک زنجیرە وشەن و ئەڵقە لەدوای ئەڵقە تەواو ئەبن. وەرگێڕانیان بۆ هەر زمانێک بێ، ئاسانتر دێ بەدەستەوە وەک لەقەسیدەی درامی درێژی لق و پۆپدار، بەدەنگ و دیالۆگی جیاوازو فۆڕمی هەمەڕەنگەوە، کە دیارە وەختی زیاترو ماندووبوونی زیاتریان ئەوێت. بۆیە من بەدرێژایی ئەو ساڵانەی لەئەورووپابووم ئەگەر کۆڕێک ببوایەو بەزمانی کوردی و زمانێکی تر ئینگلیزی، فەڕەنسی، سویدی، ئیتاڵی هتدو بخوێنرایەوەو گوێگری ئەو زمانانە میوان بوونایە، ئەوا من هەر کورتە شیعرەکانم بۆ ئیلقاکردن هەڵئەبژارد، بەڵام ئەو کۆڕانەی کە بەتەنها کورد ئامادەی بوونایە، شیعری درێژیشم تێدا ئەخوێندەوە .

ئەمە جگەلەوەی بەئەزموونی خۆم لەوەگەیشتبووم و ئەمزانی بۆ هەر کۆڕێک بەگوێرەی چۆنییەتی پێکهاتەی گوێگرانی کام شیعر ئەخوێنمەوەو چی ناخوێنمەوە. ئەوەی ڕاستیشبێ ئەم جیاکردنەوەو بژارانە بۆ هەر شاعیرێک دوائیەوەی سەرنج لەجۆری پێکهاتەی کۆڕەکانی ئەدا، مەسەلەیەکی گرنگە. چونکە خوێندنەوە بۆ خوێندکارانی زانکۆ، هەمان خوێندنەوە نییە بۆ کرێکاران و کاسبکاران، هەمان خوێندنەوەیش نییە بۆ هەڵبژاردەیەک لە شاعیران و نووسەران و هونەرمەندان .

من ئەو شیعرانەی لەسالانی (١٩٨٥-١٩٨٦)داو لەشاخ بۆ "پ. م" و خەڵکی گوندەکانم ئەخوێندەوە، بەشی هەرە زۆریانم لەئەوروپا نەئەخوێندەوەو ڕەنگە لەدووسێ شیعرێ بەولاوە، هیچیانم هەڵنەبژارد بۆ ئەوەی بۆ زمانێکی تر وەربگێڕدرێن. بۆ نموونە شیعری "مامە ڕیشە" لای سویدییەک یان ئەڵمانییەک چی ئەگەیەنێ؟ یان چ تام و چێژێکی لێوەرئەگرێ؟! بە بەراورد لەگەڵ کوردێکداو لەناو کوردیشدا بۆ کوردی باشوورو لەناو ئەوانیشدا بۆ "پ. م"ەکان و خەڵکی گەرمییان! هەر لەبەر ئەوەیش بەشی زۆری ئەو هەڵبژاردەیەی وەرگێڕدرانە سەر زمانەکانی تر، لەهەردوو دیوانی "کازیوە"و "ئاوێنە بچکۆلەکان"ەوە وەرگیرابوون.

لەسالی (١٩٨٧ تا ١٩٩١) بەدەیان کۆڕی شیعر خوێندنەوەم بۆ گیراوەو لەلاپەڕەکانی داهاتوویشدا دوورودرێژتر باسیان ئەکەم. ئەم ئەزموونە ڕاست و دروستی ئەو ڕاوبۆچوونەمی دەربارەی کورتە شیعرەکان جێگیرکرد، کەخێران و لەشێوەی برووسکەیەکدا ئەگەنە گوێگر. بەکەمترین وشە زۆرترین مانا دەرئەبڕن، ناهێڵن خەیاڵی گوێگر پەرت بێت. ڕواڵەتەکان تەنکو چڕبوونەوە زۆرترە وەک ئەوەی یەکەو ڕاست بچێتە ناو هەوێنی شیعر خۆیەوە. گوێگر تووشی وەڕسبوون نابێت. زوو زوو وێستگەکان ئەگۆڕدرێن. ڕەش و سپی نین و ڕەنگاڵەن. بەمجۆرە لەبەردەم چێژ وەرگرتنی گوێگردا، لە ئەگەرێک زیاتر ئامادەیی هەیە، یان بابڵێم: لەباتی ئاوازێک چەندین ئاواز، لەباتی تابلۆیەک چەندین تابلۆ، لەباتی یەک دەنگ چەندین دەنگو لەجێی ڕەنگێک چەندین ڕەنگی جیاجیا چون پێشانگایەک لەئارادایە.

لەناو جەرگەی فلۆرەنسادا، دەمەو عەسر وەختی گرتنی کۆڕەکەبوو. هۆڵەکەو نەخشی بنمیچ و سەر دیوارەکان ئەتوت لەناو کۆمەڵێ توحفەی هونەریدای، تێکەڵ لەوێنەو پەیکەرو زەخرەفەی هەمەجۆر، ئەسپ و سروشت و فریشتەی

باڵدار و باڵندەو دارو درەخت و ژن و وپیاو بە بەرگی ئەو سەردەمەی خۆیانەوە، مریەمی پاکیزەو عیسا لەناو ئاپوورەی خەڵکیداو زۆر دیمەنی تریش. ئەو کورسییانەی هۆڵەکەی ئەکرد بەدووکەرتەوە نزیکەی (٢٥٠-٣٠٠) کورسی ئەبوون. شوێنی دانیشتنی ئێمەیش لەپشت مێزێکی درێژی سەر شووشەبەندەوە ڕوو لەخەڵکەکە دانرابوو، لەبەردەمیشدا چەند مایکرۆفۆنێک و گوڵدانێک .

ئێمە چوارکەس بووین. "گابریل" و شاعیرێکی ئیتاڵی باریکەلەی سەر ڕووتاوە کە بەمەزندە هەر لەسییەکانی تەمەندا ئەبوو. کاک "ئەحمەد دەروێش" و من. بەردەوامیش کاک ئەحمەد سەری لەپەناگوێمدا بوو، بەتایبەتی ئەو هونەرمەندانەی لەفلۆرەنسا ئەژیان ئامادەببوون. هەروەها بەشێکی لەبەرچاوی ئامادەبووان ئەو عەرەبە عێراقی و غەیرە عێراقییانە بوون کە لەفلۆرەنسا بوون .

بیرمە هونەرمەند کاک "عەتا قەزاز" بەکامێرایەکی ڤیدیۆوە هاتوچۆی ئەکردو چاوی هەر بەکامێراکەوە بوو. ئەو شریتی ڤیدیۆیەم تائێستە ماوەو لەسویدە .

ئەمە یەکەم کۆڕی ئەوروپام بوو. بەشێکی تری لەبەرچاوی ئەم ئێوارە کۆڕە ئیتاڵییەکان بوون، بەتایبەتی ئەندامانی حزبی سەوزو چەپەکان. یەکەم قسەکەری ئەم کۆڕە "گابریل" بوو. وتەکەی نزیکەی بیست دەقیقەیەکی خایاند، کاک ئەحمەد-یش، ڕستە بەڕستەی تەرجەمە ئەکرد. گابریل؛ لەقسەکانی خۆیداو ئەوەی بەیرم مابێ: (بە گەرمی بەخێرهاتنی کردم. ئینجا هاتە سەر ئەوەی کە گەلی کوردستان گەلێکی دێرینەو بەڵام بەردەوام لەلایەن ئەو دەوڵەتانەوە چەوسێنراوەتەوە، کە کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە. )

گابریل پشتگیری خۆیو حزبەکەی بۆ مەسەلەی ڕەوای کورد دەربڕی. باسی جاڕنامەی مافی مرۆڤی کردو تادوایی. کە چاوم بەناو هۆڵەکەدا گێڕا جێگە نەمابوو، دەستمانکرد بەخوێندنەوەی شیعرەکان. من ناتوانم و پێم ناخۆشە شیعر بەدانیشتنەوە بخوێنرێتەوەو تائێستەیش ئەمەم کردووە بەنەریتی خۆم و بەردەوامم. شاعیرە ئیتاڵییەکەیش کەزانی من وا ئەکەم، ئەویش هەستایە سەرپێیان. یەکەم پارچە بەکوردی هەرهەمان شیعر بەئیتاڵی و تاشیعرەکان تەواو بوون.

پێشوازییەکی گەرمم لێکرا، بیرمە دوایئەوەی بەشێکی زۆری خەڵکەکە چووبوونە دەرەوە، خانمێکی ئیتاڵی، هات بۆ لام و وتی "گوێمگرت و شیعرەکانم

بەلاوە جوان بوون، بەلام لەهەمووی جوانتر خوێندنەوەکەت و ئیلقات بوو. من تەنها ویستم ئەم قسەیەت لەگەڵدا بکەم!

بۆ ڕۆژی دوایی چەند ڕۆژنامەیەکی فلۆرەنسا هەواڵی کۆڕەکەیان بلاوکربۆوە. ڕۆژنامەیەکیان دووسێ پارچەی لە شیعرەکان وەک نموونە بلاوکردبۆوە. یەکێکی تریان وتارێکی لەسەر کێشەی کورد لە عێراقدا نووسیبوو. تا ئەو ساڵانەی دواییش نموونەی ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەم هەڵگرتبوو. بەلام دواتر ئەم دەستو ئەو دەستیانکردو بزربوون. نە هەر هی یەکەم سەفەرم، بەڵکوو هی گەشتەکانی دواتریشم. خاتوون و "گابریل"یش هەر لەو ڕۆژانەدا ئەوەیان پێراگەیاندم، کەپێشنیازیان کردووە، ئەنجوومەنی شارەوانی فلۆرەنسا شەرەفی هاووڵاتی شاری فلۆرەنسام وەک ڕێزلێنانێ پێبەخشن، چەند ئەندامێکی ئەو ئەنجوومەنەیان بینیوەو ئەوانیش ئەم پێشنیازەیان پەسەندکردووەو ئەو بەڵێنەیان پێداون کە لەداهاتوویەکی نزیکدا بەڕەسمی ئەو هەواڵە بلاوئەکەنەوە. ئەوەی ڕاستیبێ من ئیتر دواتر لەئاکامی ئەو پێشنیازەم نەپرسییەوە. کە ئایا کراوەیان نەکراوە؟!

هەر وەکوو پێشتریش باسمکردبوو، هەڵەی من لە هەموو قۆناغەکانی ژیانمدا ئەوەبووە کە ڕۆژانە یادەوەرییەکانم تۆمار نەکردووە. تەنانەت ئەگەر بەسەرە قەڵەمیش بووبن. ئەم خەوشەم کارێکی وایکردووە کەناوی زۆر کەس و شوێنم بیربچێتەوە. بەتەنها پشت بەستنیش بەزەین و بیرکەوتنەوە، ژێی نامەیەکی کۆک و ڕێک و پێک و بێ کەلێن نادا بەدەستەوە. چونکە من دڵنیام ئەگەر لەکاتی خۆیداو ڕۆژانە هەر هیچم نەکردایە، ناوی ئەو هەموو کەسایەتییە ئەدەبی و کۆمەلایەتیی و ئەو هەموو شارو ناوچەو هاوینەهەوارو کۆڕو پێشانگاو بۆنانەم لای خۆم بنووسیایە، یادەوەرییەکانم، بەهاو نرخێکی تریان ئەبوو. بەکورتی من پیاوێکی لاوبالی بووم. هیچ بەرنامەیەکم بۆ ئەو گەشت و دیدارانە نەبووەو ئەوەتا ئێستا باجەکەی ئەدەم! کە ئەویش باجی بیرچوونەوەیە، کە تاسەر ئێسقان ئازارم ئەداو، بەلام چارچییە؟! لەوە زیاتر، تا بەشێکی تریشم لەو بیرەوەریانە بیرنەچۆتەوە بیانخەمە سەر کاغەز.

ئەو کچەی
بەماچێک خستمییە بنی گۆمێکەوە!

فلۆرەنسا؛ شارێکە لەگوڵو پەیکەر، لەهونەرو لەنەختینەی مێژووی دوورو نزیک، لەمۆسیقاو گۆرانی و جوانیی. لەگەڵ هونەرمەندە کوردە خۆشەویستەکاندا، هەتا توانیمان گەڕاینو سەرماندا لەموزەخانە گەورەکان، ئەو موزەخانانەی، کەدیرۆکی سەدان ساڵی ئەم شارەت بۆ ئەگێڕنەوە .

لەنزیکەوە شاکارە هەرە گەورەکان بەچاوی خۆت ئەبینی. چاوت بەو هەموو گەشتکەرانە ئەکەوێ، کە لەچوارقوڕنەی هەموو دنیاوە هاتوون و لەڕیزی کیلۆمەتریدا وەستاون بۆ ئەوەی بلیتی چوونە ژوورەوەیان بۆ موزەخانەیەک دەستبکەوێ.

فلۆرەنسا؛ خۆی بۆ خۆی موزەخانەیەکی گەورەیە: شەقام و دیوارو تارمەو باخچە و گۆرەپانو کۆڵان و هەرهەمووی بەیەکجار توحفەیەو گەنجینەیەکی لەبن نەهاتووی دنیای هونەرە. ئاووهەوایەکی سازگارو خۆش. شەوی فلۆرەنسا، شەوی بەهەشتی ئەم سەرزەمینەیە! شەوی سەماو گۆرانی و مۆزیک و شەوی دڵداران و هونەرمەندان، شەو ئەو وەختەی هەمیشە بێدارەو شەقام ئەوکاتەی ناخەوێو باخچە ئەوکاتەی چۆڵبوون بەخۆیەوە نابینێ. جێژوانی عاشقان سەکۆی پەیکەرەکانە، لەبن هەموو پەیکەرێکدا دەس لەملان و ڕاموسان و ئاوێزان و ماچ و مووچەو، دڵداران بەپرژەی ئاوی فوارەکان

سەروقژیان تەڕ ئەبێ و لەباوەشی یەکتریدا سەرخەو ئەشکێنن‌و مانگە شەویش بەهێواشی خەوەکانیان ڕائەژەنێ. ئای خودایە ئەم هەموو جوانییە چییە ڕژاوەتە ئەم شارەوە؟! ئەگەر شیعر پایتەختێکی هەبووایە، هەر ئێرەی هەڵئەبژارد. هەر ئێرەی ئەکرد بەکەژاوەی خەیاڵەکانی و هەر ئێرەیشی ئەکرد بەجێی ئیلهام و وەحی خۆی .

لەناوەڕاستی ئەم شارەدا، چەندین شەقام و گۆڕەپان قەدەغەیە ئۆتۆمبیل هات و چۆیان پێدا بکات. هەمووی هەر بۆ پیادەیەو پیادەکانیش بەشی هەرە زۆریان بۆ کچی نیوەڕووت و لاوی سەرگەرم و خوێن گەرمە. چووینە بەردەمی دیواری ڕەشی مەرمەڕینی ئەو ماڵەی کە ڕۆژێ لەڕۆژان دانتی تێیدا ژیاوە. ئەو شوێنەی بەشی زۆری "کۆمیدیای خوادیی" تێدا نووسیوە. چووینە سەر ئەو پردەی کە زۆر ئێواران پیاسەی لەسەر کردووە. من وام هەستئەکرد، لەبەردەممایەو ئەیبینم و ئەویش لەنێوان بەهەشت و دۆزەخەکەیدا پڕپڕە لەگومان و لەڕەنگی خۆڵەمێشی و بەشوێن ڕاستیدا ئەگەڕێ و هەموو جارێکیش، سەرێک بۆ ئاسمان هەڵئەبڕێ و بەدوای ئەو نورەدا وێڵە، کە لە ئەزەلەوە ئادەمیزادی تووشی شپرزەیی و نائارامی کردووەو لەگێژەنی پرسیاردا خولی ئەدا.

لەدڵی فلۆرەنسادا نووستن نییەو تا بەرەبەیان پۆل پۆل کچ و کوڕی گەنج بەو شەقام و کۆلانانەدا بەدەم گۆرانی و گاڵتەوگەپ و پێکەنینەوە کات بەسەر ئەبەن و هاتوون بۆ ئەوەی دەقیقەیەک لەژیان بە فیڕۆنەدەن. من لەو شوێنانەدا، لە پڕ تەمێک ئەنیشتە سەر دڵم، وەختێ بیرم لەگەنجی وڵاتەکەم ئەکردەوە لە چ دۆزەخێکدا ئەژین و چۆن ڕۆژانەو لەخۆڕایی هەڵئەوەرین و نەئەزانن خۆشیی بەری بەکوێوەیەو نە ئارام و دڵنیایی و بەردەوام لەبەردەمی دیواری ترس و نائومێدیدا قوربانین‌و سەر ئەبڕڕێن .

ئەو دە ڕۆژەی لەسەر بودجەی لیژنەی مافی مرۆڤی فلۆرەنسا لەجوانترین ئوتێل بووم. بەردەوام لەگۆڕەپانە گەورەکەی فلۆرەنسا سەردانی هونەرمەندە کوردەکانم ئەکرد، لەلایان دائەنیشتم و ئەوانیش خەریکی دروستکردنی پۆرترێتی گەشتکەران بوون. هونەرمەند کاک "کامیل مستەفا"ی هاوڕێ دێرینی خۆم بینییەوە، لەماڵەکەی خۆیدا میوانداری کردم. هونەرمەند "کاکە سمکۆ و کاک ئازاد ئەحمەد"و چەند وێنەکێشێکی عەرەبی عێراقیشم بینی. ئەمان پۆرترێتیان نەئەکرد، بەڵام تابلۆکانی خۆیان دانابوو بۆ فرۆشتن .

هەر لەوێ یەکێک لەو هونەرمەندانەی زۆر بووین بەدۆست و نزیکی یەکتر، کاکە "بەختیار" بوو، "بەختیارە سوور"، چ بۆ ڕێکخستنی کۆڕەکەو چ بۆ گەڕان و گەشتکردن و بینینی موزەخانەکان و وەختێکی زۆری خۆی دابوو بەمن، جگەلەوەیش هەر لە فلۆرەنسەداو لەسەر گردێک، کە ناوەکەیم لە یاد نییە، ئەچووم بۆ لای ئەو هونەرمەندانەو لایان دائەنیشتم، خەڵکێکی زۆر ڕوویان ئەکردە ئەوێو ئەمانیش تابلۆکانی خۆیان بۆ فرۆشتن دانابوو. ئەو شەقامەی ئەچۆوە سەر ئەم شوێنە، شەقامێکی باریک بوو، لێرەدا ڕووداوێکی خۆشم بیرکەوتەوە، ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم!

ڕۆژێکیان چووم بۆلای هونەرمەند کاک کامیل مستەفا، ماوەیەکی زۆرلا مامەوەو لەدواییدا وتی: (دوایی پێکەوە ئەڕۆین). چاوەڕێمکرد تائەوکاتەی تابلۆکانی پێچایەوە. بەپێ هاتینە خوارەوە تائەو شوێنەی ئۆتومبیلەکەی لای ڕاوەستاندبوو. بەڵام گیرمانخواردو نەمان ئەتوانی دەربچین، لەبەرئەوەی ئۆتۆمبێلێک بەشێوەیەکی ناجۆرو نایاسایی هەموو ڕێگەکەی گرتبوو، خاوەنەکەیشی دیار نەبوو. کامیل پۆلیسی هاتوچۆی ئاگادارکردوو، بەڵام بێ سوودبوو، چونکە ئەبوو هەر خاوەنەکەی بێتەوە. زۆرمان چاوەڕوان کرد. تەواو پەست بووبووین. لەپڕ شۆخێکی جوان بەهەڵەداوان هات. دیاربوو ئەم کچە جوانە خاوەن ئۆتۆمبێلەکەبوو. بەکاک کامیلم وت: (من هەرچییەکم پێوت تکایە بۆی وەربگێڕە). وتی: (باشە)

هاتە بەردەممان و پەشۆکاوبوو. داوای لێبووردنی کرد. پێموت: (نا، تۆ سەرپێچیت کردووە). وتی: (ڕاستە بەڵام تووشی گیروگرفتێک بووم و ناچاربووم ئۆتۆمبیلەکە بەوجۆرە بەجێبهێڵم). پێموتەوە (ئەی جەزاکەی؟!) کچە شۆخەکە وتی: (من ئامادەم) .

دیارە من هەر بۆ گاڵتە وتم: (جەزاکەی ماچێکەو هیچی ترا!) لەپڕ وەختێکمزانی باوەشی پێداکردم و منیش ئیتر بووم بەقسەی خۆمەوەو ماچێکی قوڵ تابنی بنەوەی گۆمێکی ڕوونی بردمو لەوێدا بەتەنیا جێیهێشتم.!

من هەر لەیەکەم مانگی دوای گەیشتنم بۆ ئیتاڵیاو دواتر بۆ سویدو وڵاتانی ئەوروپا، زانیم زمان نەزانین چۆن مرۆڤ کەڕەواڵە ئەکات!. چۆن واتلێئەکات هەست بەجۆرێ لە بچووک بوونەوەو زەلیلی بکەیت. هەست بەجۆرێک لەجەهالەت بکەیت. وەختێ ناتوانی ئەوەی لەدڵتایەو ئەوەی ئەتەوێ دەریبڕی جائەگەر ڕستەیەکی بچووکیش بێت، دەستەوەستان ئەبی لەئاستیداو

بەرامبەرەکەیشت ئیتر ڕووت تێناکاو ئەتخاتە پشتگوێ. تۆ ئیتر ئەوساکە لەبەردێک یان لەچڵەدارێ یان لە کورسییەک ئەچیت و هیچی ترا. ئاخر خۆ هەموو کاتێکیش‌و لەهەموو شوێنێکدا نەوەرگێڕ هەیەو نە ئەشکرێ تۆ هەموو قسەیەکی دڵی خۆت بەو بڵێیت .

مەبەستم لەوە نییە تۆ ئەبێ چەند زمانێک بزانی، بەڵام ناکرێ تۆ زمانێکی زیندووی وەک ئینگلیزی نەزانیت، کە ئەمڕۆ لەهەموو دنیادا بووە بەڤیزەی یەکەم و ئەتوانێ لەو کەڕەواڵەیی و دۆشدامانە ڕزگارت بکات. من هەندێ وشەی ئینگلیزیم ئەزانی، کە لەقۆناغی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندییەوە فێریان بووبووم، بەڵام ئەوەندە کەمبوون، بەشی هیچیان نەئەکرد. ئیتر ئەم کۆمەڵە وشەیەم ئەهێناو ئەبردو بەدەستمەوە شەکەت‌و ماندووبووبوون. ئاخر چی لەوە ناخۆشترە، دوای گەلێ کۆڕم، ئەم کوڕو کچە گەنجانە زۆر بەپەرۆشەوە ئەهاتن بۆلام و ئەیانویست میواندارییم بکەن‌و لەگەڵیاندا بچمە دەرەوە، بەڵام وەختێ ئەهاتە سەر قسەکردن‌و ئەیانزانی هیچ زمانێ نازانم، ئەبڵەق ئەبوون! وەک ئەوەی خۆڵ و دۆیان کرابێ بەسەردا ئەحەپەسان‌و ئەڕۆیشتن. ئەی ئەوان چی لەپیاوێکی کەڕەواڵە بکەن. ئەوە تەنها زمانە ئەتوانێ ئەم هەموو پردی پەیوەندییە لەدنیادا ببەستێ. ئەم زمان نەزانینە تائەم کاتەیش بووە بەگرێ کوێرەی سەردڵم و زۆرجاریش کە تەنیا بووم و بیرم لەم نەزانینە کردۆتەوەو چەمۆڵەم لە خۆم ناوە !.

ئەو کاتەی گەیشتمە ئەوروپایش، تەمەنم (٤٧) ساڵ بوو. ئەم تەمەنەیش هی ئەوە نەبوو تازە ئیتر بەچاکی فێری زمانێکی ئەورووپی ببم، شەمەندۆفێرەکە بەجێی هێشتبووم. ئەوەی ڕاستیبێ ئەو گەرم‌و گوڕی گەنجێتیەیشم تیانەمابوو، تاسەر لەنوێ و لە نووکەوە دەستپێبکەمەوە .

تازە ببووم بەو درەختەی، کە لەشوێنی تر نەئەڕوامەوە، ئەم خەوشەم بۆ سەردەمی هەرزەکاریم ئەگەڕێتەوە، کە بێدەربەست و تەمەڵ و لاوبالی بووم و ئەمتوانی لەیەک وەختدا لەباتی یەک زمان فێری دوو زمانی تریش ببم!. خۆزیا چاوێکم نەبوایەو بەڵام "پێرفێکت" زمانی ئینگلیزیم بزانیایە!. ئەم خۆزگەیەش نەچێتە خانەی "لەپاش باران کەپەنک"ەوە!. هەر وەختێکیش پێیان ئەوتم ئەوە مانای بەچی تۆ ئینگلیزی نازانیت! لەداخی دڵی خۆم ئەموت: (ئینجا قەیچێکا خۆ "گۆرباچۆف"یش ئینگلیزی نازانێ!).

ده ڕۆژی میوانداری تەواوبوو. خواحافیزیم لە خاتوون کردو زۆر سوپاسی هاوکاری و دڵسۆزی ئەو و گابریل و هەموو ئەو دۆستە ئیتاڵییانەم کرد، کە لەماوەی مانەوەمدا لەفلۆرەنسا ئەوەندە بەتەنگمەوە بوون‌و چییان پێکرا بۆیانکردم. لەسەر پێشنیازی کاک "ئەحمەد دەروێش" و ئەو برادەرە ئازیزانەو بەمەبەستی کۆرگرتنی زیاتر، ڕوومکردە، شاری "تۆرینۆ".

وەختێ گەیشتمە وێستگەی شەمەندۆفێر، کاک "جەبار باخەوان"، چاوەڕوانی ئەکردم .

کاک جەبار؛ خەڵکی کەرکوکەو یەکێکە لەکادیرەکانی (ی. ن. ک)، کوڕێکی هێمن و لەسەرخۆو دەست‌و دڵ جوان‌و ڕەوشتی لێ ئەبارێ. چووینەوە بۆ ماڵی خۆیان، شوقەکەی خراپ نەبوو. ژوورێکیدا بەمن. ئەگەر لەدەرەوە نانمان نەخواردایە خۆی لەماڵەوە قوبوڵی‌و شلەکەی لێ ئەنا، بەدەست‌و بردو گورج و گۆڵ بوو، پێچەوانەی منی دەست‌و پێ سپی. تۆرنیۆش شارێکی گەورەیە، شاری پیشەسازی و کۆمپانیا گەورەکان. پێشتر ناوی "لاورا شانادەر"ی نووسەر و ڕۆژنامەنووسم بیستبوو. یەکێک بوو لەدۆستە نزیکەکانی مەسەلەی کورد. ئەوکاتە بەتەمەن هەروەکوو من ئەبوو. لەگەڵ کاک جەباردا چووین بۆلای، یەکترمان ناسی و چەند جارێکی تریش بەیەکەوە دانیشتین .

"لاورا شنادەر" حەزی لەشیعرەکانم ئەکرد، ئەویش یەکێک بوو لەوانەی کەبەشێک لەشیعرەکانمی بۆ زمانی ئیتاڵی وەرگێڕابوو. لەساڵانی دواتریشدا لەکتێبەکانی خۆیدا چەندجارێک گەڕابۆوە سەر ئەو شیعرانەو چەندین لاپەڕەی بۆ تەرخانکردبوون. من لەکاتی خۆیدا ئەو کتێبانەم بەدەست گەیشتبوون‌و تائێستەیش لە کتێبخانەکەی ماڵەوەدان لەسوید. هەر لەهەشتاکانیشدا بوو، ئەو شیعرانەی، کە لەئیتاڵیاداو لە کۆڕەکاندا خوێندبوومنەوە، چوونە دووتوێی دیوانێکەوە بەزمانی ئیتاڵی بڵاوکرایەوە. دیارە ئەمەیش هەر بەکۆششی کاک ئەحمەد دەروێش و هەموو ئەو برادەرە خۆشەویستانەی ئەوێ جێبەجێکرا. دیوانەکە وەک بێتەوە بیرم بەزمانی ئیتاڵی ناونیشانەکەی (هاوارێ بۆ ئازادی)بوو. دوولاپەڕەیەکیش پێشەکی وابزانم برایەکی خۆشەویستم کە هەمووان بە مەلا بانگیان ئەکرد ئەو بەزمانی ئیتاڵی بۆ نوسیبوو .

من؛ کاکە مەلام لەئیتاڵیاو لە تۆرینۆ ناسی. گەنجێکی کوردپەروەرو کوردستانیی، پێموایە ئەویش هەر خەڵکی کەرکوک بوو. ئەندامی (ی. ن. ک) بوو. لە هاوڕێ نزیکەکانی کاک جەبار باخەوانیش بوو. گەلێجار ئەگەر کاک جەبار کاری

هەبوایە کاکە مەلا لەگەڵمدا ئەهاتە دەرەوە. قسەی خۆشیشی هەبوو، شیعر دۆست بوو، خۆیشی شیعری ئەنووسی. بەڕاستی ئەویش لەگەڵما ماندووبوو.

کاک جەبار باخەوان و هاوڕێکانی لەشاری تۆرنیۆ، کەوتنە جموجووڵ بۆ ئەوەی یەکەم کۆڕم لەوێ بۆ ببەستن. دەستیانکرد بەپەیوەندیکردن بەدۆست و هاوڕێ ئیتاڵییەکانەوە، تا لەتۆرنیۆ بووم دوو کۆڕم بۆ ڕێکخرا. لەناو ئیتاڵییەکاندا کۆمەڵەو ڕێکخراوە چەپەکانیان، زووتر بەپیر بانگەوازی کوردەوە ئەهاتن. یەکێک لەو کۆمەڵانە زۆر بەپێخۆشحاڵی و دڵێکی فراوان و دۆستانەوە، ئامادەیی خۆی نیشاندا بوو بۆ ئەوەی ئەو کۆڕەم بۆ ڕێکبخەن. بانگەشەو پۆستەری تایبەتی و تەنانەت نامیلکەیەکیشیان دەربارەی من و شیعری من چاپکردبوو. لەکاتو شوێنی دیاریکراودا لەگەڵ کاک جەبارو ئەو برادەرە ئازیزانەدا چووین بۆ شوێنی کۆڕەکە، لەهەموو تۆرنیۆدا هەرچەند کوردێک هەبوو، واتە بەشی زۆری ئەوانەی ئامادەی کۆڕەکە بوون ئیتاڵی بوون. کە ئێمە چووین لەدەرەوەو لەحەوشەکەدا لەسەر چەند کورسییەک لەدەوری مێزێک دانیشتین. پرسیم: (کێ شیعرەکانم ئەخوێنێتەوە؟!). برادەرەکانم وتیان: (ئەکتەرێکی تورینۆیی ئەیخوێنێتەوە) .

ئەم ئەکتەرە بەناوبانگەو دواجاریش لەشانۆی "هاملێت"دا لەتۆرینۆ ڕۆڵی هاملێتی بینیوە!. بەرلەوەی کۆڕەکە دەستپێبکا، گەنجێکی باڵا بەرزی قۆز، قۆڵ لەقۆڵی شۆڕەژنێکدا هاتن. هەردووکیان بەرگی بەریان ڕەش بوو. لەولای ئێمەوە دانیشتن. دوای چەند دەقیقەیەک تەوقەمان لەگەڵ یەکتردا کرد. داوای شیعرە وەرگێڕدراوەکانی کردو برادەرەکانم دایانە دەستی. ئینجا ئەو وتی: (حەز ئەکەم بەم شاعیرە بڵێن لەبەرئەوەی من شیعرەکان ئەخوێنمەوە. هەر شیعرێکم بەدڵ نەبێ نایخوێنمەوە. ئەگەر ڕازی ئەبێ باشەو ئەگەرنا ئارەزووی خریەتی). یەکەمجاربوو بکەومە بەردەم تاقیکردنەوەیەکی سەخت. ئەگەر ئەڵێم باشە، لەوانەیە دووسێ شیعرم بۆ بهێڵێتەوەو ئیتر کۆڕگرتنی چی؟!. ئەگەر ئەڵێم نا بەم پەلەیەو لەوەختێکی وادا کێی ترمان بۆ پەیدا ئەکرێ تا شیعرەکانم بەئیتاڵی لەگەڵدا بخوێنێتەوەو ئیتاڵیش بێ. دواجار وتم: (باشە، فەرموو چۆن ئەڵێی بابەوجۆرە بێ). لەگەڵ خاتوونەکەیدا چوونە سەر مێزێکی دوور لەئێمەوە. دەستم هەر لەسەردڵم بوو. چاوێکم هەر لەسەر مێزەکەی ئەوان بوو. لەدڵی خۆمدا ئەموت: "ئەمە چی بوو تووشی من بوو "!

تیلەی چاویکم هەر لەسەر میزەکەی ئەوان بوو. ئاگام لەهەڵدانەوەی هەموو لاپەڕەیەک بوو. ژمارەی شیعرەکان چل و دوو بوون. دیاربوو زۆر لەسەرخۆ ئەیخوێندنەوە. ئەتوت لەسەر ئاگرم، شپرزەو بێ ئارام. لەدڵی خۆمدا ئەموت: (باشە وا هاتەوەو وتی دە شیعر ئەخوێنمەوە). چیبکەم؟! مەگەر دوای ئەوە کۆڕەکە بکەین بەکۆڕی گفتوگۆو قسەکردن، ئەگینا خوێندنەوەی دە شیعر بەهەردوو زمانەکە ڕەنگە هەر دە دەقیقەیەک بخایێنێ. ئەگەر کەمتریش نەبێ. چاویکم هەر لەلای ئەکتەرەکەو خاتوونەکەی بوو .

خوێندنەوەی تەواوکردوو هەستاو ڕوویکردەوە میزەکەی ئیمە. خەریکبوو دڵم ئەوەستا، قسەی لەگەڵ هاوڕێکانمدا کرد. یەکسەر من وتم (چی ئەڵێ؟! ئەنجام؟!) وتیان ئەڵێ: (لەو چلو دوو شیعرە چل–ی ئەخوێنمەوە!). هەناسەیەکی دڵنیاییم هەڵکێشا. ترسم ڕەویەوەو هاتمەوە سەر خۆم. هاملێتی ئەکتەر تەوقەیەکی گەرمی لەگەڵدا کردم. چووینە ژوورەوە. ئامادەبووان زۆر نەبوون، بەڵام ئەوانەی هاتبوون جگە لەو چەند کوردەی لەوێبوون ئەوانی تر ئیتاڵی بوون. لەپێشی پێشەوە، پیاوێک لەگەڵ هاوسەرەکەیدا کە هەردووکیان، لەشەستەکانی تەمەندا ئەبوون. دانیشتبوون. کاک جەبار و هاوڕێکانم وتیان: (ئەم پیاوە بەر لەدووساڵ سەرۆکی شارەوانی تورینۆ بوو. جگەلەوەیش خۆی شاعیرەو چەند دیوانێکی چاپکراویشی هەیەو ناوێکی دیارەو زۆر مرۆڤ دۆستیشەو یەکێکە لەدۆستە نزیکەکانی مەسەلەی کورد).

لەگەڵ هاملێتی ئەکتەردا دەستمانکرد بەخوێندنەوە. شیعر لەدوای شیعر بەکوردی و بەئیتاڵی تا هەر چل پارچەکەمان تەواوکرد. ئامادەبووان پێشوازییەکی گەرمیان لەشیعرەکان کرد. بەرلەوەی بچینە دەرەوە، ئەو شاعیرەی لەپێشەوە دانیشتبوو، دیاربوو داوای ئەوەیکرد چەند قسەیەکی هەیەو ئەیەوێت بیکات. چووە سەر شانۆکەو وتی: (پێخۆشحاڵم کە ئەمڕۆ گوێم لەم شاعیرە کوردە بوو کەئەم شیعرە جوانانەی بۆ خوێندینەوە. من هەستمکرد گوێ لەشاعیرێکی گەورەی دنیا ئەگرم، بۆیە داوا ئەکەم ئەگەر کۆڕێکی تری لێرەگرت شەرەفی ئەوەم پێببەخشێ چەند پارچە شیعرێکی بخوێنمەوە!). ئەوەی ڕاستیبێ ئەم قسانە کارێکی زۆریان تێکردم، منیش لای خۆمەوە هەستم بەوەکرد، شیعرەکانم، دوای وەرگێڕانیشیان هێشتا جوانیو کاریگەری خۆیان لەدەست نەداوە. هەستمکرد جگە لەدڵی زمانی کوردی ئەگەمە دڵی زمانانی دیکەی دنیایش! لەوساتەدا ئەوەم بیرکەوتەوە، بەشێک لەم شیعرانەی خوێندمەوە، هەر

ئەو شیعرانە بوون کە لەدیوانی "کازیوە"دا بڵاومکردبوونەوە، کەچی هەندێ لەو ڕەخنەگرانەی خومان، ئەوانەی بەگەزوجاوی "واقعییەتی ئیشتراکی" جوانی شیعریان ئەپێوا، چۆن لەوسەردەمەدا، دەستیانکرد بەداپڵۆسینی ئەم شیعرانەو سەرکوتانەوەی خۆم و بەنەهلیستی و عەدەمی وجودی و ئەدەبی وردە بۆرژوای سەر لێشێواو ناویان ئەبردم. ئەو وەختانەم کەوتەوە بیر، کە ئەبوو جۆرێک لەپێناسەی مارکسی لینینیت پێبێت بۆ ئەوەی بتخەنە ئەو ڕیزەوە کە خۆیان پەسەندیانکردووە. یان لەناو ئەو گروپەدا بیت کە خۆیانی تێدان، ئەوسا ئیتر ئەبووی بەو نووسەرو شاعیرەی بکەویتە بەرەی پرۆلیتارو ئەدەبەکەیشت ببێ بەئەدەبی چەوساوەکانو واقیعەتی ئیشتراکی!

لەشاری شیعرو ئاوا؛
گوڵی بێ ئینجانەو دڵی بێ فریشتە!..

هەروەکوو پێشتریش ئاماژەم بۆکردبوو، لەبەرئەوەی ئیتاڵیا پەناهێندەی وەرنەئەگرت، نەم ئەتوانی بمێنمەوە. بۆیە ناچاربووم تادەرووی ڤیزەیەکی ترم بۆ وڵاتێکی تری ئەوروپا لێئەکرێتەوە، هەر لەوێ بمێنمەوە .

کاکە ئەحمەد؛ ئەوەندەی نەمابوو کە خوێندنی باڵای خۆی تەواو بکات. ئەم برادەرە ئازیزانەم، بۆ بژێوی ژیانی خۆیان، ڕۆژانە کاریان ئەکرد، کاری قورس و زەحمەت هەر لەبەیانییەوە تائێوارە ڕەنجیان ئەدا، ئیتاڵیا؛ سۆشیالی نەبوو، یارمەتی کەسی نەئەدا. ئەبوو هەر پشت بەڕەنجی خۆت ببەستی. من چوومە لای ئەوان و ئەوانیش زۆر جگەرسۆزانە باوەشی خۆشەویستیی خۆیان بۆ کردمەوە. شوقەکەیان باش بوو، دووسێ ژوورو هۆڵێکی تێدابوو. من هیچم نەبوو، بۆیە پێخەفەکەیشم هەر هی ئەوان بوو. یەخچاڵێکی گەورەیشیان هەبوو، هەمیشە پڕبوو لەپێداویستییەکانی ژیانی ڕۆژانە .

لە دووسێ ڕۆژی سەرەتادا، کاک ئەحمەد دەرویش هەموو شوێنە گرنگەکانی ناو "ڤینیسیا"ی گێڕام. کاک ئەحمەد گەنجێکی ڕۆح سووک و هەمیشە دەم بەپێکەنین بوو. هەر لەوێش کاک "فەرەیدون ڕەحیم"م ناسی، ئەویش خەڵکی کەرکوک بوو، پێموایە لەوکاتەدا لەفڕنێکدا کاری نانەوایی ئەکرد. لەماڵیشەوە لەگەڵ کاک "کامەران و لوقمان"دا زۆرجار ئەگەر کاریان نەبوایە پێکەوە

دائەنیشتین. کامەران بێدەنگ و لەسەرخۆبوو، کاک لوقمان ئەوکاتە عاشق بوو، لەگەڵ کیژێکی ئیتاڵیدا بوو، زوو زوو تێکئەچوون و ئاشت ئەبوونەوە.

ڤینیسیا؛ کە عەرەبەکان ناوی "بندقیە"یان لێناوە، یەکێکە لەو شارانەی لەدنیادا نموونەی نییە، شارێک لەزەریادا، یان شاری ئاو، ژمارەیەکی زۆری گەشتکەران لەدنیادا ڕووی تێئەکەن. لەمشارەدا ئۆتۆمبێل نییە، هاتوچۆکردن یان بە بەلەمە، یاخود بەپێ، کۆڵانی باریکو تەنگ، بەشی هەرە زۆری خانوەکانی، ناوەندی شارەکە، بەهەمان تەرزی بیناسازی کۆنی خۆیان ماونەتەوە. نازانم لەگەڵ کام برادەردا بوو، جارێک لەیەکێک لەو خانوانەدا بووین، بەمیوانی خانەخوێیەکی ئیتاڵیو وەختێکی خۆشمان بەسەربرد .

دێرینترین جۆری شەراب لەم شارەدا هەیە. گۆڕەپانی بەردەم کڵێسە گەورەکەی جێی هەڵفڕینو نیشتنەوەی سەدان کۆترە شینکەیە، لەوێوە تاچاوبڕکا هەر زەریایە. گەلێجار دوای گەڕان و ماندووبوون، لەسەر ئەو کورسییە تەختانە دائەنیشتم کەڕوویانکردۆتە ئەو دەریا بێ کۆتاییە. چەندین کورتە شیعرم لەسەر ئەو کورسیانە نوسیووە، کە دوایی چوونە نێو دیوانی "ئاوێنە بچکۆلەکان"ەوە .

جۆگە ئاو، یان شەقامی ئاو، وەک دەمارەکانی لەشی مرۆڤ بەهەموو ڤینیسیادا بڵاوبوونەتەوە. گەشتیش بەو جۆگە ئاوانەدا تام و چێژی خۆی هەیە، گەلێجار لەم بەلەمانەدا تارژەنیشیان تێدایە. ئەگەر بتەوێ بەدرێژایی گەشتەکەت تارت بۆ لێئەدەن. من دیمەنی ئەو دڵدارانە، دڵیان ڕوون ئەکردمەوە، وەختێ ئەمبینی دەس لەملان لەناو ئەم بەلەمانەدا ئاوێزانی یەکتری بوون و تارژەنیش لەولایانەوە لەگەڵ ڕۆیشتنی هێواشی بەلەمەکەدا ئاوازیان ئەکرد بەباڵی خەیاڵ و خەوبینین و جۆگە ئاویش وێنەیانی لەبندینی ڕووباردا ئەنەخشان. ئای خودایە! ئەبێ چەند دڵدارو دڵخواز بەم جۆگانەداو لەبەر تریفەی مانگەشەودا گەشتی خۆیان کردبێ و ئەبێ چەند خۆزگەو ئاوات هاتبنەدی و چەندی ترشیان چووبنە ژێر گڵ و ژێر ئاو .!

ئێرە؛ شاری ئاوەو شیعر ئاسمانێتی و گۆرانی و موزیکیش باڵی دڵ و ڕۆحی ئەو برادەرە ئازیزانەی لەگەڵمابوونن هەر یەکەو "پەری"ی خۆی لەگەڵدا بوو. من هەستم بەتەنیاییەکی دابڕاو لەخۆشی و دنیا ئەکرد. ئاخر لەشاری شیعرو ئاودا بیت و بەڵام فریشتەت لەگەڵدا نەبێت، وەک ئەوە وایە باڵێکت نەبێ!. وەک ئەوە وایە، ژیانت گوڵدان و ئینجانەیەکی بێ گوڵ بێت. لەم ڕووەوە باری دەروونیم تابڵێی ئاڵۆزو پەشۆکاو بوو، بەڵام پەری و فریشتە چی لەپیاوی بێ زمان بکەن.

لەگەڵ ئەوەیشدا هەندێ ڕێکەوت وەختێ دێن، کە تۆ هەرگیز چاوەڕوانت نەکردوون، یان وەک میلان کۆندێرا ئەڵێت "خۆشەویستی وەختێ دێت کە تۆ بەشوێنیا ناگەڕێیت"!

هەر لەڤینیسیا پێش نیوەڕۆیەکی بەهەتاوی ئاوو هەوا خۆش، لەگەڵ ئەو برادەرە خۆشەویستانەدا پیاسەمان ئەکردو گەیشتبووینە سەر یەکێک لەو پردانەی جمەیان ئەهات لەگەڕیدەکان، کە لەهەموو لایەکەوە خەریکی وێنەگرتن بوون. کەمێک ڕاوەستاین و خۆمان دابوو بەسەر دیواری پردەکەداو لەوێوە تەماشای ڕووبارو بەلەمەکانی ناو ڕووبارەکەمان ئەکرد. ماندوو بووبووم، بۆیە بەهاوڕێکانم وت: (ئەمەوێ بچمە کافتریایەک و پشوویەک بدەم). پردەکەمان بڕیو یەکەم کافتریای بەرامبەرمان بەدیکردو بەچەند پلیکانەیەکدا چووینە خوارێ .

کافتریاکە بریتی بوو لەدوو مێزی تەختەی درێژ، کە ئەمدیویشی دوو ڕاستە کورسی درێژی لێدانرابوون. لەو بەریشەوە کابینەی کافتریاکە کەرەستەکانی و دوو پێش خزمەتیشیان هەبوو. تەنها یەک ژنی لێبوو، کە ئەویش سەری بەسەر کتێبێکدا شۆڕکردبۆوەو ئەیخوێندەوە. ئێمە پێنج کەس ئەبووین. وادانیشتین من کەوتمە بەرامبەری ژنەکە، هەر لەدوای چەند دەقیقەیەک برادەرەکانم کەوتنە قسەکردن لەگەڵ ژنەدا. کە بەتەواوی سەری هەڵبڕی، جوانییەکەی ئەدرەوشایەوە، پێستی سپی و قژ خورمایی و دوو چاوی گەلاوێژ. لەسییەکانی تەمەندا بوو. ئیتاڵیا لە دەوڵەتە ئەسکەندەنافییەکان ناچێ! تێکەڵاوبوونی کۆمەڵایەتی گەرمترەو خەڵکەکەی بەژن و پیاوەوە کراوەتروو ڕوو خۆشترو سادەترن. هەر لەدوای بیست دەقیقە تێگەیشتم ئەم کچە لەخوێندکارانی زانکۆی ڤینسیایەو ناوی "ئەلیزابیس"ە، چەند دەقیقەیەکی تر ڕۆیشت و ئەمجارەیان لەمن وردئەبووەوە، برادەرەکانم پێیان وتبوو: (ئەمە شاعیرێکی کوردە!) ئەویش لە وەڵامدا وتبووی: (تەنها شتێک، کە من لەئەدەب و هونەردا حەزی لێبکەم شیعرە!. من بێ خوێندنەوەی شیعر ناژیم!). ئێمە هەمیشە شیعرە وەرگێڕدراوەکانمان لەگەڵ خۆماندا هەڵئەگرت. فایلێ شیعرەکانیان دایە دەست. کەوتە خوێندنەوەیان، هەستمکرد گەشتر ئەبێتەوە. لەدواییدا وتی: (ئەم شیعرانە سەرسامیان کردووم)، هەر لەوێ وتیان بابڕۆینە دەرێ بۆ شوێنێکی تر، "ئەلیزابیس"یش لەگەڵماندا هەڵساو ڕوومانکردە گۆڕەپانە گەورەکەی بەردەمی کڵێسە دێرینەکە .

پیاسەمان ئەکرد، ئەلیزابیس لێیپرسیم: (دیارە ئینگلیزی ئەزانیت!) وتم: (زۆرکەم!). ئەو هەر قسەی ئەکردو منیش بەو چەند وشەیەی کە هەموو سامانێکی من بوو لەزمانی ئینگلیزیدا، هەوڵم ئەدا، وەلامی بدەمەوە. بووین بەهاوڕێ. بەلام هەستم ئەکرد زۆری پێناخۆشە کە ئینگلیزیەکەم وا لاوازو پەڕپووتە! تێیگەیشتم کەوتی: (چۆن ئەبێ شاعیرێکی وەکوو تۆ ئینگلیزی نەزانێ؟ لەبەرئەوە پێویستە بچیتە کۆرسی زمانی ئینگلیزییەوە. وتم: (تازە درەنگە). ئەو لەوەلامدا وتی: (هیچ شتێ نییە بۆ مرۆڤ درەنگ بێ، مادام لەژیاندابێ، دەبێ بجووڵێ و بیربکاتەوە). "ئەلیزابیس" هەرجوان و شۆڕەژن نەبوو، بەڵکوو ڕووناکبیرو مرۆڤ دۆست و ئازادیخوازیش بوو. بەشێکی زۆری شیعرەکانمی بەئیتاڵی لەبەربوو، یەکێک لەو شیعرانەی کەبەردەوام ئەیوتەوە، شیعری "سوتان" بوو:

بەسەر پلیکانەی ترسا

تاریکیی هەروەکوو دزێ

بۆ دەروونم شۆڕ ئەبۆوە

وەختێ گەیشتە ناو دڵم

ویستی دەستێ بوەشێنێ

لەپڕێکدا

خۆشەویستیم داگیرسان

تاریکی و ترسم تیا سووتان!

ئەلیزابێس؛ شەیدای شیعرم بوو، لەبەر شیعرەکانیشم بوو، بووە هاوڕێم. هاتوچۆی ئەکردمو سەری لەشووقەکەمان ئەدا. تا کاک ئەحمەد و کامەران و لوقمان لەوێبوونایە گیروگرفتی زمانم نەبوو، کەسایەتییەکی سەنگینی هەبوو. هەمیشە دیوانێکی شیعر بەزمانی ئینگلیزی یان ئیتاڵی لەجانتاکەیدا بوو. خێزانەکەیان بووەو دەوڵەمەندبوو، ئۆتۆمبیلی خۆیشی هەبوو. هەڵبەت کاک ئەحمەد و ئەوان، هەر لەیەکەم ڕۆژی یەکترناسینەوە، بەوردی باسی کێشەی کوردو بارودۆخی کوردستانیان بۆ کردبوو. ئەلیزابێس پێشتر ناوی کوردی بیستبوو، بەلام دیارە دواتر زانیاری زۆرتری پەیداکرد. فێری هەندێ وشەی کوردیش بووبوو. وەک "چۆنی و ڕۆژباش و شەوباش و خواحافیز".

من؛ لەژیانی خۆمدا کەم ژنم بینیوە، ئەوەندەی ئەو جوان و ڕووناکبیربێ. هەفتەی جارێکیش بەئۆتۆمبیلەکەی خۆی ئەهات بەشوێنماو ئەیبردم بۆ ڕۆخی زەریا، هەوڵی ئەدا بەئینگلیزییەکی زۆر ئاسان بدوێ، بۆئەوەی تێبگەم. ئەو وەختەی کەئیتر زمانم بەتەواوی پەکی ئەکەوت، بۆشاییەکەم، بەگۆرانی کوردی پڕئەکردەوە، لە"باران بارانەوە"، تا"ئارامی گیانم" و تا "چەندی گەڕام لە شاران"م بۆ ئەوت. ئەم گۆرانییەی دوایی پێخۆش بوو، چونکە ئاوازەکەی لەتانگۆی غەربییەوە نزیک بوو. ئەو کاتە دوومانگ زیاتر بوو لەئیتاڵیا بووم، منیش لیستێکم بەوشەکانی زمانی ئیتاڵی لای خۆم نووسیبوو. زمانی ئیتاڵی لەزمانە هەرە خۆشەکانی دنیایە، هەرکاتێ گوێم لێبوایە وامئەزانی گوێم لەشیعر گرتووە. کۆتایی زۆربەی وشەکانیان پیتی بزوێن بوون. وەختێ دوو ئیتاڵی بەیەکەوە قسەیان ئەکرد، من وامئەزانی شیعر بۆ یەکتری ئەخوێننەوە، بەڵام وەختێ ئەمپرسی ئەوە باسی چیئەکەن؟! کەلەوەڵامدا ئەوترا: (ئەوە باسی هەرزانیو گرانی بازاڕ ئەکەن!) ئەوسا وەک ئاوێکی ساردم پێدا بکەن وابوو. هەر وەکوو برادەرەکانیشم باسیان ئەکرد، فێربوونی زمانی ئیتاڵی لەزمانەکانی تر ئاسانترەو کوردیش زووتر لەعەرەبەکان و تورکەکان فێری ئەبن.!

نزیکی سێ مانگ ببۆوە کە هەر لەئیتاڵیا بووم، ڕۆژێکیان کاک ئەحمەد دەروێش پێیڕاگەیاندم، کاک "عومەر شێخ موس" لەسویدەوە تەلەفۆنی بۆ کردووە یان نامەی بۆ نووسیووە کەیانەی قەڵەمی سویدی بۆ ساڵی (١٩٨٧-١٩٨٨) خەڵاتی "تۆخۆلسکی" بەمن بەخشیوە. لەبەرئەوە پێویستە بەزووترین کات سەر لەسەفارەتی سویدی بدەم بۆ ئەوەی ڤیزەم بدەنێ و سەفەری سوید بکەم. ئەم هەواڵە بۆ من شتێکی چاوەڕوان نەکراوبوو، چونکە ئەوەی ڕاستیبێ من نەمئەتوانی ئاوا بێ ئیش و کار، لەئیتاڵیا بمێنمەوە، ئەمە جگەلەوەی ئەو پارە کەمەی پێم مابوو، بەشی مانگێکی تری نەئەکرد. کەواتە جارێکی تریش ڕێکەوت و بەختی باش، چون وەرگرتنی ڤیزەکەی ئیتاڵیا ڕوویتێکردمەوەو لەوەختی خۆیدا فریام کەوت، سەرەڕای ئەوەی ئەمجارە وەرگرتنی ئەو خەڵاتەیشی لەپاڵدا بوو، دڵم خۆشبوو. چووین بۆ باڵیۆزخانەی سویدی و لەماوەی چەند ڕۆژێکدا ڤیزەی سویدیش چووە سەر ئەو پەساپۆرتە شڕەی پێمبوو. کەواتە ماوەیەکی کەمم ماوە لەئیتاڵیاو ئەمجارەیان بەرەو ستۆکهۆڵم ئەفڕم.

کاک "هونەر سەلیم" یەکێک بوو لەهونەرمەندە شێوەکارەکانی کورد لەئیتاڵیا، هەر لەسەرەتای گەیشتنمەوە ناسیم. بووین بەهاوڕێ، کاک هونەر لە

شارۆچکەیەکی نزیک ڤینیسیا لەگەڵ ژنە فەڕەنسییەکی هاوڕێیدا پێکەوە ئەژیان. لەگەڵ ئەلیزابیس-دا، چووین بۆلایان، شەوو ڕۆژێک میواندارییان کردین، وەختێکی خۆشمان بەسەربرد. من هەرگیز ئەو شەوەم بیرناچێتەوە کە بەچوارقۆڵی لەژوورەکەیاندا لەسەر یەک مێز دانیشتبووین و چوار مۆمیشمان داگیرساندبوو. باس باسی هونەرو مۆسیقاو شانۆو سینەمابوو. کاک هونەر ئەو شەوو ڕۆژە دەوری وەرگێڕیشی بۆ من ئەبینی. کاک هونەر؛ خەڵکی بادینانەو لەم ساڵانەی دواییدا چووە ناو جیهانی سینەماوەو چەند فیلمێکی سینەمایی کوردی دەرهێناو هەواڵی سەرکەوتنەکانی لەئەورووپاو کوردستانیش بڵاوبوونەوە.

ڕۆژی سەفەرکردنم نزیک بۆوە، هەموو ناونیشان و ئەدرەسێکی "ئەلیزابێس"م وەرگرت. بەڵێنی پێدام کە لەمانگی حەوتی هەمانساڵدا بێت بۆ ستۆکهۆڵم، بیرمە لەڤینیسیاو لەباخچەی گۆڕەپانە گەورەکەیدا، خواحافیزیم لەئەلیزابێس کرد، چاوی هەردووکمان پڕببوو لەئاو، تا لەچاویشی ونبووم هەر دەستی بۆ ڕائەوەشاندم، خواحافیزی و بەجێهێشتنی هەر ئازیزو هاوڕێ و دۆستێک لەساتە هەرە ناخۆشەکانی ژیانن. من لەوکاتانەدا حەز ناکەم ئاوڕبدەمەوە، ئەو ئاوڕدانەوانە، دڵ هەڵئەکەنێ و هەست ئەکەیت دابڕین ئەبێتە مشارێک و وەک لەناو قەددا بتبڕێتەوە وایە.!

"پێن کلۆبن- یانەی قەڵەمی سویدی"، پێگەیەکی ئەدەبیی گەورەی لەجیهاندا هەیە، بەشێکە لەیەکێتی نووسەرانی دنیا. ئەم جیایەو یەکێتی نووسەرانی سویدیش جیایە. من تائەوکاتە نەمئەزانی خەڵاتی ئەدەبیی تۆخۆلسکی چییە !

دواتر زانیم، کە ئەم خەڵاتە هەموو ساڵێ جارێ ئەدرێ بەنووسەرێ یان شاعیرێ، کە لەتاراوگەدا بژی و بەهۆی بارودۆخی سیاسی وڵاتەکەیەوە ئاوارەبووبێ. مەرج نییە ئەو نووسەرە یان ئەو شاعیرە بەرهەمەکانی لەلایەن ئەم یانەیەوە هەڵسەنگێنرابن، بەڵام ئەوان خۆیان بەر لە هەڵبژاردن، ئەکەونە سۆراخ و پرسین. چەند پاڵێوراوێکیان دەستنیشان ئەکەن، دوایی لەئەنجامی ئەو ڕاپرسییەوە یەکێکیان هەڵئەبژێرن. من بەبیستن بیستم کە "پێن کلۆبن" بۆ ساڵی (١٩٨٧-١٩٨٨) بڕیار ئەدەن ئەو خەڵاتە بدەن بەکوردو لەناو کوردیشدا چەند ناوێکیان لەبەردەستدابوو، لەوانە مامۆستایان "ئیبراهیم ئەحمەد و جەمال نەبەز و عەبدوڵلا پەشێو و من."

کاک محەمەد ئۆزۆن؛ نووسەری کوردی باکووری کوردستان و جێنیشتە لەسویدو ئەندامی یەکێتی نووسەرانی سوید، ئەو ساڵە دەورێ گەورەی هەبوو لەبەخشینی ئەم خەڵاتەدا. من تانەچوومە سوید، پێشتر نە کاک محەمەد ئۆزۆن-م ناسیووەو نەهیچ پەیوەندییەکیشم لەگەڵیدا بووە. هەڵبژاردنی منیش بەمانای

ئەوە نییە من خۆم یان ئەوان مامۆستایان ئیبراهیم ئەحمەد و جەمال نەبەز و پەشێو لەئاستێکی ئەدەبیی خوارتردا ببینن، نا، لەم ڕووەوە ئەگەر ئەو مامۆستایانە لەئاستێکی بەرزتردا نەبن هەرگیز لەخوارترنین. من پێموایە هۆی سەرەکی ئەوەبوو، من وەک شاعیرێ لەناو هێزی پێشمەرگەوە تازە هاتبوومە ئەورووپاو دووساڵیش بوو لەشاخ بووم، بۆیە هەڵبژێردرام. جگەلەوەیش، وەرگرتنی هیچ خەلاتێ و لەهەر ئاستێکدا بێت، سەد دەر سەد نیشانەی بەرزترین‌و باشترین ناگەیەنێ و نموونەیش زۆرن. ئەگەرچی خەلاتەکە خۆی خەلاتێکی ئەدەبییە، بەلام بارودۆخی سیاسی ولاتی ئەدیبەکە رۆلی لەبەرچاوی تێدا هەیە. من ئەگەر ئەو بەخشینی خەلاتەم بەدەست بوایە پێشکەشی مامۆستا برایم ئەحمەد-م ئەکرد، چونکە ئێمە قوتابی ئەو بووین و سەرمان لەهێلکەی پاکی ئەوانەوە جووقاوە! وەختێ من ئەو خەلاتەم وەرگرت پێشتر چەند نووسەرێکی دیکەی ئەورووپایش وەریانگرتبوو. ساڵێ بەر لەمنیش بەر نووسەرێکی پۆلۆنی کەوتبوو.

بۆچی تۆخۆلسکی؟! ئەوەندەی لەم بارەیەوە زانیاریم هەبێت، تۆخۆلسکی لەئەدیبە گەورەکانی ئەڵەمانیا بووە. هاوچەرخی "برێخت" بووە، ئێستا لەئەڵەمانیا گەلێ شەقام و کتێبخانە و شوێنەواری تر بەناوی ئەوەوە ناونراون. ئەم نووسەرە لەسەردەمی سەرهەڵدانی نازییەکاندا لەسییەکاندا، ناچار ئەبێ ئەڵەمانیا بەجێبێڵێ و وەک پەناهێندە ڕووبکاتە ولاتی سوید. وەختێ ئەگاتە سوید، حکومەتی ئەوسای سوید بایەخێکی ئەوتۆی پێنادەن‌و بەکولەمەرگی ئەژی. بەکورتی ئەوەندە ژیانی تاڵ بووە خۆی ئەکوژێت! دواتر سویدییەکان هەست ئەکەن غەدرێکی گەورەیان لەم نووسەرە گەورەیە کردووە، بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم غەدرەو بۆ ئەوەی ویژدانی خۆیان ئارامبکەنەوە. ئەم خەلاتە بەناوی تۆخۆلسکی-یەوە ناوئەنێن و هەر بۆیەیش ساڵانە ئەدرێ بەئەدیبێ، کە لەمەنفادا بژی.

ڕۆژی سەفەرکردنم بۆ ستۆکهۆلم هات و چەند برادەرێ تافرۆکەخانە لەگەڵمدا هاتن و لەکاتی خۆیدا فرۆکە هەڵفڕی و ئەمجارەیان لەئاسمانەوەو لەپەنا پەنجەرەکەی خۆمەوە ماڵئاواییم لەئیتاڵیای چاو سەوزو لەبرادەرە ئازیزەکانم و لە "ئەلیزابێس"ی فریشتەی شیعر کرد!

بەئاسمانەوە بووم، بیرم لەچارەنووسی نادیاری ولاتەکەم ئەکردەوە، بیرم لەوە ئەکردەوە چ دوا ڕۆژێ چاوەڕێمە! قۆناغی داهاتووم چۆن ئەبێ؟! بیرم

لەنەسرین و منداڵەکان ئەکردەوە، ئەبێ ئێستە لەکوێ بن؟ بەتایبەتی هەموو هەواڵەکانی دوایی کوردستان، ئەوەیان نیشان ئەدا کەڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژیانی "پ. م" و هاوڕێکانی شاخم سەختترو دژوارتر ئەبێ. هەواڵەکان وایانئەگەیاند، کە لەو یەکدوو مانگەی دواییدا هێزی پێشمەرگە جەزرەبەی کوشندەی داوە لەدوژمن و داستانی نەبەردەکان و پاککردنەوەی چەندین ڕیزە شاخ و گرتنی ڕەبایای سوپای داگیرکەر بەردەوامەو لەولای تریشەوە دوژمن لەشارو شارۆچکەکانی کوردستاندا گوشاری گەورەی خستۆتە سەرخەڵکی و بەتایبەتی کەس و کاری "پ. م"ەکان و چەندین خێزانیان بەماڵ و منداڵەوە گرتووەو ڕەوانەی زیندانەکانیان کردوون. بیرم لەو گرەوە کردەوە، کە لەگەڵ " مام جەلال کاک و فەرید ئەسەسەرد" دا لەبەرگەڵو کردبوومانو لەدڵی خۆمدا وتم "وا ساڵەکەی ئەوان تێپەڕی و بەڵام سەدام هەر لەجێی خۆیەتی" و ئاواتەخوازبووم ئەوان گرەوەکە بەرنەوەو من بیدۆڕێنم و بەڵام بەداخەوە وادەرنەچوو. کە کەیبانووی نازداری ناو فڕۆکەکە، لەو خەیاڵانەی کردم، وەختێ ژەمە خۆراکی پێچراوەی هێناو دایەدەستم. ئەو خواردنانەی کەمن حەزیان لێناکەم و نایانخۆم، جاری وا هەبووە برسیشم بووە خۆمگرتووە تادابەزیوم و خواردنێکی گەرمم خواردووە. شووشەیەک شەرابی ترم داواکردەوە. لەژێرەوە زنجیرە چیاکانی "ئالپ" سپی ئەکەنەوە، لەزمرووتی بەرهەتاو ئەچن. ئەو ڕووبارو گۆمە گەورانەی لەسەر زەوی چاو لێیان ئەترسێ و ئەم سەرو ئەوسەریان دیارنییە، لێرەوە، لە چەند قەیتانێکی باریک و چەند قۆپچەیەکی پەرش و بڵاو ئەچن، دارستانەکان پەڵە پەڵەی ڕەش و بچووکن و وەک چەند مافورێکی ڕاخراو دێنە پێش چاو. هەندێ شارو شارۆچکە ئەوەندە بچووک بوونەتەوە وەک لەسەر کابەری دەستتبن وایە. شەبەنگی هەتاو لەئاسۆی دووردا، ڕەنگی وای دروستکردووە کە لەسەر زەوی بوونیان نییە. پەڵە هەورێکی سپی دوور، لەچاو تروکانێکدا دیمەنەکانی خۆی ئەگۆڕێ. جارێک لەسەری ئەسپێکی گەورە ئەچێ و لە پڕ ئەبێ بەقوڵینەیەکی سەرەو ژێرو، جارێکی تر بەکەللەسەری پیاوێک پاپێکی بەدەمەوەیەو ئینجا بەژنێکی پرچ درێژی کەڵەگەت .

ئەم گەردوونە چییە؟! کوا سەرەتاو کوا کۆتایی؟! لەکەیەوە هەیەو تاکەی؟! ئەم هەموو هەسارانەو ئەستێرەکانی! ئەم گۆی زەمینەی ئێمەی لەسەرین و ئەم هەموو شەڕو شۆڕو پێکدادان و ململانێیەی تێدا ئەکرێو خۆیشی ناکاتە سەرە دەرزییەک لەم گەردوونەدا! باشە هەر یەک ژیان هەیەو ئەویش لەسەر

زەویەکەی ئێمە؟! یان بەسەدان ژیانی ترو بەلام دوور لەم هەسارەی ئێمەوە؟! پرسیارەکان زۆرن و وەلامەکان هەر ئێجگار کەم! بێئەوەی بزانم بۆ دەستمبرد بۆ گیرفانی کراسەکەم، ئەو چەند وێنەیەی تیابوون دەرمهێنان، یەکەم وێنەیان هی باوکم بوو. وێنەیەکی کۆن .

بێکەس؛ بەچوارمشقی‌و بەپێلاوەوە دانیشتووە، دەستێکی خستۆتە سەر ئەم کەلەکەیی‌و ئەویتریش لەسەر کەلەکەکەی تری. شوێنەکە لەدەشت ئەچێ. بەلام کەسی تر لەدەوروبەری نییە. بەبیرەوەری خۆم قەت جلوبەرگی تازەم لەبەری باوکمدا نەدیوە. بیرم نایە قەت جلەکانی ئوتوکردبێ. ناوبەناو بۆینباخی ئەبەست، بەلام یەکەم بەستنی، ئاخر بەستنیش بووە! چونکە هەرگیز نەیکردۆتەوە تاببەستێتەوە. ئەم پیاوە سەیر ژیاوە، ئەوەی گوێی نەداوەتێ خودی خۆی بووە، چۆن هاتبێ لەگەلیدا ڕۆیشتووە. ئەوەی نەیبووە دوو شت بووە، ترس و پارە. ئەوەی بڕوای پێی نەبووبێ شێخ و مەلاو سۆفی بووە، لەشیعرەکانیشیدا بەردەوام لێیداون. ڕەنگی قژی خورمایی بووەو پڕبووە. لەمنداڵیدا، بەنەخۆشی ئاوڵە چاوێکی لەدەستداوەو کونج کونج بووە. بەگەورەییش لەڕاپەڕینی (١٩٣٠)دا بەقۆناغە تفەنگ چاوەکەی تریشی زەرەری هێناوەو نێوان لاجانگی و ئەو چاوەی پەڵەیەکی سووری پێوەبوو. دەستوخەتی وردو خۆش بووە. یەکێک بوو لەو ڕووناکبیرانەی کە بڕوای بە یەکسانی نێرومێ هەبووە. دایکم ئەیوت: (وەختێ داوای منی کردو خوازبێنی تەواوبوو. پاش چەند ڕۆژێ بەپێچەوانەی دابونەریتەوە لەدەرگا دراو وتیان وەللا ئەوە فایەقە فەندی هات. لەهەیوانەکە دانیشت، دایکم لەگەلیا دانیشتوو، داوای منی کرد ببینم، کە هاتم دوایئەوەی دانیشتم، پێی وتم: "پشە خان ئەزانی بۆ هاتووم؟!" لەبەرئەوەی بمبینی چونکە من حەزناکەم نا بەدل شووم پێبکەیت. من ئەمەم کەلەبەرچاوتم و ئیتر خۆت بڕیاربدە). دایکم ئەیگێڕایەوەو ئەیوت: (باوکت وەک شکل جوان نەبوو، کەچی من ئەو ڕۆژە چووە دلمەوەو زۆرجوانیش هاتە بەرچاوم) .

دایکم ئەیگێڕێتەوەو ئەلێت: (کەم شەو هەبوو نەچێتە دەرەوە. کە ئەیشهاتەوە جاری واهەبوو هەر بەجلەکانییەوەو بەدانیشتنەوە ئەنوست و منیش بەتانییەکم پێدا ئەدا تابەیانیی! ئەمە ببوو بەکارێکی ئاسایی من). هەروەها ئەیگێڕایەوە: (قەت جلوبەرگی ڕەنگداری لەبەرنەکردووە، یان خۆلەمێشی یان ڕەشی خەت خەت، هەموو جارێ من بیرم ئەخستەوە کە پێلاوەکانی بۆیاخ بکات، یان کراسەکەی بگۆڕێ، یان خۆی بشوات!) دایکم ئەلێ: (من تووڕە ئەبووم، بەلام ئەو قەت

توورە نەئەبوو!، لە هەموو ژیانیدا، یەکجار زللەیەکی لێداوم، بەڵام دوایی داوای لێبووردنی کرد. لەبەرئەوەی لەو دواییەدا زۆر قەڵەو بووبوو، بە شەو پرخەپرخی زۆربوو. جارێکیان هاوین بوو، شەو درەنگی کردبوو، لەدەرگادراو من چووم کردمەوە، پیاوێکی نەناسیاو بوو وتی: "خوشکم گوناحتان ئەگات ئەو کاوڕەتان وابەستۆتەوە ڕەنگە پەتەکەی لەقوڕگ گیرابێ بۆیە وائەکات تۆزێ بۆی شل بکەنەوە!"). دایکم ئەیوت: (زۆر نەداراو نەبوو بووین، جارێکیان پیاوێک هات بۆلای باوکت بۆ ماڵەوە، زەرفێکی پڕ پارەی پێبوو، هاتبوو بیدا بەباوکت بۆ ئەوەی شیعرێکی هەجوو بنووسێ لەدژی خزمێکی خۆی. باوکت زەرفەکەی دایەوە بەچڕو چاویاو دەریکردە دەرەوە) .

لەخواردندا وەک زۆربەی زۆری خەڵکی سلەیمانی حەزی لە قوبوڵی و شلە ئەکرد. هەروەها حەڵوای گوڵە زەرد. دایکم ئەیگێڕایەوە ئەیوت: (جارێکیان باوکت وتی: "ئەم بامیێ تێکوشراوە ئەوەندە خۆشە. من ئەمڕۆ ئەوەندە ئەخۆم تا لەهۆش خۆم ئەچم، بەجۆرێک دوو دوکتۆر بێنە سەرم یەکێکیان بڵێ لێبۆتەوەو ئەویتریان بڵێ نا هێشتا ڕۆحی تیاماوە!"). بێکەس هەر بەدەست نانی خواردووە. شانەی قژ داهێنانیشی هەر پەنجەکانی بوون. بەرلەوەی کۆچی دوایی بکات قەڵەوییەکەی لەڕادەبەدەر بوو. دوکتۆر "ئەوڕەحمان"ی هاوڕێی پێی ئەڵێ: (بەسە فایەق ئەوەندە مەخۆرەوە، ئەگینا دڵو جەرگت دائەرزێن). ئەویش لەوەڵامدا ئەڵێ: (ئینجا من هەقم چییە بەسەریانەوە چییان لێدێ کەیفی خۆیانە!) .

پیاوی چاوچنۆک و پیسکەی خۆشنەویستووە، بەتایبەتی ئەگەر دەوڵەمەند بووبێ، بۆیە جارێکیان هاوین ئەبێ و لەچایخانەیەکی گەورەی شاردا یەکێک لەو دەوڵەمەندانە ئەبینێ بەکەواو سەڵتەیەکی شڕەوە دانیشتووەو نان و ماستاویش ئەخوات، ئەمیش هەڵئەستێ دەست ئەداتە سینی چایچییەکەو بەناو خەڵکەکەدا ئەگەڕێ و پێیان ئەڵێ لەڕێی خوادا پیاوێکی هەژارو کلۆڵ هەیەو ئێستا لێرەیە، بەڵکوو هەریەکەو بەپێی توانای خۆی یارمەتی بدات. دوای ئەوەی هەندێ پارە کۆئەکاتەوە ئەچێتە بەردەمی پیسکەی دەوڵەمەندوو پێی ئەڵێ: (فەرموو جەنابی فلان ئەوە پارەو بەشکوو کەوایەکی تازەو جووتێ پێڵاوی پێبکڕیو لەم حاڵە ڕزگارت بێ!!). کاک ئەحمەدی میرزای ئامۆزای بۆی گێڕامەوەو وتی: (بێکەس هات بۆ لام و وتی: "ئەحمەد لەم سەری مانگەوە تۆ مووچەکەم بۆ ڕێکبخە، چونکە بەڕاستی خەریکە قەرزارییەکەم زۆر ئەبێت". سەری مانگ هات و قەڵەم و کاغەزێکم گرت بەدەستەوەو نووسیم: فلس دینار، یەکی خەتێکم بەژێردا

هێنان، فایەق وتی زۆرباشە. دوایی نووسیم کرێ خانوو ئەوەندە، فایەق وتی: "زۆرباشە"، دوایی نووسیم پارەی ئاردو نانکەر، فایەق وتی: "زۆرباشە"، فایەق وتی: "نە ، بنووسە: عەرەق!". نەوەکوو بۆی نەمێنێتەوە!) .

"گۆران"ی شاعیر دوایئەوەی شیعری "بۆ هیوا"ی کوڕی ئەنووسێت، بۆ بێکەسی ئەخوێنێتەوە، لەدواییدا پێی ئەڵێ: (ها بێکەس چۆن بوو؟!) ئەویش لێی ئەپرسێ: (چەند کوڕی ترت ماون). گۆرانیش ئەڵێ: (سیان). بێکەس ئەڵێ: (خۆزگە ئەو سێ کوڕەی تریشت بمردنایە! بۆ ئەوەی سێ شیعری تری وا جوانت بنووسیایە!).

من خۆیشم هاتەوە بیرم: تەمەنم پێنج ساڵان بوو، لە گەڕەکی حاجی حان بووین، هاوین بوو، باوکم دەعوەتی کردبوو، بەخۆیەوە شەش حەوت کەسێک ئەبوون، من تەنها یەکێکیانم لەبیرە، ئەویش گۆرانیبێژو دەنگ خۆشی بەناوبانگ "عەلی مەردان" بوو، ئەوان لەحەوشە بچکۆلەکەماندا دانیشتبوون. کە "عەلی مەردان" دەستیکرد بە گۆرانیوتن، هەموو دەرو دراوسێکان، بە ژن و پیاوو منداڵەوە هاتبوونە سەر سەربان‌و لەوێوە گوێیان ئەگرت و تەماشای کوڕەکەیان ئەکرد. لەدواییدا باوکم چەند قسەیەکی کردوو، کوڕەکە تێکچوو، "عەلی مەردان" هەستایە سەرپێ و ئەیویست بڕوات، بەڵام دووستێیەکان گرتبوویان و نەیانئەهێشت بچێتە دەرەوە. لە تەمەنێکی هەڵکشاودا ئەمەم بەدایکم وت و لێم پرسی ئەو شەوە چی ڕوویدا؟! دایکم وتی: (دوای ئەوەی عەلی مەردان لەگۆرانیوتن بۆوە، باوکت پێی وت: "بەخوا سەگی سەگبابی! بەخوا ناجسنی، بەخوا نانەجیب و حەرامزادەی..!"

ئیتر عەلی مەردانیش تووڕە بوو وتی: "ڕاست ئەکەیت من ئەگەر سەگ و سەگباب نەبم نایەم بۆ ماڵی تۆو گۆرانیی بڵێم!.. لەجیاتی ئەوەی ڕێزم لێبگری، جنێویشم پێئەدەی."

لەوکاتەدا ئەیویست بڕواتە دەرەوەو بەڵام گرتبوویان. لەدواییدا باوکت وتی: "تێبگە! عەلی مەردان، تێبگە من نەدینارو نەفەردە شەکرو نەزێڕو نەزیوو، هیچم نییە بتدەمێ، ئەوەی هەمەو زۆریشم هەیە هەر جنێوە بتدەمێ! دە تێبگە! لەخۆم نەگبەتترا. ئیتر دوایی دانیشتەوەو بوو بەپێکەنین)

وەک خەوببینم و داچڵەکم وابوو، وێنەکەم هەر بەدەستەوە بوو، بێ ئاگایش لەخۆم، دڵۆپێ لەفرمێسکەکانم کەوتبووە سەر وێنەکەو دەم و چاوی بێکەسی تەڕکردبوو. کاپتنی فڕۆکەکە وریای کردینەوە کە خۆمان ببەستینەوە، چونکە دوای چارەکێکی تر لەفڕۆکەخانەی "ئەرلەندا"ی ستۆکهۆڵم دائەبەزین .

من لەوەختی فڕین و بەرزبوونەوەی فڕۆکەدا ترسێکم لێئەنیشێ و حەزناکەم و نامەوێ لەوبەرزییەوە تەماشای خوارەوە بکەم! بەڵام لەوەختی دابەزین و نیشتنەوەدا زۆرم پێخۆشە، ئاگام لەوساتەوەختەبێ، کەپێچکەی فڕۆکەکە بەر عەرد ئەکەوێ.

ئێستە لەنزم بوونەوەداین، فڕۆکەکە دائەچێ، گوێم کپ بووە. تەماشای خوارەوە ئەکەم و دارستانەکان لەبەر زەردەی خۆردا بریسکە بریسکیانە، شەقامەکان باریک و درێژو لەڕەش مار ئەچن. ئەپارتمان و خانووەکان، ئەوەندە نزم و بچووکن لەتۆوایە بەلەپی دەستێ وەک یاری منداڵان ئەتوانی تێکیانبدەیتەوەو لەدوایشدا دروستیان بکەیتەوە. پارکەکان و ئەو ئۆتۆمبێلانەی تیایاندا وەستاون لەڕیزە قالۆنچە ئەچن. نزمتر بووینەوەو ئەوانیش گەورەتربوون، ئێستە خەریکین باوەش بەدارستانەکاندا بکەین یان خۆمان بکەین بەناو گۆمەکاندا، دەنگێک هات و فڕۆکەوان دەرگای پێچکەکانی کردەوە. دەقیقەیەک و شەقامی فڕۆکە دەرکەوت و ڕیزە گڵۆپی تەنیشتی و لەرەیەک و پێچکەکان دایان لە عەردو ئینجا وژەیەکی تیژو وردە وردە خاوبوونەوەو ڕۆیشتنی هێواش تابەردەمی خەرتوومی چوونە ژوورەوە .

بەپێچەوانەی ئەو هەموو لێپرسینەوەو ماندووبوون و پشکنێنە زۆرەی لە فڕۆکەخانەی ڕۆما تووشیبووم، لێرە لەفڕۆکەخانەی "ئەرلەندا"ی ستۆکهۆڵم، ئاسایی و ئاسان وەک هەموو ئەوانی تر کارەکانم مەیسەر بوون و ڕاینەگرتم و تەنانەت لەبەشی کۆنترۆڵی کەل و پەلیشدا تەماشای جانتاکانیان نەکردم و لەسەرخۆ پاڵمنا بەعەرەبانەی جانتاکانەوەو دواجار دەروازەی بەردەم کرایەوەو چوونە ناو ئەو هۆڵی چاوەڕوانییەوە کە خەڵکێکی زۆر لە شێوەی بازنەیەکدا ڕیزیان بەستبوو، هاتبوون بەپیر خۆشەویت و کەسوکارییانەوە .

یەکەم کەس کە هەر لەدوورەوە بەدیمکرد، هاوڕێم "تەها باراوی" بوو، دوای چەند چرکەیەک تەماشامکرد کۆمەڵێ خۆشەویستو برادەری تریش هاتوون بەپیرمەوە، کاکە "دارۆی شێخ نوری شێخ سالح"، "کاکە خولە" لەسەر عەرەبانەکەی، ئەم جوامێرە یەکێک بوو لە"پ. م"ە ئازاکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، لەنەبەردییەکدا بەخەستی بریندار ئەکرێ و دواتر ئەگەیەنرێتە سویدو چەند نەشتەرگەرییەکی گەورەی بۆ ئەکرێ و لەمردن ڕزگاری ئەکەن، بەڵام بەمجۆرە ئەکەوێتە سەر عارەبانەی "هاندی کاپی"، من لەوەوبەر نەمناسیبوو، بەڵام بەداخەوە هێشتا هەر لەسوید بووم، کە لەڕووداوێکی ئۆتۆمبێلدا خۆی و کوڕێکیشی گیانیان لەدەستدا! هەروەها کاک "سەرداری سەعید خەڵەف" و کاک "ئەحمەد سەعید" و کاک "بەکر حسەین" و "کاک ڕەسوڵ" هاتبوون.

یەکەیەکە باوەشیان پێداکردمو بەگەرمی بەخێرهاتنیانکردم. لەسەر داوای من بۆ ئەوەی قاوەیەک بخۆمەوە، چارەکە سەعاتێکیش لەکافتریای هۆڵەکە دانیشتین. دوایی بەکۆمەڵ چووینەدەرەوە، چەند ئۆتۆمبیلێکی خۆیان پێبوو، لەیەکێکیانداو بەتەنیشت تەها باراوی-یەوە سوار بووم و ڕوومانکردە ستۆکهۆڵم. ئێوارەیەکی درەنگی هاوین بوو، بەڵام هێشتا دنیا هەر ڕووناک بوو، دیارە من بۆخۆم شوێنێکی خۆم نەبوو ڕووی تێبکەم، بەڵام هەر زوو باراوی وتی (تۆ ماڵی خۆت هەیە، ئەویش ماڵی منە).

کاک "تەها باراوی"م لە دەمێکەوە ئەناسی، واتە لەکۆتایی شەستەکانەوەو لەدامەزراندنی کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردییەوە لەسلەیمانی. من؛ بەتەمەن لەو گەورەترم. لەسەرەتای حەفتاکانیشدا تێکەڵ بەبزووتنەوەی شانۆیی بوو، ئەندامی تیپی پێشڕەو بوو، لەزنجیرە نواندنە تەلەفزیۆنییەکانەوە بەتایبەتی لە"خولەچەخماخە"وە دەرکەوت. دواتریش لەچەند شانۆنامەیەکی تردا

بەشداریکرد. لەدوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول و سەرهەڵدانەوەی موقاوەمەت لەکوردستاندا، تێکەڵ بەسیاسەت و جولانەوەی چەپی ئەوسەردەمە بوو. یەکێک بوو لەدەروێشە دڵسۆزەکانی، لە دژوارترین ڕۆژگاردا چووە شاخ و نێو سەنگەری بەرەنگاربوونەوەی فاشیزم لەکوردستاندا. پێموایە لەکۆتایی حەفتاکانداو سەرەتای هەشتاکاندا بێدەنگ و بێوەی گەڕایەوە شارو دواتر هەڵیاندا بۆ خوارووی عێراق و لەدەرفەتێکیشدا بۆ دەرەوەو گەیشتە سوید .

کاک "تەها باراوی" پیاوێکی کورد پەروەری دڵ و دەروون پاکە، بۆ هاوڕێی خۆی دڵسۆزو دەرگایماڵی وەکوو دەرگای دڵی کراوەیە. بەردەوام دەم بەپێکەنین و سەری لەگاڵتەوگەپ زۆر ئەخورێ. هەردوو هونەرمەندی ناسراو "عوسمان چێوارو کەمال سابیر" لەهاوڕێ نزیکەکانی ئەوو منیش بوون. لەسویدیش هەر لەسەرەتاوە دەستی بەکارکردن کردووەو دانەنیشتووە. هەرگیز سکاڵا ناکات، وەک ئەڵێن: (من بۆ یەکەمجار پێڵاوی غەریبیم لەماڵە سپیەکەی ئەودا کردەوە). ئەو سەردەمە ماڵیان یان شوقەکەیان لەگەڕەکی "تێنستا"بوو. ژوورێکیان بۆ تەرخانکردم .

خاتوو "نازەنین" خانی ژنی، لەخوشکی خۆم زیاتر بەتەنگمەوە بوو، بیرمە یەکەم شەو خەوم لێنەکەوت، چونکە لەدنیای هاوینی سویددا، تاشەو درەنگان هەر ڕووناکە، منیش فێری ئەوەنەبووبووم. ناچار پەنجەرەی ژوورەکەمیان بە بەتانییەک داپۆشی!

یەکەم چوونە دەرەوەو گەڕانیشم بەشاری ستۆکهۆڵمدا بۆ بینینی شوێنە گرنگەکان هەر کاک تەها-م لەگەڵدا بوو. دیارە زۆرشتی تازە نەبینراوی ئەورووپا وەک پەناهێندەیەکی تر بۆ من غەریب نەبوو، چونکە من لەئیتاڵیاوە هاتبووم. ڕۆماو فلۆرەنساو ڤینسیاو گەلێ هاوینە هەوارو شارو شارۆچکەی تری ئیتاڵیا گەڕابووم، بەڵام هەر وڵاتەو کەش‌و تایبەتمەندی خۆی هەیە. ستۆکهۆڵم: شاری "هەزار دوورگە"ی پێ ئەڵێن. وڵاتی سوید تابڵێی وڵاتێکی جوانە، بەڵام ئەو زستانە سەخت و دورودرێژەی تێکیداوە. کەم هەتاوە، تەنانەت هەندێ ساڵ هاوینانیش سەر بەلێزمەو شەستە بارانە. ئەگەر باران نەبارێ هاوینێکی خۆش و سازگاری هەیە. بەتایبەتی کەنار دەریاو گۆمەکانی هەر هەمووی شوێنی سەیران و گەشتوگوزارە .

سوید هەمیشە سەوزە یان هەمیشە سپییە، ئەم دوو ڕەنگە ڕەنگی زاڵن لەو وڵاتەدا. سویدییەکان وەک ئیتاڵییەکان گەرم و دەم بەپێکەنین و جوولە

جوولکەرو بەهەراو زەنانین. خۆیشیان وەک کەش و ئاو و هەوای ولاتەکەیان ساردن! بەلام بەشی هەرە زۆریان بێوەیی و ئاشتیخوازو مرۆڤ دۆستن. درەنگ ئەبنە هاورێت، بەلام کەبوون باش ئەبن. من دوای ئەزموونی چەند ساڵەم لەسویددا، ئەو خوێن ساردیی و تێکەڵ نەبوونە خێرایەی ئەوان بۆ ئەوە ئەگەڕێنمەوە کە ناخۆشی و نەهامەتی و کارەساتی شەڕو ماڵ وێرانیان زۆرکەم دیوە، هەموو کەسێ لەو ولاتەدا ژیانی بۆ دابینکراوە. تەنانەت ئەگەر لەپلەیەکی بەرەو خواریشدا بێت. شارەوانییەکان یارمەتی کوهولیستەکانیش ئەدەن. لەبەر ئەوە کەس پێویستی بەکەس نییە، ڕێژەی ژنانی لەش فرۆش لەسویددا، ئەو سالانەی من لەوێ بووم، هەر ئێجگار کەم بوو بە بەراورد لەگەڵ ولاتێکی وەک ئەڵەمانیا، یان ئیتاڵیادا. دیارە ئەمەیش پەیوەندییەکی بنەڕەتی بەژیانی سەقامگیربوونی ئابوورییەوە هەیە، سوید کانە نەوتی نییە، بەپێچەوانەی ولاتی نەرویجەوە، ئابووری سوید پشتی بەدارستانە زۆرەکانیان‌و بەپیشەسازی بەستووە. سیستەمی حوکمی دیموکراتییانە لەو ولاتەدا، ئەتوانرێ وەک نموونە لەدنیادا چاوی لێبکرێ. دیارە بێ کەموکوڕی‌و خەوش نییە، بەلام لەوە باشتر لەدنیای ئێستەدا نییە .

"جەنگیز ئەتماتۆف"ی ڕۆمان نووسی دیاری ڕووسیا، لە سەردەمی "گۆرباچۆف"دا سەرێکی لەسویددا، ئەتماتۆف ئەندامی دۆماو پەرلەمانی ئەوسای یەکێتی سۆڤیەت بوو، تەلەفزیۆنی سویدی چاوپێکەوتنێکیان لەگەڵدا کرد، لێیان پرسی: (سۆشیالیزم چییە؟!) لەوەلامدا وتی: (ئەوەیە کە لە سویددا هەیە!) .

لەسەرەتای گەیشتنما بۆ ستۆکهۆڵم، گەلێ لەماڵە کوردەکانی ئەوێ میوانداریبیانکردم، بیرمە ئەوەندە نەبوو گەیشتبووم، لەماڵی کاک "دارۆ" خوانێکی ڕازاوە بەخواردن‌و خواردنەوەوە ئامادەکرابوو. کاک تەها و هەر هەموو ئەو برادەرە خۆشەویستانەی تریش لەوێ بوون. ئەو شەوە لەوێ، دوا چیرۆکە شیعرێ کە لە"بەرگەڵو" نووسیبووم، لەوێ خوێندمەوەو تۆماریانکرد، ئەویش چیرۆکە شیعری "داڵ" بوو! ئیتر بەرەو دوا هەمووان بەسەرێناکردمەوە، چ لەماڵ و چ لەدەرەوە.

یەکێک لەو ڕووناکبیرە کورددانەی، کە لەستۆکهۆڵم ئەژیاو لەزانکۆی ئەوێش وەک توێژەرەوە کاری ئەکرد، کاکە "عومەر شێخ موس" بوو. من پێشتر نەمدیبوو، بەلام ناویم بیستبوو. ئەوکاتەی خۆی و "ئەگنیتا"ی هاوسەری لەشاخ و لەناو شۆڕشدا بوون و لەرۆژگارە هەرە سەختەکاندا ئەو هەڵوێستەیان

هەڵبژاردبوو، ئەو سەردەمە کاک عومەر ئەندامی مەکتەبی سیاسی "ی. ن. ک" بوو، بەڵام دواتر وازی لەکاری حزبی هێنا .

کاک عومەر؛ خەڵکی "عامودا"ی ڕۆژئاوای کوردستانە، ڕەنگە هەر دووسێ ساڵ بەتەمەن لەمن گەورەتر بێ، کوردستانییانە بیرئەکاتەوە. جگەلەوەیش، پیاوێکە لە قسەکردن و وتووێژدا هێمنو لەسەرخۆیەو ئەزانێ چی ئەڵێ و شارەزای پەیوەندییە دیبلۆماسییەکانەو ئاگای لەدنیای ناوەوەو دەرەوەیە. عەلمانی و عەقڵانییەو بەمەنتیق و بەڵگەی زانستییەوە ئەنووسێو ئەدوێ. سویدییەکان لەهەر ڕووداوێکی ناو کوردستاندا، لەهەر وەرچەرخانێکی گرنگدا، یەکێک لەوانەی پرسو ڕاوێژیان پێئەکرد کاک عومەر بوو. لەتێکەڵاوبوونی کۆمەڵایەتییدا کراوەیە، دەمارگیرو توندڕەو نییە. من خۆم بەقەرزاری ئەم پیاوە ئەزانم! چونکە لەسویددا، گەلێ یارمەتیدام و گەلێ دەرگای ئەو وڵاتەو کۆڕی نووسەران و ڕووناکبیرانی لەسەر کردمەوە.

لەمەسەلەی وەرگرتنمدا بەپەناهێندەی سیاسی و لەکاروباری لای پۆلیس و جێبەجێکردنی ئیشوکارەکانم و دەرهێنانی پەساپۆرتی ئەو وڵاتەداو لە وەرگێڕانی شیعرەکانمدا بۆ سویدی ئەوەندە یارمەتیداوم و ماندووبووە، کە هەرگیز لەبیرمناچێتەوە .

ماوەی بیست ڕۆژ زیاتر لەماڵی باراوی مامەوە، بەڵام ئیتر ئەبوو شوێنی خۆم هەبێ. بەهاوکاری هەمووولایەک و کاک عومەر، ژوورێکیان لە بەشی ناوخۆی زانکۆی ستۆکهۆڵمدا بەکرێ بۆ گرتم. ناوچەکە "لاپیس"یان پێئەوت و نزیکی زانکۆی ستۆکهۆڵم بوو. بیرمە لەگەڵ کاک دارۆ و کاک تەهادا چووین بۆ بازاڕێکی تایبەت، وەک بێتەوە بیرم، بازاڕەکە هی کۆمەڵەیەکی هەروەزی عەسکەری بوو. لەوێ شتومەک و کەلوپەل هەرزانتر بوو بە بەراورد لەگەڵ بازاڕەکانی تردا. ئەوەی پێویست بوو بۆ ژوورەکەم لەقاپ و قاچاغ و کەلوپەل لەوێ کڕیمان.

شوێنەکەم بریتی بوو لەتەنها ژوورێک و دوو قەنەفەو مێزێک و دوو کورسی تاک و تەباخێکی بچووک و تەختێکی نووستن و لەولایشەوە حەمام و تواڵێت. یەخچاڵێکی بچووکیشی تێدابوو. بۆ من سەرو زیادبوو، یەکەمین شتێ، کە کاک عومەر پێیوتم ئەوە بوو بچمە قوتابخانەی فێربوونی زمانی سویدیەوە، بەڵام خولێک بەسەرچووبوو، ئەبوو چاوەڕێی خولی تازەبکەم. لەو ماوەیەدا هیچ ئیش و کارێکم نەبوو، هەر خەریکی نووسینی خۆم بووم. لەڕێی کاک عومەر شێخ

موس-ەوە کاک "محەمەد ئۆزۆن"م ناسی و ئەو ڕۆژە هەرسێکمان پێکەوە داوەتی کاک ئۆزۆن بووین. لەو دانیشتنەدا باس لەوەکرا، کە هەفتەیەکی تر لەڕێ و ڕەسمێکی تایبەتیداو بە ئامادەبوونی "ئینگفار کارلسون"ی سەرۆک وەزیرانی ئەوسای سوید، خەلاتەکەم ئەدەنێ. کاک محەمەد ئۆزۆن وتی: (هەموو ساڵێ ئەم خەلاتە لەلایەن وەزیری ڕۆشنبیرییەوە دراوە، بەلام بۆ یەکەمجارە ئەمساڵ سەرۆک وەزیران خۆی پێشکەشی بکات. ئەمەیش لەبەرئەوەیە ئەیانەوێ بایەخێکی زیاتر بەکورد بدەن!).

هەر لەو هەفتەیەداو بەر لەڕۆژی بەخشینی خەلاتەکە، کاک عومەر وای بەباشزانی پێنج کورتە شیعرم بۆ سویدی وەربگێردرێ، بۆ ئەوەی لەو ڕۆژەدا من بەکوردی و سویدییەک بەسویدی بیخوێنێتەوە، هەروەها وتارێکی کورتیشم هەبێ بۆ ئەوەی بەڕوونی باس لەباروودۆخی سیاسی ئەوکاتەی کوردستان و ئەو زوڵم و پێشێلکارییانەی مافی مرۆڤ بکەم، کە لەلایەن ڕژێمی دیکتاتۆرەوە ڕۆژانە پیادە دەکرێت. هەڵبەت زمانە سویدییەکەی کاک عومەر لەکوردییەکەیشی باشتر بوو، چونکە ئەو لەسەرەتای شەستەکانەوە هاتۆتە ئەم وڵاتە، وەختێ ئەو لێرە بووە ژمارەی کوردی پەناهێندە لەهەموو سویددا لەپەنجەکانی دەست تێپەڕیان نەکردووە. خۆم شیعرەکانم هەڵبژاردوو چەند جارێک بۆ کاک عومەرم خوێندەوەو وشە بەوشەم بۆ ڕوونکردەوەو ئینجا ئەو کردنی بەسویدی. هەروەها کورتە وتارەکەیشم نووسی و بەهەمانشێوە ئەویشی وەریگێڕا.

هۆڵی "فولکوتوی" بۆ ئاهەنگی خەلاتەکە دەست نیشانکرا، بەرلەوەختی دیاریکراو، کاک عومەر هات بەشوێنما و بەیەکەوە ڕۆیشتین. هۆڵەکە سپی و جوان و مام ناوەندی بوو، ئەوانەی بانگکرابوون هەڵبژاردەی شاعیران و نووسەرانی سوید بوون. ڕۆژنامەنووسان و کامێراکانی تەلەفزیۆن هەموو لەوێ بوون .

"ئینگفار کارلسون" لەگەڵ ژنە ڕۆژنامەنووسێکی پێست ڕەشدا بوو، کاک عومەر منی پێناساندو، یەکەم وێنەمان پێکەوە گرت. دوایی چووینە ژوورەوەو ئاهەنگەکە بەوتەیەکی کورتی یانەی قەڵەمی سویدی کرایەوە. دوایئەوە، من بەکوردی و کاک عومەر بەسویدی وتارەکەمان خوێندەوە. ئینجا لەگەڵ یەکێکی تردا من شیعرەکانم بەکوردیو ئەویش بەسویدی خوێندیەوە. دوایی ئینگفار کارلسون؛ هاتە سەر شانۆ بچکۆلەکەو شەهادەی خەلاتی تۆخۆلسکی پێبەخشیم، کە بریتی بوو لە نامەیەکی نووسراوو ئەوەی تێدا دەست نیشانکرا بوو، کە بڕی

حەفتا و پێنج هەزار کرۆنی سویدیم بۆ ئەم خەڵاتە ئەدەبیە لەلایەن یانەی قەڵەمی سویدییەوە پێ ئەبەخشرێ .

حەفتا و پێنج هەزار کرۆن؛ لەساڵی (١٩٨٧)دا کەم نەبوو، بەڵام دوایی ئەوەیشیان تێگەیاندم، کە تاساڵێک هیچ جۆرە یارمەتییەکی تری سۆسیال وەرناگرم، واتە ژیانی ساڵێکم هەر لەسەر ئەو پارەیە ئەبێ، کە لە ڕاستیدا ژیانی ساڵێک ئەوەندەی هەر ئەوێ.!

دوای ئەوەی هاتینە دەرەوە، ڕۆژنامەنووسان و کامێراکانی تەلەفزیۆن لێمان کۆبوونەوەو چەندین پرسیاریان دەربارەی ئەدەبی کوردیو دۆزی کورد بەگشتی لێپرسیم. بۆسبەی بەیانیش لە (D. N) داگزنی هیتەری گەورەترین ڕۆژنامەی سویدیدا تەواوی لاپەڕە دووی بۆ ئەم خەڵاتەو وێنەی من و کورتەی ژیانم تەرخانکردبوو. وتارەکە کاک محەمەد ئۆزۆن نووسیبووی. هەروەها لەڕۆژنامەکانی سەر لەئێوارەیشدا کەمتازۆر باس لەم خەڵاتەی تۆخۆلسکی کرابوو. هەواڵەکەیش گەیشتەوە کوردستانو لەڕادیۆی شۆڕشەوە بڵاوکرایەوەو هاوڕێکانم پیرۆزباییان لێکردبووم و وتاری ئەو ئێوارەیەی ئێزگەیش هەر بەو بۆنەیەوە نووسرابوو.

کەسێ نییە سڵاوی لێبکەیت؛
کەسێ سڵاوت لێناکات!..

ئەم خەڵاتە بۆ من چی بوو؟ !

ئەوە یەکەمجار بوو خەڵاتێکی ئەدەبی لەئەوروپادا بدرێ بەشاعیرێکی کورد، ئەوەی بەلای منەوەو لەخۆم گرنگتر ئەوەبوو ناوی میللەتەکەم و زمانی کوردی لەرۆژگارێکی سەختی وەک ئەوسادا باسبکرێو دەنگبداتەوەو بکەوێتە سەر زاری رۆژنامەکانو خەڵکی ئەو وڵاتەو دنیا. لەو رۆژگارەداو لەباشووری کوردستانداو لەلایەن رژێمێکی دڕندەو بەربەرییەوە تووشی گەورەترین کارەساتی قەلاچۆکردن بووبووینەوە، دنیای درەوەیش لەئاستی ئێمەدا هەرهەموو کەڕەواڵە بوون و دەوڵەتان کلکیان لەگەڵ کلکی سەدامدا گرێدابوو. لەلایەکی تریشەوە سودی بەخشینی ئەو خەڵاتە ئەوەبوو، دەرگای رۆژنامەکانی ئەوروپای بۆکردمەوە، تێکەڵ بەکۆڕو کۆبوونەوەی نووسەران و ئەدیبانی ئەو وڵاتەی کردم، هاورێی تازەم پەیداکرد .

ئەگینا خەڵات وەک خەڵات نەکەس ئەکا بەشاعیر و ئەدیب و نە ئەبێتە تاقە پێوانەیش بۆ گەورەیی ئەدیب. لەرۆژنامەو گۆڤارە عەرەبییەکانی سوریاو میسریشدا هەواڵەکە بلاوبۆوە. گەلێ نامەیشم لەدۆست و ناسیاوو ئەدیبانی کورد و عەرەبەوە پێگەیشت. یەکێک لەو نامانە نامەیەکی جوانی زاناو رووناکبیری گەورەی عێراقی "هادی العلوی" بوو. لە ئەلبوومی تایبەتی خۆشمداو لەسوید، تەواوی ئەو وێنانەم هەڵگرتووە، کە لەرۆژی بەخشینی خەڵاتەکەدا گیرابوون.

لەدوای ماوەیەک ئیتر کاتی ئەوەهات یەکەمین کۆڕی شیعر خوێندنەوە لەشاری ستۆکهۆڵم ببەستم. بۆ ئەو مەبەستە، هاوڕێکانی خۆم کار ئاسانییان بۆکردم و ڕیکلامی تایبەتییان بۆ دروستکردم‌و بڵاویان کردەوە. هۆڵە گەورەکەی "فولکوتوی"یان بۆ ئەو ڕۆژە گرتبوو کە یەکێکە لەبەناوبانگترین هۆڵی کۆڕو کۆبوونەوەو کۆنسێرت گێڕان لەسویددا. بەیادی شاخ و هاوڕێکانم بۆ ئەو ڕۆژە ڕانکو چۆغەم لەبەرکردوو جامانەیەکیشم بەست ..

بەر لەهاتنی خەڵکەکە، چوومە ئەویدوی شانۆو پەردەو، لەوێ بووم تاکاتی دەستپێکردن. ئەو وەختەی هاتمە سەرشانۆکە هەر بەچاو مەزندەی ئەوەمکرد کە (٤٠٠ تا ٥٠٠) کەس دانیشتبوون. وەک هەموو کۆڕێکم، لەپێشدا وتەیەکم خوێندەوە ئەم وتەیە دواتر بوو بەپێشەکی یەکەم بەرگی سەرجەمی شیعرەکانم، کە بەیارمەتی "کولتووهوس"و لەپۆلۆنیا چاپکرا .

دوای ئەو وتارەو بۆماوەی زیاد لەسەعات و نیوێک تەواوی ئەو شیعرانەم خوێندەوە، کە لەدیوانەکانی: "کازیوەو ئاوێنە بچکۆلەکان و کەشکۆڵی پێشمەرگەوە" گوڵبژێرم کردبوون. پێشوازییەکی گەرمم لێکرا. ئەوەی شایانی باس بێ، شیعر دۆستان، لەشاری ئۆپسالاو شارو شارۆچکەکانی تری نزیک ستۆکهۆڵمەوە بۆ ئەم کۆڕە هاتبوون. ئامادەبووانیش لەکوردی هەموو پارچەکانی کوردستان پێکهاتبوون. لەبیرمە هەر ئەو ڕۆژە، دوای هاتنە دەرەوەم، هەڤاڵ "خەجۆ"م بینی، ناوم بیستبوو، بەتایبەتی لەو سەردەمەدا کە لەشاخ و لەناو شۆڕشدا بووو، بەڵام ئەوە یەکەمجار بوو یەکتر بناسین. ئیتر پێکەوە چووینە دەرێ بۆ پیاسەو، لەوێشەوە چووینەوە بۆ ژوورەکەم و نانی ئەو ئێوارەیەمان پێکەوە خوارد.

نزیک ماڵەکەم و هەر لە"لاپیس" و لە ئەپارتمانێکدا، کاک "حەمە سابیر و هەتاو خان" و منداڵەکانیان شوقەیەکیان هەبوو. چەند جارێک داوەتی ماڵەوەیانکردم. هەروەها دوای گواستنەوەیشیان بۆ "ئەکاڵ"و لەساڵانی دواتریشدا کە لەپاریس بینیمنەوە بۆ ماوەیەک لەماڵی ئەوان بووم .

کاکە "حەمە سابیر و هەتاو خانی" هاوسەری نموونەی دڵسۆزی و میوانداری و دەست و دڵ جوانی و پاکی بوون و چاکەیانم بیرناچێتەوە.

هەر دوابەدوای وەرگرتنی خەلاتەکە، داوام لەدایرەی هیجرە کرد کە پەناهێندەیی سیاسیم لەسوید بداتێ. کاک عومەریش خۆی کەوتە سۆراخکردنی. لەخولی

تازەی فێربوونی زمانی سویدیدا وەرگیرام. فێربوونی ئەو زمانە بۆ من گران بوو! لەبەرئەوەی لەتەمەنێکی هەڵکشاودا بووم، بەراورد بەو بیانیانەی تر، کە لەپۆلەکەمدا بوون. قوتابخانەکەمان ئەکەوتە سەر شەقامی "سڤێ ڤێگن". گرووپێکی دەکەسی بووین. چینی و پۆلۆنی و فارس و عەرەب و یۆنانی و ئێرلەندی و یۆگۆسلاڤی و تورک و چیکی و ڕۆمانی بووین. ماوەی دوو مانگی بەڕێکو پێکی دەوامم کرد. لەو ماوەیەدا هەستمکرد جگەلە قوتابخانە ئەگەر لەژوورەکەی خۆیشمدا شەوانە دوو سەعاتێ خۆم بە پێداچوونەوەی ئەو وانانەوە خەریک بکەم دواناکەومو لەگەڵیاندا دەرئەچم. ئەو قوتابیانە هەموویان لەمن گەنجتربوون. لە تاقیکردنەوەکانداو لەوسەرەتایەدا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ باشتر ئەبووم. بەڵام ئیتر دوایئەوەی لەهەموو شاروشارۆچکەکانی سویدەو لەهەر شوێنێ پەناهێندەی کوردی لێبوو، بانگهێشتیان ئەکردم، بۆ ئەوەی سەردانیان بکەم و کۆڕی شیعر خوێندنەوەیان بۆ بگرم، دەوامکردنم پچڕپچڕ بوو. جاری واهەبوو چوار پێنج ڕۆژ دوائەکەوتم و وەختێ ئەهاتمەوە ئەوان زۆر لە پێشمەوە بوون. بەمجۆرە دامە دواوە. دواتر دەوامەکەم گۆڕی بۆ دوای نیوەڕوان. یەکەم ژنە مامۆستام ناوی "ئەنگرید" بوو، کەوتبووە تەمەنەوە، بەڵام زۆرجوان وانەی ئەوتەوە. لەناو ئەو گرووپەیشدا دووسێجار لەگەڵ تورک و عەرەبەکەدا تووشی دەمەقاڵێ و شەڕە قسە بووین. دواتر چوومە قوتابخانەیەکی تر لە "ماری تۆریت"، سەفەرەکانم زیادیانکرد، ئەوە جگەلەوەی هاوڕێکانم هەموو کوردبوون و تێکەڵاویم لەگەڵ سویدیەکاندا نەبوو. گەنجەکان بەهۆی ئەو کچە سویدیانەوە، کە ئەبوونە هاوڕێیان، زۆر زووتر فێری زمانەکە ئەبوون. من لەو تەمەنە تێپەڕمکردبوو. لەساڵی یەکەمدا مۆڵەتی مانەوەم بۆ دەرچوو، هەروەها پەساپۆرتێکی "ڕیسو دوکۆمێنتێ" کاتیم وەرگرت. کە ئەمتوانی سەفەری گەلێ لەوڵاتەکانی ئەورووپای پێبکەم. هەڵبەت ئەوکاتەی، کە لەگەڵ کاک عومەردا چوومە لای پۆلیس، داوای ئیقامەیشم بۆ دایکم و نەسرین و منداڵەکان کردبوو.

کاک "عومەر عەبدوڵڵا" پیاوانە بەڵێنەکەی خۆی بردبووە سەر، نەسرین و منداڵەکان گوشاری زۆری ئاسایش و پۆلیسیان لەسەر ببوو، هەر ڕۆژەی لەماڵێک ببوون. هەڵبەست و هەڵۆ لەترسی گرتن وازیان لە قوتابخانە هێنابوو. بەوجۆرە هەفتەیەک لەسلێمانی و هەفتەیەکی تر لەهەولێر و لەبەغدا ئەبوون. کاک "سالح دزەیی" پارێزەر ئامۆزای هونەرمەند "عومەر دزەیی" بەهۆی ماڵی

فریشتەی خوشکمەوە نەسرین و منداڵەکانیان ناسیبوو. ج خۆی و ج "ناسکە"خانی هاوسەری بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ لەهەولێر میوانداری دایکم و نەسرین و منداڵەکانیان کردبوو، هەروەها کاک "حسەین عارف"ی هاوڕێم و "خانم"ی هاوسەری، کە لەو سەردەمەدا ماڵیان لەهەولێر بوو، بەهەمانشێوە دەرگای ماڵیان بۆ والاکردبوون. هەروەها لەبەغدایش ماڵی کاک "فەرەیدون عەلی ئەمین"ی ئامۆزازام و هاوسەرەکەی "ناهیدە" خان .

داڵدەدان؛ لەو سەردەمە پڕ لە مەترسی و ناخۆشەدا، نەهەموو کەس ئامادەبوو بیکاو نەبڕوایش ئەکرا بەهەمووکەس. بۆیە لەجێی خۆیدایەتی، کەدەستی ڕێز بگرم بەسنگمەوە بۆ هەموو ئەو خێزانە جوامێرانەی لەو سەردەمە تاریکەدا بوون بەڕووناکیی بۆ خاوو خێزانی من و فریایان کەوتوون .

بەڵێ کاک "عومەر عەبدوڵلا" لەڕێی "پ. م" و ئەو چەکدارانەی حکومەت، کە بەدزییەوەو ژێر بەژێر پەیوەندییان لەگەڵ شۆڕشدا هەبوو، هەروەها بەیارمەتی "پ. م"ە کانی دیموکرات، هەر لەڕێگەی قەلادزێ-وە بەرەو ڕۆژهەلاتی کوردستان، خاووخێزانی من و "د. خەسرەو خاڵ"ی دەرکردبوو. کاک "شێرکۆ شێخ نوری"، کە یەکێک بوو لە "پ. م"ە دلێرەکانی لای کاک عومەرو دواتریش لە شەڕی بەرەنگاربوونەوەداو لەنەبەردێکدا بەخەستی بریندارکراو چاوێکیشی لەدەستدا، ئەو لەگەڵیاندا ببوو تاشوێنی مەبەست .

بەڕاستی کاک "شێرکۆ شێخ نوری" لە جێی شیرکۆ بێکەس ببوو. بەدرێژایی ئەو ڕێ وبانە سەخت و عاسییانەی نێو شاخ وداخ ئاگای لێیان ببوو. بەدەستییانەوە ماندووببوو، لەزۆر شوێندا دایکمی کردبووە کۆڵ. بەدەم هەموو داوایەکی منداڵە وردەکانی من و د. خەسرەو خاڵەوە چووبوو. ئاخر چۆن پیاوی وا جگەر سۆزو ئاکاری وامەردانەو چاکەو یارمەتیی والەبەرچاو، تامردن بیرئەچێتەوە.

من هەتا چەند مانگێ و دوای ئەوەی ئیتر تونێل بان و شوێنەکان شارەزا بووم و ئەمتوانی خۆم بە تەنیا بچمە دەرەوەو بگەڕێم، شتێک لەغەریبیی خۆمم بیرچووبۆوە، بەلام دوایئەوە ئیتر ڕۆژ لەدوای ڕۆژ وام هەستئەکرد، من کەوتوومەتە بیابانێکەوەو بەچواردەوری خۆمدا ئەسوڕێمەوەو چاو بۆ وڵات و هاوڕێکانی کوردستانم ئەگێڕم و بەلام کەس نابینم! لەسەرابێکی دوور زیاتر. هەرکەسەو خەریکی کاری خۆیەتی و نزیکترین ناسیاویشت ناتوانی ببینی، مەگەر شەممەوان یان یەک شەممەوان، ئەویش دوایئەوەی بەتەلەفۆن یەکتر ئاگادار ئەکەنەوە لەکاتو شوێنی بەیەکتر گەیشتن. من تەنها قوتابخانەکەم

هەبوو، ئەویش لەدوو سەعات تێپەڕی نەئەکرد، دوای ئەوە ئیتر تاق و تەنیا بۆ خۆم ئەسوڕامەوە .

بە هەزاران کەس ئەبینی و هیچیان ناناسی. یەکێک نییە سڵاوی لێبکەیت و یان سڵاوت لێبکات!. ئالەو ساتەوەختانەدا وام هەستئەکرد، من بزربووم و ڕێبوارێکی وێڵم و ئامانجێک نییە ڕووی تێبکەم. ئەم بازاڕو ئەو بازاڕو، ئەم شەقام و ئەو شەقام و، لەگەڵ خەیاڵ و بیرەوەریدا مل بنێ و دیسانەوە بگەڕێرەوە بۆ ڕابوردوو. ڕۆژێکیان ئەسووڕامەوە، ناسیاوێکم دی و بەسەرپێوە قسەمان کردو وتی: (من لەڕێی ئێرانەوە هاتووم وماڵی ئێوەو د. خەسرەو خاڵ گەیشتوونەتە ئەوێ. بەڵام ئیتر نازانم لەکوێن!). ئەم هەواڵەم پێخۆش بوو. ئیتر دوایئەوە چەند ڕۆژێکی نەخایاند، نەسرین نامەیەکی بۆ نووسیبووم، دیاربوو نامەکە هەر بەدەستی نێردرابوو. نەسرین لەو نامەیەدا نوسیبووی: (ماوەیەکە گەیشتوونەتە ئێران و ئێستا لەناوچەی "کەرەج- حەسار" لەماڵێکدا ژوورێکیان بەکرێ گرتووەو لەگەڵ دایکم و منداڵەکاندا پێکەوەن و ساغ و سەلامەتن". ئەدرەسی خۆشیان نووسیبوو. وەڵامم دانەوەو ژمارەی تەلەفۆنی خۆیشم بۆ نووسین. بەمجۆرە ئیتر لەڕێگەی پۆست و تەلەفۆنەوە پەیوەندیم لەگەڵ نەسرین و دایکمدا بەردەوام بوو. کاک "عومەر شێخ موس"م ئاگادارکردەوە، کە نەسرین و منداڵەکان ئێستە لەئێرانن. کاک عومەر-یش هەر زوو پێیوتم: (ئەم کارە ئەخایێنێ و نزیکەی ساڵێکی ئەوێ تائەوان ئەگەنە لات، بەڵام پێویستە زوو زوو سەر لەسەفارەتی سویدی بدەن لە تاران) .

جەنگی ئێران- عێراق لەگەرمەیدا بوو. ئەو ڕۆژانە بوو کەبەغداو تاران شەڕە ساروخیان بوو. هەڵۆی کوڕم هەموو هەفتەیەک ئەچوو بۆ تاران و سەری لەسەفارەتی سویدی ئەدا، لەیەکێک لەو سەردانانەدا ساروخێکی عێراقی لەناوچەی سەفارەتو نزیکی ئەوان ئەدات، بەڵام باشبوو سەلامەت دەرچووبوو. شەوانە لەژوورەکەی خۆمدا، خەریکی خوێندنەوەو نووسین ئەبووم، بەڵام تەنیایی و غەریبییەکە منی وێرانکردبوو. ئەو ماوەیە بەردەوام گوێم لەگۆرانییەکانی "حەمەی مامڵێ" ئەگرت و جاری وایش هەبوو لەگەڵیدا ئەگریام!. بێزاریی لەناوەوە هەڵیئەکۆڵیم. بارودۆخی خراپی وڵات و پەرەوازەیی خێزان و تەنیایی خۆیشم، سەرباری هەموویان بوو. لەهیچ لایەکەوە تروسکەیەک نەبوو، هەرچەندیشم ئەکرد نەمئەتوانی لەگەڵ کەلتووری ئەم وڵاتەدا ڕابێم. فێربوونی زمانی سویدیش لە پچڕپچڕەوە بوو بەجۆرێک لەدابڕان، بەتایبەتی دوایئەوەی

ڕێگەی دەرەوەی سویدیشم بۆ کرایەوە. بانگهێشتی کوردە ئاوارەکان لەهەموو لایەکەوە بۆ کۆڕبەستن لەزیادبووندا بوو. تاوایلێهات، هەندێ سەفەری دەرەوەم نزیکی مانگی ئەخایاند. جا یان ئەبوو ئەو سەفەرانە نەکەم و دووسێ سالێ بۆ ئەم فێربوونی زمانە تەرخان بکەم، تا بەچاکی فێری ببم. یان لەسەر نووسینی خۆم و ئەو سەفەرانە بەردەوام بم. من ئەمەی دواییانم هەڵبژارد، ئەوەی فێری بووم هەر ئەوە بوو، کە لەچەند مانگی سەرەتادا فێری بووم و تائێستەیش ئەو کەمە سویدییەی ئەیزانم، هەرهی ئەو دەستپێکەیە. هەموو هەفتەیەک جارێک ئەچووم بۆ زانکۆی ستۆکهۆڵم و سەرم لەکاک عومەر شێخ موس ئەدا، ژوورێکی خۆی هەبوو. لەبەر ئەوەی خۆیشی جگەرەی ئەکێشا منیش ئەمکێشاو بەحاڵ لایەکی پەنجەرە درێژکۆلەکەی لەبەر دووکەڵ ئەکردەوە، بەڵام دواتر کاک عومەر هەر بەئێجگاری وازی لەجگەرەکێشان هێنا، چونکە ژنێکی باسکاری سویدی کە ژوورەکەی کەوتبووە سەرەوەی هەمان ڕاڕەوە پێیوتبوو: (بۆنی جگەرەکانت ئەگاتە ژوورەکەی منیش) !.

هەر لە مانگی یەکەوە کاک عومەر خۆیی و ئەگنیتای ژنی بەیارمەتی خانمێکی سویدی خەریکی وەرگێڕانی کورتە شیعرەکان بوون بۆ سویدی، دوای نزیکەی ساڵێک، دیوانەکە چاپکراو ناونیشانەکەیشی بە سویدی "ئاوێنە بچکۆلەکان" بوو لە ڕۆژنامەی (D. N) یشدا، شاعیرێکی ناسراوی سویدیش لێکۆڵینەوەیەکی لەبارەوە نووسیبوو. هەر لەسەر ئەم هەڵبژاردەیە لەڕۆژنامەی "ئێکسپرێس"ی ئێوارانیشدا ژنە ڕۆژنامەنووس "پییا" وتارێکی لەسەر نووسیبوو.

لەسەرەتای گەیشتنمدا بۆ سوید، دوو هاوڕێی دێرینم لەوێ بینییەوە، کاک "فازڵ جاف" و کاک "ئەنوەر شاکەلی"، کە لەچەند ساڵ پێشترەوە ئیتر هەر بە "فەرهاد شاکەلی" ناسرا .

کاک فەرهادی شاعیر؛ جگە لەزمانی ئینگلیزی زمانی سویدیش بەچاکی فێربووبوو. مامۆستای زمانی کوردی بوو لەزانکۆی "ئۆپسالا". جگەلەوەیش گۆڤاری "مامۆستا"ی کوردی دەرئەکردو لەسەر نووسینی شیعریش بەردەوام بوو.. هاوسەری کاک فەرهاد، خوشکی شەهید "نەجۆ"یە. چەند جارێکیش داوەتی ماڵی خۆیانیکردم و چەند شیعرێکیشمی لەگەڵ کاک "بەختیار ئەمین"دا کرد بە سویدی .

ناسیاوی و هاوڕێیەتی من و کاک "فازڵ جاف"یش بۆ سەرەتای حەفتاکان ئەگەڕێتەوە. ئەم هونەرمەندە لەهەرزەکارییەوە، لە کەرکوکەوە، عاشقی شانۆ بووە. وەختێکیش هات بۆ سلەیمانی، لەڕێی چەند شانۆنامەیەکەوە جۆرە وەرچەرخانێکی تازەی لەدەرهێناندا دروستکرد، کە بۆ ئەو سەردەمەی شانۆی کوردی کاری نوێ و داهێنەرانە بوون. دوای ئەوەی گەیشتە سویدیش تیپی "ئارارات"ی پێکهێناو درێژەی بەئیشەکانی خۆیدا. هەروەها بڕوانامەی ماستەری لە لەندەن وەرگرت و دواتریش بڕوانامەی دوکتۆرای لەسەر کارەکانی دەرهێنەری جیهانی "مایرهۆڵد" بەدەستهێنا.

ئێستا کاک فازڵ جاف؛ یەکێکە لەدەرهێنەرە گەورەکانی دنیا. لەدوور وڵاتی و غەریبیدا وەختێ هاوڕێی دێرینی خۆت ئەبینیتەوە پڕ ئەبیتەوە لەیادەوەری و هەتاوی وڵات و ئەژییتەوە.!

ڕۆژێکیان لەستۆکهۆڵم لەگەڵ کاک عومەردا بووم، بەرەو شەقامی "سڤێ ڤێگن" ئەڕۆیشتین، لەپڕێکدا لەسەر شۆستەکە، لوتمان تەقییەوە بە لووتی هونەرمەند "ناسری ڕەزازی" دا. ڕێکەوتێکی سەیربوو، من دواجار کەڕەزازی-م بینیوو لەشاخ و لای کۆمەڵەی ئێران بوو. هەر لەوێدا باوەشمانکرد بەیەکدا. کاک عومەر وتی: (ئێرە شوێنی ئەو ماچ و مووچە نییە باڕێکەکە نەگرین. ئەوە کافتریایەکە)، لەمیانەی قسەکردنندا، ڕەزازی، گلەییەکی زۆری لەوەکرد، کە هونەرمەند لەناو کورددا نرخ و بەهای خۆی نادەنێ. سەرەڕای هەموو دەردەسەری و ڕەنج و ماندووبوونەی، هێشتا هەر لێت ناڕازین و تیروتوانجت تێئەگرن. ماندووت ئەکەن .

بەمجۆرە ڕەزازی، لەسەر هەڵڕشتنی دەردە دڵی خۆی ڕۆیشت و لەدواییدا وتی (ئەم پارچە شیعرەم نوسیووە)، خوێندمەوەو دامەوە دەستی و قسەم نەکرد. تاگەیشتمە ئەو شوێنەی کە بڵێت: (ئیتر گۆرانی ناڵێم). قسەهات و ڕۆیشت و ئینجا ڕوویکردە من و وتی: (ئێ کاک شێرکۆ ئێستا خەریکی چیت و چیت بەدەستەوەیە؟) منیش لەوەڵامدا وتم: (کاکە ناسر منیش نیازم وایە واز لەشیعر بێنم و لەمەودوا گۆرانی بڵێم!!) ئیتر بوو بەپێکەنین و دواتر ئەم قسەیە، دەماودەمی کردوو گەیشتەوە وڵاتیش.!

بەشێکی زۆری پەناهێندە کوردەکان لەسوید، خەڵکی باکووری کوردستان بوون، لەڕێگەی ناوەندی فدراسیۆنەوە، زۆریانم ناسیی و تێکەڵیان بووم، لەدوایشدا بووم بەئەندامی فدراسیۆن‌و لەکۆنگرەی ساڵانەیاندا بەشداریمکردوو خۆم پاڵاوتو هەڵبژێردرام و چوومە دەستەی بەڕێوەبەرییانەوە. ساڵێک کارم لەگەڵدا کردن، بەڵام وەختێ زانیم ململانێیەکی توند هەیەو هۆو هۆکارەکانیش زیاتر بۆ ململانێی حزبی و شەخسی ئەگەڕێنەوە، وازم هێناو کشامەوە!. لەناو ئەو کوردانەی باکووردا، لەگەڵ کاک "میرۆ"دا یەکترمان ناسیی.

کاک میرۆ؛ پیاوێکی باش‌و کورد پەروەر بوو، لەناو ڕێکخستنەکانی "P. K. K" دا کاری ئەکردو لەکۆڕو کۆبوونەوەکاندا وەک نوێنەری ئەوان دەرئەکەوت. لەگەڵ مندا بەینی خۆش بوو. یەکدوو جارێکیش لەماڵی خۆیاندا میوانداری کردووم. لەو سەردەمەدا، بەهێزترین حزبی سیاسی ئەوان بوون. ئەیانتوانی هەزاران

کەس بێننە سەر شەقام و هەزاران کەس لەبۆنەکانی خۆیاندا کۆبکەنەوە. بەپێی ئەزموونی خۆمو دیدارمو دانیشتنم لەگەڵیاندا چ لەسوید و چ لەئەڵەمانیا و زۆر شوێنی تریش، ئەندامەکانی "P. K. K" توندڕەو و داخراو بوون، چیان بوتایە هەر ئەوەبوو. لەسەرەوە چۆن تەلقین بکرانایە، ئەو قسانەیان لەکۆڕو کۆبوونەوەکاندا ئەوتەوە، خەمی گەورەیان ئەوەبوو، چۆن وێنەکانی "عەبدوڵلا ئۆجەلان" بەرزبکەنەوە. لەباتی وێنەیەک، سەد وێنە.

من؛ ئەو دیمانانەم بەدڵ نەبوو. ئەو تاک پەرستییەم بۆ شەخسی "ئاپۆ" بەلاوە ناپەسەند بوو. جاری واهەبوو، لەگۆڤارێکی خۆیانداو لەیەک ژمارەدا، وەک جارێک ژماردم، بیست و پێنج وێنەی ئاپۆیان بڵاوکردبۆوە! ئەمکارانە سەردەمی (ستالین)و پەرستنی ئەویان بیر ئەخستمەوە. ئەگینا وەکی تر، یەکێک لەلایەنە ڕۆشنەکانی "P. K. K" ئەوەبوو هەستی نەتەوایەتیی لەناو کوردی باکووردا زیندووکردەوە. سڕبووبوونو ئەمان بەهۆشیان هێنانەوە، زمانی کوردییان لەناو ئەواندا ژیانەوە، مێژووی خۆیانیان بیرخستنەوە، کتێبخانەی کوردییان دەوڵەمەند کرد .

"P. K. K"لەڕووی داراییەوە حزبێکی دەوڵەمەند و بووە بوو، بۆیە ئەیتوانی پەلبهاوێ و بجووڵێ و جێدەستی دیاربێ. ئەوەبوو لەساڵانی دواتریشدا، یەکەم کەناڵی ئاسمانی تەلەفزیۆنی "مەد"یان دروستکرد. چەندین جار بانگهێشتی منیان کردو هەر لەوێش قەسیدە درێژەکانی ئەو کاتەی خۆم خوێندەوەو بڵاوکرانەوە. ئەو توندڕەویی و داخرانە گەیاندنی بەکۆلانێکی بن بەست .!

بۆ خۆم یەکێک بووم لەئەندامانی کۆنگرەی نەتەوەیی ئەوان، بەڵام دوای گیرانو زیندانی کردنی ئۆجەلان، دوای ئەوەی هەندێ قسەی سەیرو سەمەرەی کردوو ئەتاتورکی کرد بەنموونەو حەفتا ساڵی خەباتی باشووری کوردستانی شەرمەزار کرد! وازملێهێنانو کشامەوەو دەقی ئەو وازهێنانەیشم لەڕۆژنامەکاندا بڵاوکردەوە .

ئەو وەختەی ئۆجەلان گیرا، هەموو دنیا هەستایە سەرپیان، من ئەو کاتە پەخشانە شیعرێکم بۆ نووسیی بەناوی (پرشنگی ڕۆح دەستگیر ناکرێ)، هەر کەسێ بەوردی ئەو پەخشانەم بخوێنێتەوە، تێبینی ئەوە ئەکات، من لەو نووسینەدا، ئەمەوێ بەئۆجەلان بڵێم: (بمرەو، بەڵام سەردامەنەوێنە. بمرەو بەڵام لاواز مەبە). وەک نموونەیش مردنەکانی "شیهاب و ئەنوەرو جەعفەر"م باسکردووە، بەڵام بەداخەوە لەو تاقیکردنەوە سەختەدا سەرنەکەوت !

پێموایە ئەگەر ئۆجەلان، خۆڕاگربوایە، ئەبووە گەورەترین سەرکردەی کورد. گەلی کوردستان هەموو خۆشەویستییەکی خۆی، هەموو ئیرادەی خۆی، بەڕادەیەک دابەو، نەک هەر خۆنیشاندانو مانگرتن، بەڵکوو گەیشتە ئەوەی هەندێ لەڕۆڵەکانی ئەم میللەتە، لەپێناوی ئازادکردنی ئەودا ئاگر لەخۆیان بەربدەن .!

من؛ بۆ خۆم لەناو کوردەکانی باکووردا، ئەو ڕووناکبیرانەم لاپەسەندبوون، کە سەر بەحزبە سۆشیالستەکەی "کەمال بورقای" بوون، ژیرانەو بەشێوەیەکی عەقلانیو واقیعی بیریان ئەکردەوە، کراوە بوونو ڕەخنەیان قبوڵ ئەکردو دەمارگیر نەبوون و ددانیان بەهەڵەی خۆشیاندا ئەنا، بەڵام بەداخەوە لەو سەردەمەدا ئەمان هەڵبژاردەیەکی کەمبوون و سەنگی جەماوەرییان لە چاو "P. K. K"دا کەمترو بچووکتر بوو.!

لەدوای کۆڕەکەی ستۆکهۆڵم، کوردە ئاوارەکان لەڕێگەی ئەو کۆمەڵەو ڕێکخراوانەوە، کە هەیانبوو، یەک لەدوای یەک، بانگهێشتی شارەکانی خۆیان کردم. هەر لەسەرووی سویدەوە تاخوارووی، بلیتی شەمەندەفەریان بۆ ئەبڕیمو لەو شارانەیش لای ناسیاوە نزیکەکانیان ئەمامەوە. لە "ئۆمۆی" و "ڤێستەرۆی" و "لین شۆپیک" و "ئیسکلتۆنە" و "ئۆپسالا"و "یوتۆبوری" و "مالمێ" و چەندین شارۆچکەی تریش، کۆڕی شیعر خوێندنەوەم بەست. یەکێک لەڕێکەوتە خۆشەکان ئەوەبوو، لەو شارو شارۆچکانەدا، چاوم بەکوردی هەموو پارچەکانی کوردستان ئەکەوت. یان لەدوای دەیان ساڵ دابڕان لەپڕێکدا هاوڕێیەکم یان ناسیاوێکم ئەبینییەوە. بەشی زۆری ئەو کۆڕانە بەڤیدیۆ گیراون و هەندێکیان تائێستەیش لای خۆم پارێزراون. من هەستمئەکرد بە گرتنی ئەم کۆڕانە ڕۆحی ئەوان ئەبووژێنمەوەو بیرەوەرییان ئەجووڵێنم و سۆزو تاسەو خۆشەویستیان بۆ وڵات سەرلەنوێ تازە ئەکەمەوە. لەڕێی شیعرەوە ئەیانبەمەوە بۆ لای هەموو ئەو خۆشەویستانەی، ئەو شارو شارۆچکەو شاخ و داخ و شەقام و کۆڵان و گەڕەکانەی، کە بەجێیانهێشتوون .

هەستمئەکرد شیعرەکانم ئاوێنەن بۆ یادەوەرییەکانی هەموویان. دیسانەوە کوردستانم لێ نزیک ئەکردنەوە، پێشمەرگەو شەهید و قوربانییەکانم ئەهێنایەوە پێش چاویان، نەمئەهێشت تەمومژی غەریبیی، ئاسۆی ئایندەیان لێ ونبکات. نەمئەهێشت منداڵەکانیان ناوی نیشتمانەکەی خۆیان بیربچێتەوە. ناوی باپیرە جوامێرەکانیان لەیادبکەن و خۆیان بەبێ مێژوو بێرەگو ڕیشە بزانن .

لەرێی ئەو شیعرانەوە، بەردەوام زەنگی هوشیاربوونەوەم بۆ لێئەدان. ئەمویست بەو شیعرانە، خەونیان بۆ دروستبکەم، پرسیاریان لابوروژێنم، ئەو ڕەنگە تازانەیان نیشانبدەم کەنەیاندیون. ئەو دەنگانەیان بدەمەوە بەگوێدا، کەدوورە ولاتی کپی کردوون، چیرۆکی ئەو خۆشەویستییانەیان بۆ بگێرمەوە، کە لەکەلتووری کورددا بەردەوام ئەبریسکێنەوەو بەلام ئێستە ئەوان نایانبیستن. شیعرەکان لەدڵەوە بوون بۆ دڵ. بۆیە هەمیشە چاویانم پڕ ئەکرد لەو ئاوەی سەرچاوەکانی لەکەرکوک و ئامەد و مەهاباد و قامیشلییەوە هەڵئەقوڵێن .

من؛ ئەو شیعرانەم بەکڵپەی دەروونم نووسیبوو، بۆیە وەختێ ئەگەیشتنە لای ئەوانیش لەگەڵیانا هەڵئەقرچان. لەگەڵیاندا ئەگریان‌و لەگەڵیاندا ڕائەچڵەکین. شیعرەکان قسەی ناو دڵی ئەوان بوون و من کردبوومن بەشیعر. بۆیە وەختێ گوێیان لێئەبوو، لەجێی خۆیانەوە، ئەبوون بەتاقگەی ئەوین و ئەرژانە ناو ڕۆحی یەکترەوە، سەربەرەو خوار ئەبوونەوە بەرەو نیشتمان. من لەو کۆڕانەدا، ئاگری ئاگردانە خامۆشەکانم دائەگیرسانەوە، بۆ ئەوەی ژوورەکانی ناو بیرەوەری ساردنەبنەوە .

من؛ بەوشە وێنەم بۆ دروست ئەکردن و لەناو ئەو جۆگەلانەدا دەم و چاوی نێرگز و نەورۆزو مەم وزین و خەج و سیامەندم نیشان ئەدانەوە. من ئەوەندە شیعرم بۆ ئەخوێندنەوە ئەو شەوەی دوای کۆڕەکانم هەر هەموویان خەویان بەقاسپەقاسپی کەوەکان‌و بەجریوە جریوی چۆلەکەکان‌و بەگمەگمی ئەو کۆترانەوە ئەبینی، کە لەقەفەزەی سنگ و هێلانەی سەری ولاتدا بوون .

من؛ هەرگیز ئەو هەموو ماچ و تەوقەو باوەش پێداکردنانەم لەبیرناچێتەوە کە لەدوای هەر کۆڕێک، ئاپۆرەی گەنجان و شیعر دۆستان‌و خەڵکی ولاتەکەم بۆ منیان ئەکرد بەدیاری‌و پێشکەشیان ئەکردم. هەرگیز سۆزو خۆشەویستی ئەو دایک و باوکانەم لەبیرناچێتەوە، کە لەدوای هەر کۆڕێک ئەبوونە دایک و باوکی خۆم، ئەو فرمێسکانەم بیرناچێتەوە، کە شیعرەکانم لەچاوو گلێنەی ئەواندا دڵۆپ دڵۆپ ئەیرشتن‌و بەگۆنایاندا هۆن هۆن ئەهاتنە خوارەوە. ئەو چەپکە گولانەم

بیرناچێتەوە، کەئەیاندایە دەستم و ئەو نمەکانەم بیرناچێتەوە، کە لەماڵەکانیاندا کردوومن و بوون بەوەفاو کاڵ نابنەوە .

من؛ شاعیرێکم بەخۆشەویستی ئەو خەڵکەوە ماوم. خودی خۆمم و لەهەمانکاتا ئەوانیش. شیعر لای من ڕێگەیەو ئامانجیش. هونەرەو پەیامیش. من؛ لەسەردەمی خۆمدا هەر شاعیرێکی سەیرکەر نەبووم، بۆ خۆیشم لەناو ئاگرەکان و کارەساتەکان و ئازارەکاندا بووم. هەڵەم کردووە، خەوشم هەبووە. کەوتووم و هەستاومەتەوە!. ترساوم و وێراومەو خامۆش بوومو ڕاپەڕیومەتەوە! من؛ مرۆڤ بووم، نەفریشتە بووم و نەبێ گوناه .!

ئەو شوێنانەم نەدۆزییەوە،
کە شەوانە نانوون!

لەژوورەکەی ناوچەی "لاپیس"دا دەیان شیعرم نووسیی و بەشی زۆریان هەر دریژەپیدانی ئەزموونی کوردستان بوون .

ئەوەی ڕاستی بێ، من هەر بەجەستە لەسوید بووم! ئەگینا بەڕۆحو خەیاڵ و خولیا هەر لەوڵات بووم. ئەو سەردەمە بریتی بووم لەگۆمێک و بەردەوام پەنگم ئەخواردەوە، پەنگ خواردنەوەی غوربەت، ئەوکاتەی بەبێدەنگیی نوقمی خۆیت ئەکات. هەر لە ژوورەوە بووم، چوونە دەرەوەم کەمببۆوە، چونکە دووبارەو سەدبارە هەر چاوم ئەکەوتەوە بەو شەقامو بازاڕو چایخانەو سوپەرمارکێت و دوکانانەی، کە دیبوومنو تەنانەت ئەزبەریشم کردبوون. من؛ ئەو کاتە لەتەمەنێکدا بووم (٤٧) ساڵ، کە ئیتر تەمەنی دیسکۆو شەوانە ڕۆژکردنەوەو کچ گرتن و سەرەڕۆیی نەبوو. بۆ گەنجێک، کە لە تەمەنی بیستەکاندا بێو بۆی بلوێ ئەتوانێ لەو وڵاتانەدا کاتی خۆی ڕەنگین بکات. ئەتوانێ لەناو شارێکی نووستوودا، ئەو یانەو شوێنانە بدۆزێتەوە، کە هەرگیز نانوون. من لە ئێوارەوە ئەهاتمەوە ژوورەکەم ئیتر یا ئەم خوێندەوە یان ئەمنووسی، یان گوێم لەموزیکو گۆرانیی ئەگرت .

زستانی سوید، درێژەو دنیا تاریکو بەستەڵەک و سەرمای دەرەوە بێ ئامان و جاری وا هەیە کەشی ستۆکهۆڵم بیست پلە لەژێر سفرەوەیە، لەبەرئەوە هەر

ئەبێ بخزێیتە کونی ژوورەوە، بەڵام لەژوورەوەو لەهەموو شوێنێکدا، پلەی گەرما ئاساییەو هەست بەبوونی سەرما ناکەیت. بیرمە؛ لەزستانی (١٩٨٨)دا، ئێوارەیەک ئەگەڕامەوە بۆ ژوورەکەم، لەدەرگای تونێل بان هاتمە دەرەوە، نێوان ژوورەکەم و تونێل بان بەپێ دە دەقیقە نەئەبوو، جلی باشیشم لەبەردابوو. بەڵام سەرمایەک بوو بێ وێنە. دەم و چاوم هەر بەتەواوی بەستبووی، وەختێ گەیشتمە بەر دەرگای ژوورەکەم لەپەلوپۆ کەوتبووم، نەمتوانی بیکەمەوەو هەر لەبەردەرگاکەدا کەوتم! یەعنی ئەگەر چەند دەقیقەیەک دوورتر بوومایە هەڵنەئەسامەوە .!

ڕۆژێکیان پەرداخێ ئاوم لەپەنجەرەکەوە بردە دەرەوەو هەرچەند چرکەیەکو گێڕامەوەو ئاوی پەرداخەکە بەستبووی! کەچی لەوڵاتێکی وادا سویدییەکان توانیویانە شارستانییەتێکی بێوێنە دروستبکەنو بگەنە ئەو ئاستەی لەبواری گەلێ پیشەسازی نوێدا کێبڕکێی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکەن! تەمەنی هەندێ زانکۆیان لەسەدو پەنجا ساڵ تێپەڕیوە. ژمارەی دانیشتوانی سوید نزیکەی نۆ ملیۆنە، ڕەنگە لەئێستادا نزیکەی یەک ملیۆن پەناهێندە لەو وڵاتەدا هەبێ، بەشی هەرە زۆری ئەم پەناهێندانە هەموو پێداویستییەکی ژیانیان بۆ دابینکراوەو لەخانووی مۆدێرنەوە تائەگاتە سەر یارمەتی مانگانەی سۆسیال .

سوید؛ وڵاتێکی پەرلەمانی دیموکراتییە. هەر سێ ساڵ جارێ خەڵکەکەی لەڕێی هەڵبژاردنێکی ئازادەوە نوێنەرانی خۆیان هەڵئەبژێرن. یەکسانیو بەرامبەری ژن و پیاو لەهەموو بوارەکانی ژیانی سیاسیو کۆمەڵایەتیدا دابینکراوە. هەڵبەت ئەم ڕژێمەیش بێ خەوش نییە! بەڵام لەدنیای ئەمڕۆداو لە هەموو جیهاندا، من پێموایە، وڵاتە ئەسکەندەنافییەکان بەرزترین ڕێژەی ژیانێکی بەختیارو ئازادو پێشکەوتوویان بۆ هاوڵاتیانی خۆیان ڕەخساندووە.

ڕاستە ناوەندی ڕوناکبیری و ئەدەبی سوید بە بەراورد لەگەڵ ئینگلتەرەو فەرەنسا و ئەڵەمانیادا بەخشین و داهێنانی کەمتر و لاوەکی ترە، بەڵام کتێبخانەی سویدی باوەشی بەهەموو دنیادا کردووەو کتێبێ نییە نرخ و بەهایەکی هەبێ و جا لە هەر بوارێکدا بێ و بۆ زمانی سویدی وەرنەگێڕدرابێ. تاچلەکان زمانی دووەم لەسویددا ئەڵەمانی بووە، بەڵام لەوە بەدوا زمانی دووەم بووە بەئینگلیزی، مەگەر تاک و تەرا، ئەگینا بەشی هەرە زۆری سویدییەکان ئەتوانن بەباشی بەو زمانە بپەیڤنو بشنووسن. من بۆ خۆم لەبەرئەوەی زمانی سویدیی باش فێرنەبووم، هەڵبەت زانیارییەکانیشم دەربارەی ژیانی ڕۆشنبیری

و ئەدەبی و مەعریفی ئەو وڵاتە زۆر نییە. مافی ئەدیب و نووسەر لەم وڵاتەدا تەواو پارێزراوە .

ساڵ و نیویک بوو لەوێ بووم. ڕۆژێک لەگەڵ پۆستدا، چەکێکی هەزار "کورۆن"یم بۆ هاتە ماڵەوە، چەکەکە لەڕۆژنامەیەکی سویدییەوە هاتبوو. پێم سەیربوو!. چونکە من ناتوانم بەسویدی هیچ بنووسم، هیچیشم نەناردووە تا لەبری پاداشت بکرێم. بۆیە وتم "هەبێ و نەبێ ئەمە بەهەڵە بۆ من هاتووە". چوومە لای هاوڕێکانم و مەسەلەکەم تێگەیاندن. ئەوانیش بەتەلەفۆن پەیوەندییان بەڕۆژنامەکەوە کرد، کە ئەم پارەیە بەهەڵە بۆ من هاتووە! بەڵام لەوەڵامدا ئەوان وتیان: (نا هەر بۆئەوە. ڕاستە ئەو هیچی بۆ ئێمە نەناردووە، بەڵام لە فلان ژمارەدا، یەکێک وتارێکی نوسیووەو لەوتارەکەدا پارچە شیعرێکی ئەمی بەنموونە هێناوەتەوە. ئەوە هەقی ئەوەیە!) .

لەدڵی خۆمدا وتم (نەک ئێمە بەڵکو هەموو ڕۆژهەڵات دوای سەدەیەکی تریش، ئەگەنە ئەم ئاستی بەسەرکردنەوەو قانونی هەق پارێزییەی نووسەر؟! بڕواناکەم!)

یەکەم سەفەری شیعریم، بۆ دەرەوەی سوید، لەسەر بانگهێشتی نووسەرانی نەرویج بوو بۆ بەشداریکردن لە فێستیڤاڵی "ڕۆژی کتێب"دا لەئۆسلۆی پایتەخت .

"ڕۆژی کتێب" یەکێکە لە بۆنەو جەژنە ڕووناکبیرییەکانی ئەو وڵاتە، ئەو ساڵە نزیکەی سەد ئەدیبی بەناوبانگی جیهان بانگکرابوون. پێمخۆش بوو بەشەمەندۆفێر بچم، لەوێستگەکە، کۆمەڵێ لەکوردە ئاوارەکان هاتبوون بەپیرمەوە. ئەوە یەکەمجارم بوو "ئۆسلۆ" ببینم، شێوەو ڕەنگ و ڕووی ئەمشارە، شەقام و بازاڕو، ئەپارتمانەکانی هەرتەواو لە ستۆکهۆڵم ئەچوون. زمانی سویدی و نەرویجی جمکن و جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە. فێستیڤاڵەکە ماوەی چەند ڕۆژێکی بۆ تەرخانکرابوو. من لە پێشدا کاک "هەڵکەوت" و ئەو برادەرە نزیکانەم بینی و میوانداریبیانکردم و ئۆسلۆیان نیشاندام و لەگەڵما ماندووبوون .

ئەم فێستیڤاڵە هەر بۆ شیعر نەبوو. بەڵکوو لەیەککاتداو لەچەند هۆڵدا گەلێ چالاکی ئەدەبیو شانۆیی پێشکەش ئەکراو هەر هۆڵێکیش گوێگری خۆی هەبوو. بۆ نموونە ئەوەی حەزی بەگوێگرتنی شیعر بکردایە ڕووی ئەکردە ئەو هۆڵەی بۆ خوێندنەوەی شیعر تەرخانکرابوو. بەوجۆرە چیرۆکو لێکۆڵینەوەو

شانۆنامەیش هۆڵی خۆیان هەبوو. من لەگەڵ گروپێکدا دانرابووم کە حەوت هەشت شاعیری وڵاتە جیاجیاکانی دنیابوون. بەناوبانگترین شاعیری نەرویجی لەگەڵ ئێمەدا شیعری خوێندەوە. بەداخەوە ناویم لەبیرچۆتەوە. یەکەمجاریش بوو ببینم شاعیرێ هەر خۆی لەیەککاتدا گیتاریش بژەنێ و شیعرەکەیشی بخوێنێتەوە .

شانۆو هۆڵەکە جوان و لەسەر تەرزێکی تازە دروستکرابوون. خەتێکی سوور کەدرێژییەکەی دوومەترو پانییەکەی پێنج شەش سانتیم ئەبوو، لەسەر شانۆکە کێشرابوو. مایکرۆفۆنەکەیش مەترو نیو لێوەی دووربوو. ئەبوو ئەو کەسەی ئەچێتە سەر شانۆ بۆ خوێندنەوە لەسەر خەتە سوورەکە ڕاوەستێ و تێنەپەڕێ. ماکیرۆفۆنەکە ئەوەندە هەستیار بوو هەناسەیشی وەرئەگرت. هەر شاعیرەو بۆی هەبوو تا دە دەقیقە بخوێنێتەوە. من؛ دە کورتە شیعرم ئامادەکردبوو. وەرگێڕدرابوونە سەر زمانی "نەرویج"یش. خۆیشیان یەکێکیان تەرخانکردبوو بۆ ئەوەی من بەکوردی ئەو بەنەرویجی شیعرەکانم لەگەڵدا بخوێنێتەوە. پێموایە من سێیەم شاعیر بووم، کە نۆرەی خوێندنەوەم هات. بەمەزەندەی خۆم نزیکەی چوار سەد کەسێ دانیشتبوون کە دیارە زۆربەی هەرە زۆریان نەرویجی بوون. خوێندنەوەکەم باش بوو، بەڵام ئیلقای ئەو کەسەم بەدڵ نەبوو کە لەگەڵمدا بەنەرویجی خوێندییەوە. دوایئەوەی کۆڕەکە کۆتایی هات و چووینە دەرەوە. سەیرمکرد نزیکەی پانزە بیست نەرویجییەک ژن و پیاو چاوەڕوانم ئەکەن بۆ ئەوەی ئیمزای خۆمیان بۆ یادگار بۆ بکەم و لای خۆیان هەڵیبگرن .

ئەم پێشوازییەم پێخۆش بوو، دواتریش چەند ڕۆژنامەیەکی نەرویجی و هەروەها ڕادیۆی ئۆسلۆ دیداریان لەگەڵدا کردم و، ئێوارە لەڕادیۆوە چاوپێکەوتنەکە پەخشکراو، بۆ سبەینێش ڕۆژنامەکان دیدارەکانیان بڵاوکردەوە. هەر لەڕۆژانی ئەم فیستیڤاڵەدا، بەدەیان شاعیرو ئەدیبی نەرویجی و وڵاتانی ترم ناسیی. لەساڵانی دواتریشدا چەند جاری تر چوومەتەوە بۆ ئۆسلۆو شارەکانی تری نەرویج و کۆڕی شیعر خوێندنەوەم، بۆ کوردە ئاوارەکانی ئەو وڵاتە گرتووە، کۆمەڵەو ڕێکخراوەکانیان ئەرکی سەفەریان کێشاوم و چەپکە گوڵیان بۆ هێناوم و بانگهێشتی ماڵەکانیان کردووم و نمەکم کردوون و بەتەنگمەوەبوون. ئەمە نەک هەر لەنەرویج، بەڵکو لە هەموو ئەو وڵاتانەدا، کە لەئەوروپا ڕوومتێکردووون.

تەنیایی پیا-ی وشک کردبۆوە؛
کتێبەکانی منیش کەلاوەیەک!..

لەکۆتایی (١٩٨٧)و سەرەتای (١٩٨٨)دا، هەواڵێکی ناخۆشم پێگەیشت، "خەسرەو ئەحمەد میرزا"ی ژن برامو زاوام، مێردی "گەزیزە"ی خوشکم، لەهاوینی (١٩٨٧)داو لەسلەیمانی لەلایەن ئاسایشی بەعسەوە دەستگیر ئەکرێ. دوایئەوەی لەلایەن هاوڕێیەکی خۆیەوە ئیعترافی لەسەر ئەکرێ .

خەسرەو؛ مامۆستاو بەڕێوەبەری قوتابخانەیەکی سەرەتایی بوو، لەتەمەنی هەرزەکارییەوە، تێکەڵ بەکاروباری سیاسی بووە. لەدوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلولیشەوە، لەنێو ڕیزە نهێنیەکانی چالاکی شاردا دەستبەکاربووە، بەتایبەتی لەکەرتی مامۆستایاندا.

خەسرەو؛ پیاوێکی کورد پەروەرو بێ غەل وغەش بوو، یەکێک لە ئارەزووەکانی ئەوەبوو بەخەتە خۆشەکەی خۆی ئەو شیعرو وتارو پەخشانانە بنوسێتەوە، کە خۆی حەزی لێئەکردن. وەک خۆی دواتر بۆیگێڕامەوە، هەر لەئاسایشی سلەیمانی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا ئەکەنو دوای ئەوەی ناچێتە ژێر هیچ دانپیانانێک کە جەللادەکان داوای لێئەکەن، ئەخرێتە ژێر ئەشکەنجەو ئازارێکی سەختەوە. ئەو ئەشکەنجانەی مەگەر هەر تەنها لەلای دام و دەزگا ئەمنییەکانی بەعس هەبن. ماوەیەک لەزینداندا لەگەڵ تێکۆشەری ناسراو کاک "حسە ڕەشی خەیات"دا ئەبێت. زیاد لە چواردەجارو بۆ چەندین سەعات هەڵیئەواسن .

خەسرەو ئەیگێڕایەوە و ئەیوت: (هەموو جارێ کە هەڵیانئەواسیم و ئەشکەنجەیان ئەدام، تۆو کاک "نەوشیروان مستەفا"م ئەهاتە پێش چاوو ورەم بەرزئەبۆوە!). هەروەها ئەیوت: (جارێکیان بردمیان بۆ ژووری بەڕێوەبەری ئاسایش و لێکۆڵینەوەیەکی وردیان لەسەر تۆ لەگەڵدا کردم. لەکوێ ئەژی؟! لەوێ چی ئەکات؟! حەز لە چی ئەکات؟! سروشتی چۆنە؟! چەند منداڵی هەیە؟!). هەروەها وتی: (تۆ چی ئەڵێی، ئێمە بۆت ئەکەین، ئازادت ئەکەین و باشترین خانوو وەزیفەت ئەدەینێ، بۆ سەفەری سویدیش پەساپۆرت و ڤیزەت بۆ ئەکەین و بلیتی فرۆکەیشت بۆ ئەبڕین، هەر بەو مەرجەی شوێنی ئەومان لەسوید نیشانبدەیتو تۆ ئیتر هەقت بەسەر هیچەوە نەبێت)!. ئەویش پێیوتبوون: (ئێوە دەوڵەتن و خۆتان ئەتوانن لەهەر شوێنێ بێت بیدۆزنەوە) ..

خەسرەو خۆڕاگرو ئازابووبوو، دوای ئەو هەموو ئەشکەنجەو ئازارە، نوختەیەکی بچووکی لەسەر خۆی نەکردبوو بەماڵ. لەپاش چەند مانگێ، ئێوارەیەک چاوی ئەبەستنەوەو سواری ئۆتۆمبێلێکی ئەکەن و ئەیبەنە دەرەوەو لەشوێنێکی چۆڵدا بەرەڵڵای ئەکەن .

گەزیزەی خوشکم؛ گێڕایەوەو وتی: (کاتێ خۆیکرد بەماڵداو هاتە ژوورەوە، چیمان بینی. خەسرەو نیوەی مابۆوە. ڕیشێکی درێژو دەمو چاوێکی تێکقوپاوو. دەستێکی کەلەلا، ئێسقانەکانی مەچەکی بەدەرەوە بوون). زمناکۆی کوڕیان کە ئەو کاتە منداڵ بووە، باوکی ناناسێتەوەو ئەزریکێنێ و لەهۆش خۆی ئەچێ!. ئێستا خەسرەو لە ئەنجامی ئەو ئەشکەنجە و ئازارانەوە دەستێکی لەدەستەکەی تری کورتترەو گێڕە .

دیارە من بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵە کتێبخانەیەکی باشم پێکەوە نابوو، کوردی و عەرەبی. سەدان کتێب ئەبوون، بیرمە وەختێ لەسەرەتای ساڵی (١٩٨٤)دا لە"ئیسکان"ەوە گوێزامانەوە بۆ خانوویەکی تر لەگەڕەکی "مامۆستایان"، کردمانئە فەردەوەو ژمارەیان هەژدە فەردە بوو!. ئەو وەختەی نەسرین و منداڵەکان سلەیمانی بەجێئەهێڵن، کتێبخانەکە ئەگوێزنەوە بۆ ماڵی گەزیزەو لەوێ دایئەنێن. گەزیزە بۆیگێڕامەوەو وتی: (دوایئەوەی خەسرەویان گرت. کتێبخانەکەت بۆ من ببوو بە گیروگرفت، چونکە وتبوویان "ئاسایش دێت بۆ ماڵەوەو دەست ئەکات بەپشکنین و گەڕان بەدوای هەر شتێکدا کە خۆیان مەبەستیانە". ئەوەی ڕاستیبێ منیش زۆر ترسام. لەپێشدا چووم بۆلای چەند ماڵە خزم و ناسیاوێک و داوای ئەوەم لێکردن ئەو کتێبانە بگرنە خۆیان، بەڵام کەسیان قبوڵیان نەکرد!. منیش

ناچار، هەمووجارێ، کە تاریکی ئەکرد. بەباوەش و بەگونییە، ئەمبردن بۆ کەلاوەیەکی نزیکماڵەوەو لەوێ فڕێم ئەدان تاتەواوبوون!) .

ئەوەی ڕاستیبێ ئەم هەواڵەم بەقەد هەواڵی گرتنەکەی خەسرەو لەبەردڵ گران و ناخۆش بوو، بەڵام سەبارەت بە بارودۆخێکی وا ترسناک، کەئەوانی تێکەوتوون چی ئەڵێی!. من؛ کتێبەکانم بەشی هەرە زۆریان کتێبی ئەدەبی و ڕووناکبیری بوون. کورتە چیرۆک و دیوانە شیعرو ڕۆمان و لێکۆڵینەوەو شانۆنامە و توێژینەوەی کۆمەلایەتی و سایکۆلۆجی بوون.. هەموو کتێبە سیاسییەکانم نەئەگەیشتنە بیست کتێب. هەڵبەتە لەو بارودۆخە دژوارانەی ئەوسای کوردستانداو لەژێر سایەی ڕژێمی بەعسدا، نەک هەر من بەدەیان نووسەرو ئەدیبی ئەم وڵاتە کتێبخانەکانیان تیاچوون و لەوە زیاتریش ڕەنگە بەدەیان دەستنووسی بەنرخ و بەڵگەنامەی دەگمەن فەوتابێ‌و سووتابێ‌و لەناوچووبن.

لەساڵێکدا دووسێ جارێ نامەی "بێگەرد"ی هاوڕێم پێئەگەیشت، ئەو نامانەو لەسلەیمانییەوە بۆ من تام و چێژێکی تایبەتیان هەبوو .

بێگەرد؛ بەئاماژەی ناڕاستەوخۆ هەموو هەواڵەکانی پێئەگەیاندم، جارێکیان نووسیبووی "کاک ئاسایش زۆر هەواڵت ئەپرسێ، ئێجگار پەرۆشە بۆ بینینت‌و لەو بەینەیشدا گەزیزەی خوشکتی دیبوو، بەویشدا سەلامی زۆری بۆ ناردبووی" ئیتر دیاربوو، کە ئەمنی سلەیمانی لەسۆراخمدایەو کە گەزیزەی خوشکمیان دیوەو پرسیاری منیان لێکردووە !

لەساڵی (١٩٨٧)داو هەر لەستۆکهۆڵم، کۆنگرەی ساڵانەی یەکێتی نووسەرانی سوید بەستراو منیشیان بانگهێشتکرد. دیارە پێشتر داوای بوون بەئەندامم کردبوو، وەریانگرتبووم. بوون بەئەندام لەو یەکێتییەدا، گران نییە، ئەنکێتی تایبەتی پڕ ئەکەیتەوەو ناونیشانی چاپکراوەکانت و دوو ئەندامیان پەسەندت ئەکەن و ئابوونەی ساڵانە ئەدەیت و وەرئەگیرێیت، بەڵام جیاوازییەکە لەوێ ئەوەیە هەیە نووسەرەو بەڵام هێشتا خۆی بەشایستەی ئەوە نازانێ ببێ بەئەندام و ئەڵێت "جارێ ماومە بۆ ئەوەی ببم بە ئەندامی یەکێتی نووسەران ."!

کاک عومەر شێخ موس؛ لەگەڵمدا هات و چووین بۆ کۆنگرەکە، نزیکەی هەشتا ئەندامێ ئامادەببوون. دە دوانزە مێزی بازنەیی گەورەو بەدەوریاندا کورسی دانرابوون. کۆنگرەکە دەستیپێکردو سەرۆکی یەکێتی وتەیەکی کورتی خوێندەوەو، دوای ئەو ڕاپۆرتی دارایی خوێندرایەوەو، ئینجا دوو ئەندام هەستان

دەستیانکرد بە قسەکردن، یەکێکیان وەک ڕەخنەگر کەموکوڕی و ناتەواوییەکانی نووسەرانی باسکردو ئەویتریشیان بەرگریی لەچالاکی و کارەکانی یەکێتی نووسەران کرد. لەکۆتایشدا، چەند ناوێکیان بۆ سەرۆکی یەکێتی پالاوت. ئەندامان هەر لەجێگەی خۆیانەوە بە بەلێ و نا وەلامیان ئەدایەوە، تاگەیشتە ئەو کەسەی کەزۆربەی زۆر بەدەنگی بەرز پەسەندیانکردو کۆنگرە تەواوبوو .

ئەوەی ڕاستیبێ من کۆنگرەکانی خۆمانم بیرئەکەوتەوە! کە چۆن جاری واهەبوو لەسەر خالێکی بچووک چەند سەعاتێ بەیەکدا ئەهاتینو ئەبوو بەقرەقرو گێرمەوکێشەو نەیشئەگەشتینە هیچ ئەنجامێک .

یەکێتی نووسەرانی سوید؛ مانگانە گۆڤارێکیان هەیە کە بەناوی "نووسەر"ەوە دەرئەچێت. کاری بنەڕەتی ئەوان بەتەنها خزمەتکردنی نووسەرانە، ئەگینا چالاکی ئەدەبیو کۆڕ بەستنیان کەمە. هەموو سالێ دووجار ئەنکێتی تایبەتیت بۆ ئەنێرن بۆ بەخشینی پاداشت. پاداشتیان هەیە بۆ یەک سال، دوو سال و پێنج سال و خانەنیشینیش. ئەم پاداشتانە لەسەر بنەمای بەردەوامبوونی بەرهەمی ئەو نووسەرە یان ئەو شاعیرە وەستاوە. بۆ نموونە هیچ جیاوازییەک نییە لەنێوان نووسەری سویدی و نووسەرێکی کورد، یان عەرەب و یان یۆگۆسلاڤی-دا. هەموو جارێکیش داوای دوابەرهەمی چاپکراوت لێئەکەن. من لەبەرئەوەی بەڕێکوپێکیو بێ دواکەوتن هەموو سالێ ئابوونەی خۆمداوە. هەموو سالێک بەرهەمی چاپکراوم هەبووە. لەبەرئەوە چەندینجار ئەو پاداشتانەم وەرگرتووە. واتە بۆ یەک سال و هەروەها بۆ دوو سال و بۆ پێنج سالیش وەرمگرتووە. ئەمە جگە لەوەی، دوو جاریش پاداشتی سەفەرم وەرگرتووە. لەبەرئەوەی من بەدرێژایی ئەو سالانەو لە سویددا کاری ترم نەکردبوو. ئەو پاداشتانە بەشێکی باشی بژێوی ژیانیان دابینئەکردم .

"پیا" ژنە ڕۆژنامەنووسێک بوو لەڕۆژنامەی "ئێکسپرێس" کاری ئەکرد، هەموو هەفتەیەک کتێبێکی دوای خوێندنەوە، هەلئەسەنگاند، تەمەنی لەسەرو پەنجاکانەوە بوو. یەکەمجار لەڕێی چاوپێکەوتنێکەوە یەکترمان ناسی، ژنێکی هێمن و لەسەرخۆ بوو. ناو بەناو یەکتریمان ئەبینی. کەقسەی لەگەلدا ئەکردم بەهێواشی ئەدوا، بۆ ئەوەی تێبگەم. لەقاتی سەرەوەی یەکێک لەخانوە کۆنەکانی کۆنە شار "گەملاستان"دا ئەژیا، تەنها هەر خۆی و پشیلەیەک بوون. تەنیایی وشکی کردبۆوە، کتێبخانەیەکی دەولەمەندی هەبوو. بەهاوینان گەشتی دنیای ئەکرد. یەکێک بوو لەدۆستە نزیکەکانی مەسەلەی کورد. هەرچییەک لەسەر

کورد بنووسرایە، ئەیخستە لاوەو کە منی ئەبینی نیشانی ئەدام. بەشی زۆری هاوڕێکانی بیانی و خەڵکی ئەفریقاو ئەمریکای لاتینی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوون. بەهۆی بینینی ئەم ژنەوە زمانە سویدییەکەم ئاهێکی باشی تێکەڕابوو. جگە لەخوێندنەوەو نووسین، شەیدای مۆسیقایش بوو. بەردەوام گوێی لەسەمفۆنیا جیهانییەکان ئەگرت، لەدوایئەوەی گەڕامەوە بۆ کوردستان، ئاگام لەدەنگوباسی نەما. لەو دووسێ ساڵەی دواییدا قەسیدەیەکم بەناوی (پیا)وە نووسی و دواتر لەدیوانی "خۆم ئەو وەختەی باڵندەم"دا بڵاومکردەوە.

ماڵی ئاکتەر-ەکەیاندا بە ئێمە؛
ژنە سۆماڵییەکەش لەپۆلیسێکیدا!..

لەدوای یانزە مانگ چاوەڕوانی؛ نەسرین و دایکم و منداڵەکان گەیشتنە ستۆکهۆڵم، (١٩٨٦/٦/٢٤) دواجار بوو، کە لە بەرگەڵوو دیبوومن، بەڵام لە (١٩٨٤)ەوە دایکم نەدیبوو. بەدیدار شادبوونەوەیەکی خۆش بوو. هەڵبەست و هەڵۆ گەورە ببوون. هێژا کەمێ گۆڕابوو، بەڵام هانا هێشتا نەببوو بە دەساڵ .

دایکم؛ بەساڵاچووبوو، بەڵام تەندروستی باشبوو. نەسرین هەروەکوو خۆی وابوو. ئیتر تاچەند ڕۆژ، باس هەرباسی ئەوەبوو، کە ئەو ساڵانەی دوایی لەسلەیمانی چ دەردەسەریەکییان دیووە! چۆن هەر هەفتەیە لەماڵێک و ئەم شارو ئەوشاریان کردووە. لەترسی ئەوەی بەردەستی جەللادەکانی بەعس نەکەون. باسی ئەو پیاوچاک و ناسیاو و دۆستە باشانەیان ئەکرد کە یارمەتییانداون و داڵدەیان داون و بەتەنگیانەوە بوون. بەتایبەتی ماڵی کاک "ساڵح دزەیی" و کاک "عومەر عەبدوڵلا"ی هاوڕێم ئەو وەختەی لەسلەیمانی دەریکردوون .

دایکم؛ بەزمانە شیرین و قسە خۆشەکانی خۆی باسی کاک "شێرکۆی شێخ نوری" کرد، کە لەو شاخ و داخانە چەند دڵسۆزبووە بۆیان و لەزۆر شوێنیشدا کە ولاخ لێی دەرنەچووە، چۆن ئەمی کردۆتە کۆڵ و فریایکەوتووە. باسی ماڵەکەی "خەسار"یان و دەرودراوسێیان لە ئێران. منداڵەکان بەهۆی منداڵی گەڕەکەوە فێری فارسی ببوون. ئەو وەختە هێشتا بەلێشاو پەناهێندەکان

ڕوویاننەکردبووە سوید، بۆیە میوانداریشیان هێشتا هەر گەرم و گوڕو دەرگایان والاتر بوو .

یەکەمجار هەموومانیان بردە ئوتێلێکی گەورەو خۆش و پاک و خاوێن لەباشووری ستۆکهۆڵم. هەر یەکەو ژووری خۆی، نزیکەی بیست ڕۆژ زیاتر لەم ئوتێلەدا ماینەوە، لەدواییدا بۆ هاوینماڵێکیان لە یەکێ لە شەقامە گەورەکانی ستۆکهۆڵم بۆ بەکرێگرتین. خاوەن ماڵەکە یەکێک بوو لەئەکتەرە دیارەکانی سوید، خۆی و ژنەکەی و دوو منداڵیان هەبوو. ئەوان؛ هاوینە بۆ ماوەی چەند مانگێ ئەچوون بۆ وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا، سۆسیال بەهەموو کەلوپەل و شت و مەکییەوە خانووەکەی بۆ ئێمە بەکرێگرتبوو. ئیتر ئێمە چووینە سەرماڵی حازر. لەدوای دابڕانێکی زۆر دووروودرێژ، "کاوە"ی برام لەئەمریکاوە هات بۆلامان، هەروەها دوای ئەویش "کامەران"ی برام .

هەر لەو ماڵەدابووین، شەوێکیان بانگهێشتی کاک "ناسری ڕەزازی و مەرزیە"خانی هاوسەریمان کرد، شەوێکی ڕەنگین و خۆش بوو. ئەوکاتە هێشتا مەرزیەخان لەناو خەڵکیدا دەرنەکەوتبوو. گۆرانیی تۆمارنەکردبوو، ئاهەنگ و کۆنسێرتی نەگێڕابوو، لەسەر داوای دایکمو لەکۆڕی ئەو شەوەدا، ئەویش چەند گۆرانییەکی بەسۆزی بۆ وتین.

لەبەر پۆست و نامە، ناوبەناو سەری ژوورەکەی خۆم ئەدا لە "لاپیس"و بۆیەکەمجاریش، نەسرین و منداڵەکان هاتن و ژوورەکەیان بینیم و هەموویشمان شەوێ بەیەکەوە لەژوورەکەدا ماینەوە .

من؛ بەنیاز بووم وەختێ واز لەژوورەکەم بهێنم، چووبێتینە خانووی خۆمانەوە، بەڵام ئەمە درێژەی کێشا. دوایئەوەی چەند مانگێ لەماڵی ئەکتەرەکەدا بووین،و پاش گەڕانەوەیان بۆ سوید، ئەوسا ئیتر ئێمەیان بردە مۆتێلێک لەسەر شەقامی "کونگ گاتان"، واتە سەنتەری شاری ستۆکهۆڵم، گرانترین شوێنی شار، سۆسیال مانگی چل هەزار کرۆنی بۆ ئەدایێن بەکرێ! خاوەنی ئەم مۆتێلە ژنێک بوو ناوی "ئەلیزابیس" بوو، لەم مۆتێلەیشدا چەند مانگێ ماینەوە، تاشوقەیەکیان لەگەڕەکی "ڕینکەبی" داینێ.

وەک سویدییەکان ئەڵێن "لەگن هێتە" کەمان گەورەو فراوان بوو، سەروو زیادمان بوو. لەنهۆمی دووەمدا بووین، ئەم گەڕەکە ببوو بەگەڕەکی پەناهێندەکان "کوردو عەرەب و سۆماڵی و ئەریتری و ئاسوری" و لەهەموو

ڕەگەزو قەومێکی تێدا بوو. بەشی هەرە کەم سویدی بوون و لەساڵانی دواتردا ئەو کەمە سویدییەیش لەڕینکەبی نەمان و کۆچیانکرد !.

لەم گەڕەکەدا ئاژاوەگێڕی و سەرپێچی کردنی یاساو شەڕکردنی نێوان بیانییەکان خۆیان دیاردەیەکی زەق بوو. لەبەرئەوە ناوو ناوبانگی گەڕەکی ڕینکەبی باش نەبوو! من بۆ خۆم دەیانجار ئەو کابینەی تەلەفۆن و شووشەبەندی شوێنی وەستانی پاسانەم ئەبینی کە بەشەو تێکیان ئەدان و ئەیانشکاندن و سەرلەنوێ چاکیان ئەکردنەوە، بەڵام دیسانەوە وایان لێئەکردنەوە!. بۆ خۆم خەفەتم ئەخواردو پێمناخۆشبوو. ئاخر کابینەی تەلەفۆن و شووشەبەندی شوێنی وەستانی پاس هەر بۆخۆمان نییە؟! بەڵام ئیتر ئەڵێی چی لەگەڵ عەقڵی دواکەوتوودا! لەگەڵ کەلتووری شەڕەنگێزی و توندوتیژیدا. ژمارەی ڕاسیزمەکان، ئەوانەی سویدین و داوای چوونە دەرەوەی بیانییەکان ئەکەن، ڕێژەیەکی ئێجگار کەمیان هەیە لەناو سویدییەکانداو بە پێچەوانەوە بەشی هەرە زۆری سویدییەکان مرۆڤدۆستن و دژی ڕاسیزمەکانی خۆیانن و لەخۆپیشاندانە گەورەکاندا شان بەشانی بیانییەکان ئەڕۆن و لەگەڵ جێبەجێکردنی داواکانیاندان .

چەندین کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتییان هەیە، بۆ بەرگریکردن لەمافی پەناهێندەکان. هەموو نووسەرو ڕووناکبیرە بەناوبانگەکانییان دۆستی ئێمە بوون و بەردەوام داکۆکیان لێئەکردین .

جارێکیان خۆم بەچاوی خۆم دیمەنێکم بینی کە هەرگیز بیرم ناچێتەوە: (وەختێ لەتونێل بانەکەی ڕینکەبی سەرکەوتمە سەرەوە، هەر لەبەردەم کابینەی بلیت فرۆشەکەدا، دیاربوو پۆلیس کۆنترۆڵی دانابوو، بۆئەوەی بزانێ کێ بلیتی بڕیوە یان نەی بڕیوە!، لەوێدا، ژنە سۆماڵییەکی کەتە، قژی ژنە پۆلیسێکی سویدی گرتبوو وەک مزراح بەدەوری خۆیدا ئەیسووڕانەوە. ژنە پۆلیسیش خۆی بۆ شلکردبوو بێئەوەی ورتەی لەدەم بێتە دەرەوە، لەدووری چەند مەترێکیش لەولاوە پۆلیسێکی پیاوی هاوڕێی تەلەفۆنی ئەکرد بۆ ئەوەی پۆلیسی تربێن و لەکێشەکە ئاگاداربن)، هەڵبەت ئەم ژنە پۆلیسە داوای بلیتی لەژنە سۆماڵییەکە کردووەو ئەرکی یاسایی خۆی جێبەجێکردوەو ئەویش بلیتی پێنەبووەو ئەم گێچەڵەی ناوەتەوە.!

من؛ لەئامشۆکەرانی چایخانەم، لە زوویشەوە هەروا بووم. چاو و جگەرەو خوێندنەوەو نووسین، بۆ من یەک یەکتری تەواو ئەکەن. دوای بەرچاییکردن خۆم ئەگۆڕی‌و جانتا بچکۆلەکەم ئەخستە بن هەنگڵم و ئەچووم بۆ تونێل بان و ڕوومئەکردە سەنتەری ستۆکهۆڵم، پیاسەیەکەم ئەکردو، لەدواییدا ئەچووم لەچایخانەیەک و لەشوێنی جگەرەکێشاندا دائەنیشتم و دەستم ئەکرد بەخوێندنەوە یان نووسین .

من بەشی زۆری بەرهەمەکانی خۆم لە چایخانەکانی ستۆکهۆڵمدا نوسیوە، چونکە کاتێکی دیاریکراوم بۆ نووسین نییە، بەڵام لەڕۆژدا زۆرترم نووسیوە. بەتایبەتی نێوان بەیانی و نیوەڕوان. ئەگەر بەڵێنێکیشم لەگەڵ دۆست و ناسیاوێکدا هەبوایە هەر لەدەرەوەو لەچایخانەیەکدا ئەبوو. هەندێجاریش خاوەن کافتریاکەم پەست ئەکرد. چونکە زۆر دائەنیشتمو لەدواییدا ناچاربووم ئەگەر نابەدڵیش بوایە تاهەڵئەسام چوارپێنج قاوەیەک بخۆمەوە، تاقەرەبووی ئەو دانیشتنە دورو درێژانە بکەمەوە. تاخواردنیماڵیشەوە هەبووایە نانم لەدەرەوە نەئەخوارد .!

من لەخواردندا لەو کەسانەم، کە حەزم لەخواردنە تەقلیدییەکانی خۆمانە، ئەو خواردنانەی لەمنداڵییەوە خواردومانن، بۆیە ئەگەر درەنگیش بکەوتمایە خۆم ئەگرت تائەگەیشتمەوە ماڵەوەو لای چێشتە خۆشەکانی نەسرین.!

لەکۆتایی (١٩٨٧)داو دوای وەرگرتنی خەلاتی تۆخۆلسکی، یەکێک لەو نووسەرە کوردە بەناوبانگانەی نامەی بۆ نووسیم و پیرۆزبایی لێکردم "سەلیم بەرەکات" بوو. ئەوکاتە بەرەکات لە"قبرص" ئەژیا. من پێشتر دوو بەرهەمیم خوێندبۆوەو لەگۆڤارەکانیشدا کۆمەڵە قەسیدەیەکی. لەو سەردەمەدا "بەرەکات" سەرنووسەری گۆڤاری "الکرمل"ی فەلەستینی بوو، کە شاعیری ناسراو "مەحمود دەروێش" سەرپەرشتی ئەکرد. هێشتا لە "شام"یش بووم بۆ یەکەمجار لەو گۆڤارەدا "بەرەکات" نزیکەی بیست کورتە شیعری وەرگێڕدراوی بڵاوکردمەوە. "الکرمل" لەگۆڤارە سەنگین و گرنگەکان بوو. بڵاوکردنەوەی ئەو شیعرانەم، لەنێوەندی ئەدەبی و ڕووناکبیری عەرەبدا، دەنگدانەوەی خۆی هەبوو. تاگەیشتنی نامەکەشی، هیچ پەیوەندییەکم لەگەڵ سەلیم بەرەکات-دا نەبوو. ئەم پەیوەندییە لەرێی ئاڵوگۆری نامەوەو تاسالانی دواتر درێژەی هەبوو .

سەلیم بەرەکات؛ داهێنەرێکی گەورەیە، خۆی خەڵکی ڕۆژئاوای کوردستانەو لەهەرزەکارییەوە گوندەکەی خۆی بەجێئەهێڵێ و ڕوو ئەکاتە شام و دواتر لوبنان. لەگەڵ فەلەستینییەکاندا ئاشنایەتی پەیدا ئەکات و تێکەڵاویان ئەبێت. بەرەکات؛ بەعەرەبی ئەنووسێ، عەرەبییەک، کە کەم نووسەرو ڕووناکبیری عەرەب هەیە، هێندەی بەرەکات بەسەر ئەو زمانەدا زاڵ بێت. بێگومان هەر لەکۆنەوە چەندین شاعیرو نووسەری بە ڕەچەڵەک کورد هەبوون، کە بە عەرەبی نووسیویانەو بەناوودەنگیش بوون. بەلای منەوە ئەم بەڕەچەڵەک کوردانە ئەکرێن بەسێ بەشەوە...

یەکەمیان: ئەو شاعیرو نووسەرانەن، کەتەنها هەر بەنەژاد کوردن، بەلام بەرهەمەکانیان وەک هەر نووسەرێکی دیکەی عەرەبەو خاڵین لەهەر جۆرە ئاماژەیەک بۆ کوردو کەلتووری کورد! بۆ نموونە وەکوو "ئەحمەد شەوقی، مەحمود تەیمور، ڕەسافی" و زۆری تریش .

دووەمیان: ئەو کۆمەڵەن کە خۆیان دان بەکوردبوونی خۆیاندا ئەنێن، بەلام ئەم خۆ بەکورد زانینە ناڕاستەوخۆ لەبەرهەمەکانیاندا ڕەنگیداوەتەوەو لە باشترین حاڵەتدا دەست بۆ بەکارهێنانی داستان و کەلتووری کورد ئەبەن، بەلام ترسێکیان هەر لەدڵدایەو بەئاشکرا هەموو هەست و نەستێکی خۆیان نادرکێنن، وەکو نووسەری بەناوبانگ "یەشار کەمال."

سێهەمیان: ئەو نووسەرو شاعیرانەن، ئەگەرچی بەعەرەبی ئەنووسن، بەلام دەستیان بەڕۆحی کوردەوە، بەدڵی کوردستانەوە گرتووەو ئازایانە قسەی

خۆیان ئەکەن و بەئاشکرا داکۆکی لەمەسەلەی کورد ئەکەن و لەو پێناوەیشدا گەلێجار باجی پەراوێزکردنیان لەلایەن شۆڤێنییەکانەوە چۆتە سەرو تەنانەت هێرشی نارەوایان کراوەتە سەرو تۆمەتبارکراون‌و بوختانیان بۆ هەڵبەستوون!. ئەم کۆمەڵەیان هەر ئەوەیە بە عەرەبی ئەنووسن و ئەمەیش لەدەست خۆیاندا نەبووەو واقیعی تاڵ و پارچە پارچە بوونی کوردستان و ڕژێمە تۆتالیتارییەکان بەسەریاندا سەپاندوون‌و نەیانهێشتووە زمانی کوردی هەبێ و گەشە بکات. وەکوو "سەلیم بەرەکات، محیدین زەنگەنە، یەڵماز گۆنای" و هی تریش. ئەشێ خوێنەری بەڕێزیش بۆخۆی چەندین نموونەی دیکەی لەلابێت .!

سەلیم بەرەکات؛ لەڕۆمانەکانیدا هەر لەناوی پاڵەوانەکانییەوە تائەوکەش و هەوایەی ئەیانگرێتەوەو تائەو نامۆییەی لەناخی هەر یەکێکیاندایە، دنیای کوردن و ئازارەکان لەو زەمینەدا ڕسکاون و پەلوپۆیان هاویشتووە. ڕستەکان بەزمانی عەرەبی نوسراون، بەڵام بەردەوام بۆنی ئەشکەنجەو دەردەسەری کوردیان لێوەدێ. جەستەکان کوردستانین. هەروەکوو خۆی جارێک لەنامەیەکدا بۆی نووسیبووم "من جەستەم کوردییە، بەڵام فەزاکەم عەرەبییە ."!

بەرەکات؛ نەترسە و چەندینجار پەنجەی کردووە بەچاوی عەرەبە فاشیزمەکاندا. چەندینجار ڕووبەڕوویان بۆتەوەو بەقەڵەمە بوێرەکەی هەڵیتەکاندوون‌و کردوونی بەپەنگی پسان‌و جار لەدوای جاریش سوورتر بووە لەسەر هەڵوێستی نەگۆڕی خۆی. شێوازی نووسینی "بەرەکات" گرانەو بەگرانیش ئەگاتە خوێنەر! هەروەکوو ئەوەی شاخێکی ئاسن هەڵبکەنێ و یان لەناو تەمومژو نهێنیدا بنووسێت و لەگێژەنی زمان بدات و سواری ئەسپە چەمووشەکانی ببێت. شیعرەکانی لەتەلیسم ئەچن، هەڵهێنانیان زۆرجار قاموس و زۆر جاری تریش سیحربازی ناو زمان و خەیاڵی ئەوێ .

من بۆ خۆم ئەزانم ئەدەبێکی باڵایە، بەڵام حەزم لەو دنیایە نییە. لەڕێی ئاڵوگۆڕی نامەوە پەیوەندیم لەگەڵ سەلیم بەرەکاتدا بەردەوام بوو، دووسێ جاریش کتێبەکانی خۆی بۆ ناردم. لەو ساڵانەی دوایشدا داوای پەناهێندەی سیاسی لەسوید کرد. دوای هەوڵێکی زۆر ئینجا وەرگیرا .

لەساڵی (١٩٩٧)دا بۆ یەکەمجار یەکتریمان بینی. بەرەکات؛ جلوبەرگ و هەڵسوکەوتی ئاسایی نییە، هاوین بوو کە یەکتریمان بینی، فانیلەیەکی عەلاگەی سوورو شۆرتێکی کورتی لەبەردابوو! وابزانم جووتێ نەعلیشی کردبوو بەسەر پێیەوە. کە تەوقەم لەگەڵدا کرد پێموت:"ئەی داری زانا-کەت کوا تا پێی هەڵچی؟"

دواتر چووینە بارێک و دەستمانکرد بەخواردنەوەی بیرەو قسەکردن. جارێکی تریش لەو کۆڕەدا ئامادەبووم، کە سویدییەکان وەک ڕێزلێنان بۆیان ڕێکخستبوو.

"محەمەد عەفیف ئەلحسەینی" و "ئەحمەد ئەلحسەینی" ئەم دوو شاعیرەیش کوردی ڕۆژئاوان و ئەوانیش هەر پەناهێندەن و لە سوید ئەژین. عەفیفی؛ ئەویش هەر بەعەرەبی ئەنووسێ، شاعیرێکی ناسکەو لەهاوڕێ نزیکەکانی سەلیم بەرەکات-ە. لەو سالانەی دواییداو هەر لەسوید، گۆڤاری "الحجل"ی دەرئەکرد، بەلام دواتر لەبەر قەرزاریی و نەبوونی ڕایگرت. ئەحمەد ئەلحسەینی؛ چیرۆک نووسەو بەزمانی کوردیو بەپیتی لاتینی ئەنووسێ. چیرۆکەکانی تازەنو پێشکەوتوون. بۆ یەکەمجار ئەو "الجندب المدیدی" سەلیم بەرەکاتی وەرگێڕا، چەند جارێکیش هەندێ چیرۆکی "چیخۆف"ی کردووە بەکوردی. ئەمیش لەدەمێ ساڵەوە لەسوید ئەژی. چەندینجار یەکترمان بینیووە، سەرودەمێک لەگەڵ عەفیفی-دا زۆر نزیک بووین لەیەکەوە، خۆی لەخوارووی سوید لە "یۆتۆبۆری" ئەژیا. هەرکاتێ سەردانی "ستۆکهۆڵم"ی بکردایە، تەلەفۆنی بۆ ئەکردمو لەچایخانەیەکدا یەکمان ئەگرتەوە. چەند بەرهەمێکی بلاوکردۆتەوە، یەکێک لەو چاوپێکەوتنە جوانانەی لەگەڵمدا کراوە، چاوپێکەوتنێکی ئەدەبی ئەوبوو. پرسیارەکانی بۆ نووسیمو منیش لەسەرخۆ وەلامەکانم بۆ نووسییەوەو دواتر لە "ألف یاء"ی ڕۆژنامەی "الزمان"دا بلاوکرایەوە. جگە لەوەیش، دوو سێ جاری تر، خۆی لەسەر بەرهەمە وەرێگێڕدراوەکانم بۆ عەرەبی نووسیوێتی، دیارترینیان ئەو وتارە بوو، کە لەسەر "بۆننامە" نووسیبووی و پاشان بلاوکرایەوە!

**ئەوەی دەمانچە بەڕابردووی خۆیەوە بنێ،**
**پاشەڕۆژ تۆپی پێوەدەنێت!..**

لەساڵی (١٩٨٨) دا چەند سەفەرێکی دیکەی وڵاتانی ئەورووپامکرد. لەوانە بەریتانیاو ئەڵەمانیا. ئەم سەفەرانەم لەسەر بانگهێشتی ئەو یانەو مەڵبەندو کۆمەڵە کەلتووریانە ئەکرد، کە ئەیانویست کۆڕی شیعرخوێندنەوەیان بۆ بگێڕم . بلیتی فڕۆکەیان بۆ ئەبڕیم و هەروەها لای خۆیانەوە ڕێکلامیان بۆ کۆڕەکانم ئەکردو بڵاویان ئەکردەوە. لە لەندەن دۆست و هاوڕێ و ناسیاوی زۆری لێبوو، لەهەموو ئەو سەفەرانەداو لەسەرەتاوە تائەم ساڵانەی دواییش دەرگای ماڵی ئەو ئازیزانەی وەکوو: "ئازادی کاک مستەفا و کاک کامەرانی بەهجەتی عەونی و کاک کەمال میراودەلی و کاک حەمە قەرەداخی و کاک حەمید بلباس و کاک مەنسوری حەفید"و بەڕێزەکانیان، خزمەتیانکردووم و بووم بە ئەرک بەسەریانەوەو، ماندوومکردوون. ئەمە جگەلەوەی هەر یەکێک لەو هاوڕێ خۆشەویستانە بەئۆتۆمبیلی خۆیان گەڕاندوومیان و بردوومیان بۆ شوێنەوارو موزەخانە گرنگەکان و هەموو ئەو شوێنە خۆشانەی کە لە لەندەن و دەرەوەی لەندەندا هەبوون .

تەنانەت لەسەفەرێکدا، لەگەڵ هاوڕێم مەنسور حەفیددا چووین بۆ باکووری ئینگلتەرە، بۆلای هاوڕێمان دوکتۆر "فەرەیدون" تادوا نوختەو ڕۆخی زەریا ڕۆیشتین .

یەکەم سەفەرم بۆ ئینگلتەرا لەساڵی (١٩٨٨) دا بوو. لەماڵی ئازادی کاک مستەفا دابەزیبووم. مەڵبەندی ڕۆشنبیریی لە لەندەن بانگهێشتیانکردبووم. بەشی زۆری ئەو هاوڕێ و دۆستانەی لەساڵانی دواتردا گەیشتنە ئینگلتەرە، من لەسەفەرەکانی دواترما بەدیداریان شادبوومەوە. لەساڵی (١٩٨٨)ەوە هەتا ساڵی (٢٠٠٠)و بەرەو ژوورتریش بهلایەنی کەمەوە شەش حەوت جار چووم بۆ ئینگلتەراو شەش حەوت جاریش بۆ ئەڵەمانیاو دووجاریش بۆ ئیتالیا، هەروەها سێ چوارجار بۆ هۆڵەندەو دووجار بۆ نەمساو دووجار بۆ سویسراو چەند جارێکیش بۆ دانیمارک و جارێک بۆ هەنگاریا و جارێک بۆ پراگ و چەندینجار بۆ برۆکسل و جارێکیش بۆ ئەسینا و هەروەها دووجار بۆ وڵاتە یەککرتووکانی ئەمریکاو جارێکیش بۆ یەکێتی سۆڤیەتی جاران .

ڕەنگە لەم سەفەرانەدا هەر یەکدوو جارێ کۆڕی شیعر خوێندنەوەی تیا نەبووبێ، ئەگینا هەر هەموو گەشتەکانم گەشتی شیعر بوون. ئەمە جگە لەوەی نەک هەر لەپایتەختی بەشێک لەو وڵاتانەدا، بەڵکوو لەگەڵێ شاری دیکەی ئەڵەمانیاو نەرویج‌و سویسراو دانیمارکدا کۆڕی شیعر خوێندنەوەم هەبووە. بەسەدان شیعردۆستی هەموو پارچەکانی کوردستانم ناسیوە، لەگەڵیاندا دانیشتووم‌و گوێم لە ڕازو نیازو رەخنەکانیان گرتووە! چەند جارێکیش لەم وڵاتانەدا، خۆم بەکوردی و یەکێکی تر شیعرەکانی زمانی ئەو وڵاتەی بۆیچووم خوێندۆتەوە.

هەرچەند چووبم بۆ لەندەن؛ لەلایەن مەڵبەندی ڕۆشنبیرییەوە داوەتکراوم. هەر لەهۆڵی مەڵبەند خۆیدا کۆڕەکانم گێڕاوەو گوێگرەکانیشم کەمنەبوون. لە (١٩٨٨/٣/١٦)داو لەکارەساتی هەڵەبجەدا من لە لەندەن بووم.. ئیتر ئەو ڕۆژەو ڕۆژانی دواترو لەکاتی پرۆتۆست‌و خۆپیشاندانی ئاوارەی کورددا لەگەڵیاندا بووم. جگە لەهاوڕێ نزیکەکانم، تاماموستا "برایم ئەحمەد"یش لە ژیاندا بوو، هەر سەفەرێکی لەندەنم کردبێ، بەتایبەتی چووم بۆ لای بۆ ماڵەوەو سەردانم کردووە. منیش هەر کۆڕێکم گرتبێ هاتووە .

دیمەنێکیش هەیە، کە هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە، لەساڵی (١٩٩٤) دا "گەلەری کوفە" کۆڕێکیان بۆ گێڕام. من خۆم بەکوردی و "فەوزی کەریم"ی شاعیریش شیعرەکانی بەعەرەبی ئەخوێندەوە. هێشتا کۆڕەکە دەستی پێنەکردبوو، لەبەر دەرگاکە ڕاوەستابووم. تەماشامکرد ماموستا برایم بەخۆی و گۆچانەکەیەوە بەرەو ئەوێ دێت. چووم بەپیریەوەو پێموت: (ماموستا ئەوە بۆ کوێ؟!) وتی:

(بۆ؟ ئەی تۆ کوڕت نییە!). وتم: (بەڵێ، بەڵام ئاخر تۆ بۆ ئەزیەتی خۆت ئەدەیتو ئەرکت کێشاوە)! ئەویش وتی: (ئینجا من ئەگەر بۆ کوڕی تۆ نەیەم، بچم بۆ چ کوڕێ!). هات و دانیشت و تاکۆتایی هەڵنەسا. بیرمە لەوکوڕەدا "بلّند ئەلحەیدری" و هاوسەرەکەیشی لەپێشەوە دانیشتبوون. ئەو ساڵانەی بلّند ئەلحیدری لە بەغدا بوو ڕێکەوتبوو بیبینم. قەتیش نەهاتووە بۆ هیچ بۆنەو کوڕێ پەیوەندی بە کوردو کەلتووری کوردەوە هەبێت. لەشیعرەکانیشیدا هەست بەهیچ ڕەنگدانەوەیەکی کوردانە ناکرێتو تێکەڵ بەکوردیش نەئەبوو، تا دوای نەوەدەکان و لە لەندەن، ئیتر هەندێ تێکەڵاوی لەگەڵ کوردەکاندا پەیداکرد. دوایئەو کوڕە دووجاری تر بینیم. جارێکیان لەماڵی خۆیان داوەتی "من و کاک کامەران قەرەداخی و کاک سامی شۆڕش"ی کرد. جارێکی تریش، ئەو وەختەی تەمەنی بوو بەشەست و پێنج ساڵ، هەر لە لەندەن هاوڕێکانی کوڕێکی ڕێزلێنانیان بۆ گرتوو منیشی بانگکردبوو .

من و کاک سامی شۆڕش؛ لە دەمێکەوە، لە حەفتاکانەوە، لەجموجووڵی ڕوانگەوە یەکتری ئەناسین. دیارە ئەو بەتەمەن لەمن بچووکترە، لە دەستپێکدا شیعری ئەنووسی، بەڵام ئیتر بەپچڕپچڕی بەردەوامبوو. دیسانەوە لەشۆڕشی ئەیلولدا لە شاخ یەکتریمان بینییەوە. ئەو سەردەمە ئەو لای قیادەی مەرکەزی بوو. ئێمە لە ڕاگەیاندن و لەئازادی بووین، دواتر هاتە لای ئێمە. دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، پێموایە چوو بۆ ئەوروپاو دواتر گەڕایەوە. کاک سامی مارکسی لینینی بوو، چووە ناو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانیشەوە. دوای دابڕانێکی دوروودرێژ، لەبالیسان یەکترمان بینییەوە. ئەوکاتە ئەو لەدەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی نووسەرانی کوردستاندا لەشاخ کاری ئەکرد. ئەو وەختەشی من چوومە دەرەوە، کۆتایی (١٩٨٤) ئەویش لەدۆڵی جافەتی و لەیاخسەمەر بوو. لەوێ سەرپەرشتی دەرچوونی "الشرارە"ی (ی. ن. ک)ی ئەکردو تیایدا ئەنووسی. دواتر بەعس لەڕێی جاسووسەکانی خۆیەوە کنەی کردوو لەناوچەی مەرگە "د. مەحمود عەلی عوسمان و عەدنان موفتی و مستەفا چاوەڕەش"و چەند کەسێکی دیکەی دەرمانخوارد کرد. سامی شۆڕش-یش لەناو دەرمانخواردکراوەکاندا بوو. بۆ چارەسەرکردن گەیاندرانە لەندەن. دوائەوەی چارەسەرکران، ئیتر سامی نەگەڕایەوە .

لەساڵی (١٩٨٨)داو لەیەکەم سەفەرمدا بۆ لەندەن، لەوێ بینیمەوە. هەر کاتێکیش بچوومایە بۆ لەندەن یەکتریمان ئەبینی. زۆرجار من و ئەو و کاک "مەنسور

حەفید" لەچوونە دەرەوەو گەڕاندا بەیەکەوە ئەبووین. لەساڵەکانی دواتریشدا کاک سامی سەرپەرشتی (المنار)و ڕۆژنامەی "کوردستانی نوێ"ی دەرەوەی وڵاتی ئەکرد. لەلەندەن پێکەوە کاک "کامەران قەرەداخی"مان ئەبینی و لەڕێی ئەوەوە دەرگای ڕۆژنامەی (الحیاة)ی لەندەنی بۆ کرایەوەو تیایدا ئەنووسی. لەم ساڵانەی دواییداو لەوەرچەرخانێکی چاوەڕواننەکراوداو لەپڕێکدا کاک سامی بە (١٨٠) پلە سوڕایەوەو چووە ناو "پ. د. ک"ەوە.

لەپێشەکی دیوانەکەیدا کە بەو دواییە چاپیکرد، لەبارەی ڕوانگەو بزووتنەوەی نوێخوازی سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابوردوو قسە ئەکات و بەئاشکرا ئەیەوێ من بخاتە پەراوێزەوەو ڕاستییەکان چەواشە بکات. لەمانەیش ناخۆشتر ئەو چەند ڕستەیە بوو، کە تیایدا ئەڵێ: "هەتا ئێستاو هەر دیوارێ لەوەوبەر من پاڵم پێوەدابوو، هەرهەمووی دیواری حەسیر بوون، ئەم دیوارەیان نەبێت، کە دیواری (پ. د. ک)و بنەماڵەی بارزانییە" ئەم تەقەکردن و بێوەفاییە بەرامبەر ڕابوردووی خۆی، قسەیەکی "ڕەسوڵ حەمزاتۆف"ی بیرخستمەوە، کە ئەڵێت: "ئەوەی دەمانچە بەڕابوردووی خۆیەوە بنێت، پاشەڕۆژ تۆپی پێوە ئەنێت.!"

لەیەکەم سەفەرداو هەر لە لەندەن کاک "حوسێن سنجاری"م بینی. من لە ساڵی (١٩٨٤)ەوە سنجاری-م ئەناسی، پیاوێکی زیرەک و قسە خۆش و دڵتەڕە. پێیوتم لەڕۆژنامەدا هەواڵێکم بەرچاوکەوتووە، ڕێکخراوێکی کەلتووری ئینگلیزی بۆ پشتگیریکردن لەمەسەلەی فەلەستینی، فیستڤاڵێکی چەند ڕۆژی لە لەندەن ڕێکدەخاتو ڕۆژێکیان بۆ شیعر خوێندنەوە تەرخانکردووە، سێ شاعیر لەوڵاتانی جیاجیای دنیاوە بەشداری تێدائەکەنو منیش پەیوەندیمکردووە بەو ڕێکخراوەوە بۆ ئەوەی تۆیش وەک شاعیرێکی کورد بەشدارییکەیت. خۆیشم چەند پارچە شیعرێکتم بۆ ئینگلیزی وەرگێڕاوە. ڕەنگە ئەمڕۆ یان سبەی وەڵام بدەنەوە. لە هەمانکاتدا کاک "کەمال میراودەلی" ئەویش لای خۆیەوە چەند شیعرێکی وەرگێڕابوو.. دوای دوو سێ ڕۆژ، سنجاری وەڵامی لێگێڕامەوە، کە کارەکەی جێبەجێکردووەو منیش خراومەتە ناو بەرنامەی ئەو ڕۆژەی شیعر خوێندنەوەوە .

فێستیڤاڵەکە؛ تەنها بۆ شیعر نەبوو، بەڵکوو بۆ چەندین چالاکی هەمەڕەنگ بوو. باس و لێکۆڵینەوەو شانۆ، هونەری شێوەکاری و هتد.. لەڕۆژی دیاریکراودا سنجاری و کاک کەمال میراودەلی و من یەکمان گرتەوە. بەرەو هۆڵی فێستیڤاڵەکە کەوتینەڕێ. وەختێ چووینە ژوورەوە بەلایەنی کەمەوە حەوسەدو

پەنجا کەسی دانیشتبوون. هێشتا بەرنامەی شیعر خوێندنەوە دەستی پێنەکردبوو. ئەو کوردانەی لەوێ بوون لەهەشت نۆکەس تێپەڕیان نەئەکرد. دوایئەوەی بەرنامەکە دەستپێکرد، شاعیرەکان یەک لەدوای یەک کەوتنە خوێندنەوەی خۆیان. ئەبوو سی شاعیر شیعر بخوێنێتەوە. نەمئەزانی کەی نۆرەی من دێت. تائەوکاتە چەند شاعیری لەئیسپانیاو کوباو بەنگلادیش و هندستان و پاکستان و بەنگال و مالیزیاو ئەندونیسیاو چەند وڵاتێکی دیکەوە هاتبوون و شیعریان خوێندبۆوە. وەک بیتەوە بیرم من پانزەهەمین شاعیر بووم، چوومە سەر شانۆکە .

تەنها پێنج کورتە شیعرم ئامادەکردبوو. کە دووانیان لە وەرگێڕانی سنجاری و سیانەکەی تریان لەوەرگێڕانی میراودەلی بوون و ئەوان خۆیان یەکێکیان دانابوو، کە بەئینگلیزی لەگەڵمدا بخوێنێتەوە، شیعرەکان خوێنرانەوە. پێموایە بەخوێندنەوەی کوردی و ئینگلیزیش دەدەقیقەی نەخایاند، بەڵام هۆڵەکە بوو بەهی ئێمە، جگە لەچەپڵە ڕیزانێکی گەرم، هەر هەموویشیان هەستانە سەرپێیان!. من ئەم پێشوازیی لێکردنەم پێخۆش بوو. هەروەها سنجاری و میراودەلیش گەشانەوە. دوای تەواوبوونی کۆڕەکە دەستەی ڕێکخەری فیستیڤاڵەکە هاتن بۆلامو پێکەوە دانیشتین و وتیان: (ئێمە زۆر پێخۆشحاڵین شاعیرێکی وەک تۆ بناسینو ئومێد ئەکەین لەپاشەڕۆدا چەند جاری تر لەفیستیڤاڵی وادا بەیەکتر بگەینەوە). ناونیشانی سویدیان لێوەرگرتم. سێ ساڵ دوای ئەم دیدارە، یەکێکیان هاتبوو بۆ ستۆکهۆڵم، پەیوەندی پێوەکردم و لەگەڵ برادەرێکی تردا لەکافتریایەک پێکەوە دانیشتین.

کاک "کەمال میراودەلی" لەهاوڕێ دێرینەکانە، لەشەستەکانەوە یەکترمان ناسیوە. بەهۆی یەکێتی نووسەرانی کوردەوە، لەحەفتاکانەوە زیاتر تێکەڵی یەکتر بووین، کاک کەمال؛ شاعیرو نووسەرو ڕەخنەگرە، بەڵام قوڵبوونەوەی لەبواری لێکۆڵینەوەدا دیارترە .

میراودەلی؛ یەکێک بوو لەو ڕووناکبیرانەی بەوتاری تازەی ڕەخنەگرانەوە جیا لەوتاری تەقلیدی، هاتە نێو کایەی ئەدەبەوەو توانی زنجیرەیەک وتاری سەنگینو عەقڵانی لەستاتیکای ئەدەبی کوردیدا پێشکەش بکات، کە تائەوکاتە نموونەیان زۆر کەمبوو. چەندجارێک لەشیکردنەوەی شیعرەکانی "گۆران"دا ئەم توانایەی خۆی نیشانداوە. چەند دەقێکی ئەدەبیشی لەئینگلیزییەوە بۆ کوردی

وەرگێڕاوە. کە لەناویاندا چەند دەقێکی شانۆنامەکانی شکسپیر-یشی تێدایە. جگە لەدوو سێ دیوانە شیعری خۆی.

میراودەلی، لەدەمێ ساڵەوە لەلەندەن ئەژی. پێموایە ئەگەر کاک کەمال دەرفەتی ئەوەی ببوایە پەرە بەلێکۆڵینەوە ئەدەبیەکانی بدات، بەرهەمی گەورەتری پێشکەش بەکتێبخانەی کوردی ئەکرد. سەردەمێکیش لەگەڵ کاک "سەباح غالب"دا پێکەوە گۆڤاری (پەیڤ)یان لە لەندەن دەرئەکرد. جگە لەمانە هەمووی، کاک کەمال میراودەلی، لەپیاوە بەهەڵوێست و پاکەکانی کوردە. ڕووناکبیرێکی ئازایە. بێ پێچ و پەناو پەردەپۆشیو ڕاستوڕەوان قسەی خۆی ئەکاتو بێباکە لەوەی چی ئەبێ یان نابێ. هەر جارێ ڕێمکەوتبێتە لەندەن میوانداری کردووم. چەند جارێکیش بەشێک لەشیعرەکانمی کردووە بەئینگلیزی. ئەو خۆشەویست و مامۆستاو ئازیزانە کەمنەبوون، کە لەلەندەن ئەمبینین و میوانداریان ئەکردم، وەکوو هاوڕێم کاک "سەباحی غالب"، کە هەمیشە دەرگای ماڵی کراوەبووە، بۆ هەمووان دڵسۆز. یان مامۆستا "محەمەد ڕەسوڵ هاوار"، جارنەبووە خۆم و چەندین هاوڕێی تریش داوەتی ڕیستۆرانە باشەکانی لەندەن نەکات. یان "کاکەمینە"ی شاعیر بەسەلیقەی کوردەواری خۆی دڵخۆشمان نەکات .

مامۆستا محەمەد ڕەسوڵ هاوار؛ جگە لەشیعرەکانی، لەو ساڵانەی دواییدا بەکتێبە مێژووییەکانی چەندین شارای تازەی خستە سەر ئەو خەرمانی مێژووەی هەمانە. لەمانەیش گرنگتر لەدووڕیانە مەترسیدارەکانی میللەتەکەماندا بوێرانە قسەی خۆیکردووە، ئەوەی بڕوای پێیبووە وتوێتیو نووسیویەتی. کاکە سەباحی غالب-یش هەر لەگۆڤاری "پەیڤ"ەوە تا ئەگاتە سەر گۆڤاری "باسکار"، بەرهەمی بەبڕشتی پێشکەش کردووینو لەو ساڵانەی دوایشدا لەگەڵ چەندین ڕووناکبیری تردا لەئاشتبوونەوەی گشتیو کۆتاییهێنان بەشەڕی ناوخۆدا، ڕۆڵی لەبەرچاوی هەبووە.!

ئەو کاتەی کە هێشتا لەشام بووم، یەکەم کەس لەنێو هاوڕێیانی دەرەوەی وڵاتدا ئەوەی لەمنی پرسییەوە کاکە "مەنسور حەفید" بوو، بروسکەیەکی تایبەتی بۆ کاک "عومەر عەبدوڵڵا"و من ناردبوو. کاکە مەنسور لەهاوڕێ نزیکەکانەو تائێستەیش پەیوەندیمان برایانەو دڵسۆزانەیەو قەتیش دڵمان لەیەک زویر نەبووە .

ئەدۆنیس؛ نەیتوانی سەیری هەڵەبجە بکا،
گەشتە دوورو درێژەکەش دەستیپێکرد..

لەپایزێکی درەنگی (١٩٨٨)دا لەڕێی کاک "محەمەد ئۆزۆن"ەوە، زانیم، کە لەسەر بانگهێشتی زانکۆی ستۆکهۆڵم "ئەدۆنیس"ی شاعیری گەورەی عەرەب ئەگاتە ستۆکهۆڵمو ماوەیەک ئەمێنێتەوە. پێمخۆشبوو لەنزیکەوە بیبینم .

یەکەمجار؛ لەکۆڕێکی تایبەتداو هەر لەناو زانکۆی ستۆکهۆڵمدا بینیم. لەوکۆڕەدا باسی لەئەزموونی شیعری خۆیکردو لەدوایشدا هەندێ لەشیعرەکانی خۆی خوێندەوە. (ئەدۆنیس، شیعر جوان ئەخوێنێتەوە). جگەلەوەیش ڕووناکبیرێکی گەورەیە، داوام لە کاک (محەمەد ئۆزۆن) کرد کەسبەی شەو ئەمەوێ لەماڵی خۆمانو لەگەڕەکی "ڕینکەبی" میوانداری ئەدۆنیس بکەم و پێکیشەوە خواردنی کوردەواری بخۆین .

بۆ سبەی ئێوارە؛ ئەدۆنیس و محەمەد ئۆزون و من و ژنە باسکارێکی سویدی کە بۆخۆی پسپۆڕ بوو لەلێکۆڵینەوەی شیعرەکانی ئەدۆنیسدا، لەماڵی خۆمان و هەر لەسەر مێزی موبەقەکە چوار قوڵی دانیشتینو دەستکرا بەخواردنەوەی بادەو قسەکردن .

ئەدۆنیس؛ پیاوێکی هێمن و لەسەرخۆیە، کەمدووە. ئەوەی لەڕۆحی ئەم پیاوەدا نەبێ، دەماری عەرەبچێتیو خۆبەزلزانینە. من؛ ئەو شەوە هەرگوێم ئەگرت، یەکێک لەو باسانەی ئەدۆنیس دەرگاکەی کردەوە، مەسەلەی

"خۆشەویستیی"بوو، کە"ئەبێ هەر ئەو ئەم دنیایە بگۆڕێ". "ئەو خۆشەویستییەی لەدڵی منداڵدا هەیە". "ئەو خۆشەویستییەی لەبەفری تازە باریوو ئەچێ". هەروەها باسی ئەوەیکرد، کە "ئەو لەهەموو نووسینەکانی خۆی ڕازی نییە". یان بەجۆرێکی تر، ئەو وەختێکی زۆری لەژیانی خۆیدا بەو تیۆرانە داوە، کە نەئەبووبیدا، لەجێی ئەوە شیعری بنووسیایە، پاشخانی ڕووناکبیری فەرەنسییە. لە میانەی قسەکردندا خۆی داوایکرد چەند پارچە شیعرێکم بخوێنمەوە. منیش لەو شیعرانەی کرابوون بە عەرەبی چەند دانەیەکم خوێندەوە. دیاربوو یەکێکیانی زۆر بەدڵ بوو کە ئەویش ئەم پارچە شیعرە بوو:

لەو شەوەدا

لەو دۆڵەدا

چراکان کوژابوونەوە

تاقە چرایەک ئەسووتا

ئەویش چرای شاعیرێ بوو

بەدیار برینی نەنووستووی

شیعرێکەوە دانیشتبوو!

هەواڵی کوردستانی لێپرسیم، باسی هەڵەبجەم بۆکرد. دواتر داوام لێکرد، کە بچین تەماشای شریتی ڤیدیۆکەی کارەساتی کیمیابارانی ئەوشارە بکەین. چووینە هۆڵەکەو تەماشای ڕۆژی (٣/١٦) مانکرد، بەلام ئەدۆنیس؛ لەدوای چوارپێنج دەقیقەیەک وتی: (داوای لێبووردن ئەکەم، من ناتوانم تەماشای ئەم دیمەنە سامناکانە بکەم. تکایە بیکوژێنەرەوە!).

گەڕاینەوە شوێنی خۆمان، دیاربوو کارەساتەکە بەقوڵی کاری تێکردبوو، ئینجا باسی "ئەنفال"م بۆ کرد، کە ئەوکاتە کورد قڕانو ڕاگوێزانو تەعریبو تەرحیل لەگەرمەی جێبەجێکردنی ئەو تاوانانەدا تەواوی باشووری کوردستانی گرتبۆوە. کاتی نانخواردن هاتو نەسرین چێشتە خۆشەکانی خۆی هێنا. شەو درەنگان خواحافیزیانکردو ڕێککەوتین، کە سبەینێ یەکتر ببینینەوە. بیرمە ئەدۆنیس بەرلەوەی بڕواتە دەرەوە، سوپاسێکی زۆری مادام "نەسرین"ی کردو وتی: (دەمێکە خواردنی وا خۆشم نەخواردووە!).

بۆ سەعات یانزەی پێش نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی، یەکمانگرتەوە، پیاسەیەکی دوورودرێژمانکرد. لەدواییدا ئەدۆنیس پرسیی: (ئێوە لێرە هونەرمەندی

شێوەکاری باشتان هەیە؟!). وتم: (بەڵێ). باسی "مەدحەت کاکەیی"م بۆ کرد. وتی: (حەزئەکەم تابلۆکانی ببینم). تەلەفۆنمان بۆ کاک مەدحەت کردو وەختێکمان دیاریکردو چووین بۆ ماڵەوە بۆلای. شوێنی وێنەکێشانیشی هەر لەهەمان ماڵدا بوو. دوایئەوەی قاوەیەکمان خواردەوە. سەرکەوتینە سەرەوە بۆ مەرسەمەکەی. ئەدۆنیس؛ کەوتە تەماشاکردنی یەکە بەیەکەی تابلۆکان، جاری وا هەبوو چارەکێک لەبەردەمی تابلۆیەکدا ئەوەستا! ئەدۆنیس؛ سەرسامی خۆی بەو تابلۆیانەی کاکەیی دەربڕی، زۆری پێخۆشبوو کەوێنەکێشێکی گەورەی وەکو کاکەیی ناسیی. ئیتر لەو کاتەوە ئەدۆنیس بوو بەهاوڕییەکی نزیکی کاکەیی و بەردەوام نامەو تەلەفۆنیان لەبەیندا هەبوو. تەنانەت دوای چەند ساڵێکیش کە کاکەیی پێشانگەیەکی تایبەتی خۆی لەستۆکهۆڵم کردەوە. لەدەلیلی پێشانگاکەدا، ئەدۆنیس شیعرێکی بۆ کاکەیی نووسیبوو، ئەویشیان لەگەڵ وێنەی تابلۆکاندا بڵاوکردبۆوە .

بەرلەوەی ئەدۆنیس سوید بەجێبهێڵێ، داوایلێکردم کۆمەڵێ شیعری خۆمی بۆ بنێرم تا لەگۆڤاری "مواقف"دا بڵاویبکاتەوە. وەک بێتەوە بیرم، نزیکەی حەڤدە کورتە شیعرم بۆ ناردو دواتر بڵاوبۆوە. دوای گەڕانەوەی ئەدۆنیس بۆ پاریس. دووجار بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵدا کردم، یەکەمجاریان بۆ ئەوەبوو دیسانەوە سوپاسی مەدام نەسرین بکات بۆ خزمەتگوزاری ئەو شەوەی ماڵەوەو خواردنە کوردییەکانی .

دووەم جار؛ دوای بڵاوبوونەوەی شیعرەکانم بوو لە"مواقف"دا، ئەدۆنیس لە تەلەفۆندا پێیوتم: (شیعرەکانمان بڵاوکردۆتەوە. تەنانەت هەندێ لە خوێنەرانی گۆڤارەکە تەلەفۆنیان بۆ کردووین و ئەڵێن: "لەمجۆرە شیعرانە بڵاوکەنەوە!"). پێموایە دووساڵ دواتر جارێکی تر ئەدۆنیس هاتبۆوە بۆ ستۆکهۆڵمو هەواڵی پرسیبووم، بەڵام من لەوێ نەبووم.

بانگکردنم لەلایەن کۆمەڵەو ڕێکخراوە کەلتوورییەکانی کوردەوەو لەهەموو ئەوروپادا لەزۆربووندا بوو، درێژترین سەفەرم بەشەمەندۆفێر ئەو سەفەرە بوو کە لەستۆکهۆڵمەوە چووم بۆ "کۆپنهاگن" و ئینجا بۆ "بەرلین" و دواتر بۆ "نەمساو سویسرا".

لەهەر شوێنێکیش لەو شوێنانە لەهەفتە کەمتر نەئەمامەوە. من؛ لە سەفەرکردندا پەلەناکەمو حەز ئەکەم لەسەر خۆو قۆناغ بە قۆناغ بڕۆم. لەهەموو ئەو وڵاتانەیشدا هاوڕێ و دۆست و ناسیاوم هەبوون و پەکم نەئەکەوت! دیارە

ناتوانم لەم بیرەوەرییانەدا هەموو ئەو گەشتانەی کردوومن باسیانبکەم، یەکەم لەبەر ئەوەی زۆر زۆرن و دووەمیش لەبەرئەوەی گەلێ لە وردەکارییەکانی ئەو سەفەرانەم بیرچۆتەوە، بەتایبەتی ناوی شوێن و هەموو ئەو هاوڕێ و خۆشەویستانەی، کە دیومن و لەگەڵمدا بوون و میوانداریان کردووم. ئەمە جگە لەوەی ئەم سەفەرانە بۆماوەی، لەدەساڵ زیاتر، بەپچڕ پچڕی درێژەی هەبووە. چەندینجار ڕێمکەوتۆتە پاریس یان لەندەن یان کۆپنهاگن، بۆیە تەنها ئەو ڕووداوانە ئەگێڕمەوە، کە لەبیرمدا ماونەتەوە. ئەو کۆڕانەی گەورەبوون و گرنگ بوون و بیرمنەچوونەتەوە، یان ئەو کەسانەی زۆر لەگەڵمدا بوون و پێمەوە ماندووبوون و ئەرکیان کێشاوەو یان کاری وەرگێڕانیان بۆکردووم.

یەکەم کۆڕم لەکۆپنهاگن؛ بەکوردی و عەرەبی بوو، چونکە عەرەبێکی زۆری عێراقی لەوێ ئەژیان و منیشیان ئەناسی. یەکەم کەس کە لەوێ ناسیم و لە پێشوازیمدا بوو کاک "حەمە خانەقینی" بوو، ئەوساکە ئەو بەرپرسی کۆمیتەی "ی. ن. ک" بوو لە دانیمارک. ڕەنگە زیاد لەحەوت هەشتجار ڕێمکەوتبێتە کۆپنهاگن و لەساڵانی دواتریشدا ئەچوومە ماڵی کاک "هیوا". کاک هیوا؛ خۆی و هاوسەرە بەڕێزەکەی، لەهەموو ئەو سەفەرانەدا دەرگای ماڵیان بۆ من لەسەر پشت بووە .

کاک هیوا؛ پیاوێکی تابڵێی خۆشەویست و دڵسۆز و پاک و چالاک بوو. لەو سەفەرانەدا کاک "هەڵکەوت عەبدوڵلا"یش دووسێ جارێ لەوێ هاتووە بۆ کۆڕەکانم. پێشتریش لەدانیشتنێکداو لەکافتریای وێستگەی سەرەکی شەمەندۆفێری ستۆکهۆڵم، پێکەوە دانیشتبووین. لەو سەردەمەدا کاک هەڵکەوت؛ خەریکی دەرکردنی گۆڤاری یەکگرتن بوو، بەڵام ئەو کاتە پەیوەندیمان وەک ئێستا بەهێز نەبوو. هەر لەوێش بۆ یەکەمجار کاک "مەسعود زیلان"م ناسیی، کەخەڵکی باکووری کوردستانە. ئەم لەدەمێکەوە لەدانیمارک ئەژی و زمانە دانیمارکییەکەیشی پێرفێکتە. لەسەرەتای نەوەدەکاندا کۆمەڵە شیعرێکی منی کرد بەدانیمارکی و بەنێوی "سێ زمان و چوار قامچی"یەوە بڵاوکرایەوەو لەو بیست کتێبەدا، کەساڵانە لەدانیمارک وەک باشترین کتێب هەڵئەبژێردرێن، دیوانەکەی من یەکێک بوو لەو بیست کتێبە. تائێستەیش پەیوەندیم لەگەڵ کاک مەسعوددا هەرماوەو بەنیازی پرۆژەی تریشە دەربارەی شیعرەکانم .

دیارە هەر لە کۆپنهاگن ماڵی حاجی و دەستڕەنگینی خۆی و خێزانەکەیانم لەبیرناچێتەوە. پێشتریش دانیمارکییەکان فیستیڤاڵێکیان بۆ خوێندنەوەی شیعری

کوردی گێڕابوو، من ئەو کاتە لەئەوروپا نەبووم. برایانی شاعیر "پەشێوو ڕەفیق سابیر و فەرهاد سەنگاوی" لەجیاتی خۆم شیعرەکانیان خوێندبۆوە. کاک "حەمە جەزا"ی هونەرمەندو گۆرانیبێژ-یش ئەویش بەخاوو خێزانەوە لەکۆپنهاگن بوون. هەرجارێ ڕێمکەوتبێتە ئەوێ، بەتایبەتی ناردوویانە بەشوێنمداو میوانداریيان کردووم .

کاک حەمە جەزا؛ ئەوەندەی "دەنگی" خۆشە ئەتوانم بڵێم "قسە"کانیشی زیاتر خۆشن. دانیشتن لەگەڵ حەمە جەزادا بەمەرجێ باری دەروونیی باشبێ و میزاجی کوردەواری تێکنەچووبێ، هەر تەواو خۆش‌و بەتام‌و چێژە. کتومت وەک ئەو قبوڵی و تاسکەبابی و پلاوو قەزاتمانەی لێی ئەنێ و دەم و دەستی پێوە ئەخورێ!. هەر تەواو پێچەوانەی دەست و پێ سپێتی منن .!

لە یەکەم چوونە دەرەوەمدا بۆ شاخ‌و لەسەردەمی شۆڕشی نوێدا، ڕێمکەوتە گوندی "قزلەر"، ئەوکاتە کاک حەمە جەزا لەوێ ماڵی خۆی هەبوو. بەتەنیایش بوو، بەڵام لەڕووی ماڵداریی و خواردنەوە تەنیایی پێوە دیارنەبوو. ئەو یەکێکە لەهاوڕێ دێرینەکانم. کەسانی وەکوو ئەو و کاکە "حەمەی نێرگز" و کاک "ئەحمەدی حەمکوڵ" بیرناچنەوە .

هەر لە نەوەداکاندا بوو، دانیمارکییەکان بانگهێشتی "کۆپنهاگن"یانکردم. جگە لەکۆڕی شیعر خوێندنەوەی پایتەخت بۆ ماوەی هەفتەیەک، بەئۆتۆمبێلی خۆیان و بەیاوەری دووسێ دانیمارکی، کە یەکێکیان شاعیر بوو، سەفەرێکیان بۆ گەڕان بەدانیمارکدا بۆ ڕێکخستین.

کاک حەمە جەزاو چەند هونەرمەندێکی تریشیان وەک تیپی موزیک‌و گۆرانی لەبەرنامەی ئەم گەشتەدا دانابوو. ڕووومانکردە دوورگەو شارەکانی باکووری دانیمارک، لەدووسێ شار کۆڕی شیعر خوێندنەوەو گۆرانی و موزیکی کوردیمان ڕێکخست. کاک حەمە جەزاو قسە خۆشەکانی ئەم سەفەرەیان ئەوەندەی تر خۆشکردبوو. نەمانئەزانی وەخت چۆن ئەڕوا. بۆ مشوور خواردنی، خواردنیش، ئەوە ئیتر کاک حەمە جەزا خۆی لە سۆراخدا بوو. بەر لەوەی بگەینە هەر شارێک، بەتەلەفۆن ماڵە کوردێکی ئاگادار ئەکردەوە کەوا ئیتر ئێمە بەڕێوەین و نانی نیوەڕۆتان لەلا ئەخۆین. پێشی ئەوتن چی لێنێن!، یان ئەیوت باکەس لەماڵەکەدا نەمێنێ موبەق و ژووری زەخیرە بۆ خۆم بەجێبهێڵن. ئیتر وەختێ ئەگەیشتین حەمە جەزا؛ قۆڵی لێهەڵئەماڵی‌و دەستی ئەکرد بەئێشکردن و لێنانی چێشتە نایابەکانی. بۆ خواردنی هەر ماڵێکیش نمرەی بۆ

کەیبانووەکە دائەنا، بۆ نموونە ئەیوت: "هەشتا لە سەد، یان حەفتا". جارێکیان لەماڵێکیان خواردنەکە زۆر باش نەبوو، بۆیە "وتی شەست و پێنج" دوایی کە هاتینە دەرەوە پێی وتم: (ناچاربووم لەم غەریبییەدا موجامەلەی بکەم، ئەگینا لەچل زیاتری وەرنەئەگرت!) جاری واش هەبوو، نێوان دووشار ڕێیەکی دوورودرێژی هەبوو، حەمە جەزا پێشتر مشووری خواردبوو، وەختێ ئەگەیشتینە دەرەوەی شارەکە، ئەمانبینی یەکێک بەدوو سەفەر تاسییەوە وەستاوەو چاوەڕوانمان ئەکات. حەمە جەزا دائەبەزی و سەفەرتاسییەکانی لێوەرئەگرت و ئەهاتەوە ناو ئۆتۆمبێلەکە و ئەیوت: (ئەم نیوەڕۆیەشمان مسۆگەرکردو لەخواردنە ساردو ناخۆشەکانی دانیمارکی ڕزگارمان بوو) .!

چەند جارێکیش لەستۆکهۆڵم یەکترمان بینی، ئەو کەسانەی کاربکەن درەنگ ئەگەڕێنەوە ماڵەوەو عەسرێکی درەنگ نان ئەخۆن. ئەمەیش بۆ من و حەمە جەزا دەستی نەئەدا، بۆیە جارێکیان وتی: (ئەم کوردانەی سوید ژەمێکیان خستۆتە ژێر پێیانەوە!) .

هاوڕێیەتی لەگەڵ حەمە جەزاداو سەفەرو دانیشتن لەگەڵ ئەودا میزاجی کوردەواری گەش ئەکاتەوە!. لەو سەفەرانەی دانیمارکدا جگە لەوەی چەند جارێک ڕۆژنامەکان باسیانکردمو بایەخیان پێدام، دووجاریش بۆ ڕادیۆ چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا کردووەو پەخشیانکردووە. لەناو شاعیرانی عەرەبی عێراقیشدا، "جەمال مستەفا" یەکێک بوو لەو شاعیرانەی زۆرجار نامەو کارتی بۆ ئەناردم و پەیوەندیمان بەردەوامبوو.

من؛ خاوەنی سەری خۆم بووم و
ئەوانیش بەچۆکدا هاتن!

ئەو شیعرانەی لەدوای چوونە دەرەوەی وڵاتو تائەوکاتە ئەمنووسین، هەر درێژەپێدانی ئەزموونەکەی شاخ بوون. هەڵەبجە و ئەنفال بوون بەهەوێنی زۆربەی زۆری ئەو شیعرانەی دوایی .

شەهیدکردنی کاک "ئازاد هەورامی" قەسیدەی "تەمتوومان"ی پێ نووسیم. لەلایەکی تریشەوە لەسەر نووسینی کورتە شیعرەکانم بەردەوامبووم لەشام و ئیتاڵیاو ئەو ساڵەی سویدیش، ژمارەی شیعرەکانی "ئاوێنە بچکۆلەکان" لەزیاد بووندابوون، بەڵام وەرچەرخانێکی تازەی شیعرم نەبوو. یان ئەزموون و تاقیکردنەوەیەکی جیا لەچەند ساڵی ڕابوردووم .

گەرای غوربەتێکی شیعریم تێدابوو، بەڵام نەبوو بەقەسیدەیەکی کامڵ تا دووسێ ساڵ دواتر. هەستم ئەکرد پێویستە هەژاندنێکی نوێ درِ بەو دنیایەی ترم بداتو ئاسۆیەکی تازە لەسەر زمانو خەیاڵم بکاتەوە. لەدڵی خۆمدا ئەموت: (کاری نوێ، زمانی نوێ، خەیاڵی نوێ و ژانری پەی پێ نەبراوم ئەوێ)!. بەردەوام لەخۆ خواردنەوەدا بووم. پێئەچوو هێشتا کاریگەرییە دەروونیو شارستانییەکەی ڕۆژئاوا، بەر یەککەوتنی ئەو کەلتوورەو بیری من لەسەرەتادا بنو لەخەیاڵدانی شیعرمدا بێ ڕەنگبن. گوێگری کۆڕەکانی دەرەوەی وڵات بریتیبوون لەو کوردە ئاوارانەی تائەوکاتە هێشتا تۆزو خۆڵ و ڕەنگی

کارەساتەکانی وڵات بەسیمایانەوە دیاربوو. بۆیە ئەو شیعرانە، کوێرە کانییەکانی دەروونیانی ئەتەقاندەوە، سۆزیانی ئەهەژاند، ئەیگریانن و ئەوەی ئەوان لەناو دڵیاندا بوو، خۆیان نەیانئەتوانی دەریبڕن، من دەرمئەبڕین و لەڕێی شیعرەوە ئاوێزانی ئەبوون .!

شیعری من لەو چەند ساڵەداو لای کوردی ئاوارەی ئەوروپا، کاریان بۆ "لەبیرنەچوونەوە"ی ئەوانی تری جێهێڵراو ئەکرد. یان بۆ ئەوانەی لەڕێی بەخشینی گیانەوە بەهایەکیان دابوو بەژیان و ئازادی و هیوایەک بەپاشەڕۆژ. یان بۆ خاکێک؛ کە هەموو کوردێ کەمتازۆر لەچاوی خۆشەویستی و پەیوەندارییەوە تەماشای ئەکات. منی شاعیر؛ لە سەردەمی ئەنفال و هەڵەبجەدا نوسیومەو ژیاوم و نەمتوانیوە چاو بپۆشم و بێدەنگبم. هەندێجاریش بەدەنگی بەرز هاوارم کردووە. ئەمە بەشێک بووە لەپەیامی شیعری من. لەجومگە مەترسیدارەکانداو وەختێ چارەنووسی میللەتێک گەمەی پێکراوەو بەبڕیاری سەرکردەیەک یان چەند کەسێک فڕێدراوەتە گێژەنی فەوتانەوە، نەمتوانیوە هاواری خۆم نەکەم. ئەمە جیاوازییەکی دیاری نێوان منو هەندێ لەشاعیرانی تربووە. هەرەسی شۆڕشی ئەیلول و خۆ بەدەستەوەدان بەئێران یان بە عێراق، منی لەڕەگو ڕیشەوە هەڵتەکان، بۆیە وەختێ "کۆچ" یان "داستانی هەڵۆی سوور"م نووسی، نەمتوانی بەر لەتەوژمەکانی دەروونی خۆم بگرم! گوێمنەدایە ئەوەی ئەو شیعرانە لەپاشە ڕۆژی نزیک و دووردا چەندەم لەسەر ئەکەون!. من؛ بۆ سیاسەت شیعرم نەنووسیوە، بەو مانایەی حزبیەک بیری لێئەکاتەوە، بۆ مەسەلەیەکم نووسیوە کەچارەنووسی زمان و شیعریشی پێوە بەستراوە. ناکرێ لەچاوی ساتەوەختەکانی ئەمڕۆوە تەماشای ئەو ڕۆژگارانە بکرێ .

ئاخر؛ خۆ کەهەندێ شاعیری تر لەو سەردەمانەدا هیچیان بۆ ئەو مەسەلانە نەنووسیوە، لەبەر ئەوە نەبووە شیعر بارگاوی نەکەن بەسیاسەت، بەڵکوو چ لەبەر ڕژێم و چ لەبەر ئەو سەرکردایەتییانە، نەیانوێراوە هیچ بڵێنو خاوەن هەڵوێستێکی دیار نەبوونو بێدەنگ بوون. لەمەیش زیاتر لەدوای ڕاپەڕینی (۱۹۹۱)ەوە لە ساڵانی حکومەتەکانی هەرێمی کوردستاندا چ لە هەولێرو چ لەسلێمانی، ئێمە بەچاوی خۆمان بەشی زۆری ئەو ئەدیب و شاعیر و ڕووناکبیرانەمان بینی، کە چۆن لەبەردەمی دەسەلاتداراندا بەچۆکدا هاتن و لەبەر پارەو پوولو دەم و چەورکردنی زیاد، لەماوەی بیستو چوار سەعاتدا

هەموو ڕابوردووی خۆیان خستە ژێر پێوەو بوون بەبووکە سەماکەرەی سیاسییەکان .!

بەکردەوە پەراوێزێکی بچووکی بێ نرخی ئەوان بوون و بەڵام بەنووسین یاخی بووی ناو زمانو شیعر و تازەگەری و داهێنان بوون! بەکردەوەو لە ئاستی ئەواندا بێدەنگ و زەلیل و دەست لەسەر سنگ و بەڵام بەچیرۆک و شیعر و وتارو دیدار، مۆدێرن و خاوەن قسەی زل زلی سەرکاغەزو سنوور بەزینی ناو ئەدەبی کوردی و ڕچەشکێنی شیعری ئەم سەردەمە بوون!. "هەڵمەتە کاسە" کوتومت ئەوان بوون .

جارێکیان بەئامادەبوونی زیاد لەدوانزە سیانزە ئەدیب لای "مام جەلال" بووین، یەکێک لەوانە ڕوویکردە مام جەلال و پێیوت: (مام جەلال حەز ئەکەم ئەوە بزانیت من یەکێتی نیم، من جەلالیم جەلالی!). بەناوی پرۆژەی ئەدەبی و دامەزراندنی ئەو سەنتەرو ئەو ماڵ و ئەو کۆڕی زانیاری و ئەو ڕێکخراوو بنکەوە، چییان وەرنەگرت و چییان نەخوارد!. کەچی لەملای ترەوە، گاڵتەیان بەو شیعرو چیرۆکانە ئەکرد، کە ئێمەو مانان بۆ شەهیدێ یان کارەساتێ یان بۆنەیەکی پاکمان ئەنووسی و سەرچاوەیشیان هەر دڵ و دەروونی خۆمان بوون .!

بەشێکی لەبەرچاوی ئەو هەڵمەتە کاسانە، بۆ پەردەپۆشی ئاکارەکانی خۆیان، کەوتنە گەمەکردن بەسۆز و هەستی خەڵکی و لەولای تریشەوە کارمەندێکی بێدەنگی عاقڵ و لەسەرخۆی بەردەمی سەرکردە و حزبەکان بوون .!

لەسەرەتای هەشتاکانەوە هەتا ئەمڕۆ، بەشارو شاخەوەو دەرەوەی وڵاتیشەوە، لەڕووی هەڵوێستی سیاسیەوە، من خۆم بەدۆستێکی نزیکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان زانیوەو نەمشاردۆتەوە، بەڵام من دۆستێکی ماستاوچی نەبووم!. هەمیشەیش ماوەیەکم لەنێوان خۆم و ئەواندا هێشتۆتەوە، بەچاکیانم وتووە چاک و بەخراپیشیانم وتووە خراپ .

ئەوە من و ئەوە هەموو ئەو ئەدیب و نووسەرانەی کەتائێستەیش لەژیاندان، بێ منەتم لەهەموویان، ئەگەر ڕۆژێ لەڕۆژان لەبەردەمی "مام جەلال" و هەرکام لەو سیاسییانەدا، قسەیەکم کردبێ بۆنی بچووککردنەوەی خۆم و قەتیسکردنی ئەوانی لێهاتبێ. یان ڕووبەڕوو ڕەخنەی خۆم نەگرتبێ. جا لەکۆڕو دانیشتنی

تایبەتیدا بوو‌بێت، یان لەو نامانەدا کە بۆمناردوون، یان بە ئاشکرا لەڕێی ڕۆژنامەکانەوە .

دۆستێکی نزیکیانبووم، بەڵام هەمیشە خاوەنی کەسایەتی خۆم و سەری خۆم بووم. ڕێزیان لێگرتووم و ڕێزم لێگرتوون. لە هەڵەو خەوشەکانیان بێدەنگ نەبووم و لەهەمانکاتیشدا لەئاست جوامێری و قوربانییەکانیان و مێژووی موقاوەمەت و خەباتیانداو لەڕۆژگارە هەرە سەخت و دژوارەکاندا سرووودی خۆم بۆ وتوون .

بیست و دوو ساڵی تەواوە "مام جەلال" ئەناسم و بەبرای گەورەو هاوڕێی خۆمی ئەزانمو بەڵام یەک دێڕیشم بۆ کەسایەتی خۆی نەنووسیوە! چەند جارێ لەکەشکۆڵی پێشمەرگەو شیعری "سروود"دا، ئاماژەم بە ناوی "ی. ن. ک" و "کۆمەڵە" کردووە. ئەو سەردەمەی بەناوی نهێنی "جوامێر"ەوە ئەمنووسی و لە شاردا بووم و ئەگەر دوژمن بەمەی بزانیایە باجەکەی هەر کەللەسەری خۆم ئەبوو. هەروەها لەساڵانی (١٩٨٥-١٩٨٦)دا، ئەو وەختەی لەشاخ بوومو پێشمەرگە لەشەڕی دەستەویەخەی مردن و ژیاندا بوو. ئێمە و مانانیش هەر قەڵەمەکەو ئەوانمان هەبوون. لەساڵانی دواتریشدا شیعرێکم و چەند پەخشانێکی ترم بوونە هۆی ئەوەی نەیارەکانم بۆ مەبەستی شاراوەی خۆیان بیقۆزنەوەو تیروتوانجم تێبگرن....! یەکەمیان: ئەو پەخشانەی لەسەردەمی یەکەم هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستاندا نووسیبووم "دەنگبدە بەسەوز دەنگبدە بەهەق" ئاشکرایە من ئەو وەختە لەسەر لیستی سەوز وەک شاعیرێکی سەربەخۆ خۆم پاڵاوتبوو بۆ پەرلەمانی کوردستان. پێموایە هەر کەسێکیش دنیای دیبێ، ئەزانێ، کە هەموو پاڵێوراوێ هەقێکی ڕەواو دیموکراتی خۆیەتی بانگەشە بۆ خۆی یان ئەو لیستە بکات، کە تێیدایەتی .

من لەو ڕوانگەیەوە ئەو بانگەشەی پەخشانەم نووسیبوو، بەڵام من ڕەخنە لەخۆم ئەگرم، کە نەئەبوو لەبنەڕەتدا بینووسم، چونکە لایەکی تاریکی ئەو نووسینە لەوەدا بوو، سەربەخۆیی خۆم تیاونکرد و نووسینەکە بەتەنها لە قازانجی تەرەفێک کەوتەوە!

دووەم: لەساڵی (١٩٩٢-١٩٩٣)دا ،سەرەتای مەترسیی لەشکری چەکداری بزووتنەوەی ئیسلامی بەئاشکرا هەڕەشەی لەهەموو ئازادییەکی تاک و کۆمەڵ ئەکردو بوونی حکومەتی هەرێمی کوردستانی خستبووە گێژاوەوە! ئەوەبوو هێزی پێشمەرگەی کوردستان، لەناوچەی پشدەرو قەڵادزێ، بەڕێبەرێتی کاک

"جەبار فەرمان" هێرشی کردە سەریان‌و ڕاوینان‌و ناوچەکەی لێپاککردنەوە. ئەم سەرکەوتنە بووە هەوێنی شیعرێکم .

شیعرەکەم پێشکەش بەکاک "جەبار" کردبوو. ئەم پێشکەشکردنی شیعرەیش دەهۆڵی بۆ لێدرا! بەڵام من تا ئەم دەقیقەیەش ئەو پێشکەشکردنە بەخەوشی نازانم چونکە ئەوە واقیعی ئەو ڕووداوو بەسەرهاتانە بوو لەو ڕۆژگارەدا.

سێهەم: هەروەکوو پێشتریش باسمکردبوو، لەئەنجامی زۆر ناسراویمەوە وەک شاعیرێ، چ لەشاخ و چ لە شار، لەزۆربونەو ڕووداوو کارەسات‌و شەهیدبووندا، ئەو خەڵکە ڕووم تێئەکەن و داوای شیعرم لێئەکەن، بۆ ئازیزەکانی خۆیان. بەکورتی تووشی هەڵوێستێکی وەک کۆڵانی دەرنەچوو ئەبم. ئەینووسم هەر وەی! نایشینووسم هەروەی!. ئەگەر بڵێم ناینووسم ئەبێتە مایەی دڵ ڕەنجان، ئەم ڕەتکردنەوەیەش لەکۆمەڵی ئێمەدا سەخت‌و گرانە. ئەگەر ئەشینووسیی ئەوسا ئەبێ باجی تری سیاسی و ئەدەبی بدەیت، ئەمەیشیان ناخۆشتر .!

من؛ کاک "کۆسرەت ڕەسوڵ عەلی" لەشاخەوە ئەناسم، یەکێک بوو لەپێشمەرگە ئازاکان و لەچەندین نەبەردی گەورەدا بووە. دواتریش لەحکومەتی هەرێمی کوردستانداو لەو خولەیدا، کە من وەزیری ڕۆشنبیری بووم و لێی کشامەوە، ئەو سەرۆک وەزیران بوو. جگە لەمانەیش ئەوە چەند ساڵە دراوسێی یەکترین. (ڕێباز)ی کوڕە گەورەی لەبەسەرهاتێکی ناخۆشدا لەدوکان فەوتیکرد. من ئەو کاتە لەسوید بووم، لەڕێی هاوڕێیەکی هەردووکمانەوە، داوای نووسینێکی لێکردبووم. منیش پەخشانێکم بۆ ئەو جوانەمەرگە نووسیبوو. لاواندنەوەیەک بوو. نەمەتح‌و سەنای باوکیم کردووەو نەموحتاجی ئەوەش بووم، بەڵام نەیاران کەوتنە تەقە لێم، تەنها لەبەرئەوەی فرمێسکم بۆ کوڕی ئەو ڕشتووە. ئەی بۆ نابێ؟! گوناهە؟! خەوشە؟!

لەڕووی مادییەوە موحتاجی کەس نیم و ئەوەی هەمە سەروزیادە، مووچەی خانەنشینی وەزیری وەرئەگرم و هەروەها مووچەی سەرپەرشتیکردنی دەزگای چاپ و پەخشی "سەردەم"یش. ماڵ و منداڵیشم لەدەرەوەی وڵات ژیانیان زۆر باشەو هەریەکەو کاری باشی خۆی هەیە .!

من؛ تەنها و تەنها شوێن هەستی مرۆڤانەی خۆم کەوتووم و بەس. لە سلەیمانیش دوایئەوەی لەساڵی (١٩٩٨)دا جارێکی تر گەڕامەوە، کاک "کۆسرەت ڕەسوڵ" داوای ئەوەی لێکردم ببمە وەزیری دەوڵەت لەکابینەکەیدا، بەڵام من

پێموتن: (ببورە ئەوە یەکەمجارو دواجارم بوو، هەرگیز جارێکی دی هیچ پلەو پایەیەک نە لەم حکومەتەدا و نە لەحکومەتەکانی داهاتوویشدا وەرناگرم).
ئەم بەخۆدا چوونەوەیە پێویست بوو! وەک ئاکامیش من لەو هەڵوێست و ڕۆژگارانەدا، لەو شیعرو پەخشانانەدا، کە باسمکردن، ڕاست بووبم یان هەڵە، خراپم کردبێ یان چاک، نە ئەبوو بەسەریاندا بازبدەم و وەکوو خۆیان چۆن بوون بۆ ئێوەی نەگێڕمەوە .

کەسێ نییە بێ خەوش بێ، کەسێ نییە هەڵە نەکات، شاعیرێ نییە لەسەرجەمی بەرهەمەکانی خۆی ڕازیبێت، بەڵام سوپاس بۆ خواو بۆ شیعری بێکەس و بۆ میللەتەکەم، کە من هەڵەو خەوشەکانم هەر لەناو ماڵی کورد خۆیدا بووە. هەر لەنێو شۆڕشەکانیدا بووەو قابیلی چاوپێداگێڕانەوەو ڕاستکردنەوە بوون و خۆم ددانم پێدا ناون. بۆ شیعری جوان و ناشرینیش ئەوە ئیتر سەردەم خۆی لە هێڵەکیان ئەداو هونەرییان ئەمێننەوەو بێ هونەریشیان لەبیر ئەچێتەوە، بەڵام ئەوەی بەلای منەوە جەوهەردارەو نەقابیلی پاساو بۆ هێنانەوەیەو نەڕاستکردنەوەیەو ئەشبێتە مۆری ئەبەدی سەر تەوێڵ: (شیعر بۆ دوژمن، بۆ سوڵتەی داگیرکەر، نووسینە بۆ شەڕەکانیان، ئامادەکردنە بەقادسییەکانیان، وەرگرتنی خەلاتەکانیانە، خۆ تەسلیم کردنەوەیە بەوان. هەڵگرتنی چەقۆو فیشەکێکی ئەوانە، وەرگرتنی پلەوپایەی ئەوانە، سازشە لەگەڵ ئەوان. بەڵکو بەپێچەوانەوە، بێدەنگ نەبوونەو چوونەوەیە بەگژیاندا).

شەوێک لەشاری شەراب،
تاوێک لەبیری گەندەڵی کۆمۆنیستەکان!..

ئەگەڕێمەوە بۆ ساڵی (١٩٨٨)و یەکەمین زنجیرەی ئەو سەفەرە درێژەی بە ئەوروپادا کردم. هەر ئەو ساڵە یان دواتر بوو، لە لەندەن هونەرمەندی شێوەکار "ڕێبوار سەعید"م بینیەوە. ئەم هونەرمەندە بەر لەوەی بگاتە دەرەوەی وڵات، ئەویش بۆ ماوەیەک لەناو برادەرەکانی ئێمەداو هەر لە شاخ ببوو. پێموایە یەکدوو پێشانگەیشم هەر لەسلەیمانی دیبوو. لەناو وێنەکێشەکاندا من شێوازی کارکردن و هونەری ڕێبوارم لاپەسەندەو پێخۆشە. چونکە لەیەک کاتدا سادەیەو قوڵیشە، واقیعەو ئەندێشەیە، کەلتوورەو نوێخوازیشە جگە لەوەی ڕێبوار بەردەوام لەگەڵ قوربانییەکانی نەتەوەکەی‌و مەسەلەی ڕەوای میللەتەکەیدا بووە. هونەرمەندێکی لاتەریک‌و گۆشەگیری ناو ژووری خۆی نەبووە. ئازارەکان لەنێو ڕەنگەکان و پەنجەکانیدا بەردەوام ڕسکاون. خولیا تایبەتییەکانی خۆی لەنێو خولیا گشتییەکاندا بوونەتە هێڵ و ئاسۆی تابلۆکان. ئەم هونەرمەندە یەکێکە لەچالاکترین هونەرمەندەکانی کورد .

هەموو ساڵێ مێرگێکی تازەی هونەری کردووە بەدیاری دەستی‌و داوێتی بەهەمووومان، هەر جارەو پرۆژەیەک‌و دەیان پەنجەرەی نوێ لەماڵی هونەری کورددا کردۆتەوە. پرۆژەی "باڵندە بارانەکە"ی خۆی و هاوڕێکانی تەواوی سنوورەکانی دنیایان بەزاند .

ئەنفال و هەڵەبجە؛ لە کەرنەڤاڵەکانی ئەم هونەرمەندە بەخشندەیەدا بەردەوام لەهاتوچۆدان‌و هەر جارەی لەبالا ئاوێنەی هونەرێکی بەرزدا خۆیان ئەنوێنن. هونەری ڕێبوار سەعید؛ بەتەنها هونەرێکی ڕووتی تەجریدی نەبووە، هەروەکوو چۆن هونەرێکی واقیعی ڕاستەوخۆو زەق نەبووە. ئاوێتەیەک بووە لەهونەرو پەیام. ئەزانێ چی ئەڵێ و بۆ ئەیڵێ و چۆنی ئەیڵێ! ئەو سێکوچکەیەی کە لە هونەرو ئەدەبی ئێمەدا، بەدەگمەن دەرکەوتوون و پەییان پێبراوە.

ئەگەر وێنەکێش بوومایە خوازیاربووم وەکوو ئەوبوومایە! هونەری ڕێبوار لەڕۆحی منەوە زۆر نزیکە. من وا هەستئەکەم قەسیدەکانی منن و بوون بەهێڵ و ڕەنگ و چوونەتە نێو ئەو تابلۆیانەوە. هەرجارێ چووبم بۆ لەندەن پێشانگایەکی تازەی هەبووە. بیرو بیرۆکەی تازەی لابووە. پەنجەکانی ئەوو (با) پێکەوە جوڵاونەتەوە. دڵ ئەوو دڵی داروبەردی کوردستان بەیەکەوە ترپەیان هاتووە. من پێموایە ڕێبوار لەخەوتنیشدا هەر خەریکی وێنەکێشانە. لەماڵی خۆیدا میوانداری کردووم. گەڕاندوومی و بەدەستمەوە ماندووبووە. لەساڵی (٢٠٠٠)یشدا پێکەوە پرۆژەی دوو هەزار وشەمان بەئەنجامداو بڵاوبۆوەو لەسەری نووسراو پێموایە کاک کەمال "میراودەلی"ش وەریگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی، پەیوەندیو خۆشەویستیمان بەردەوامە.

هەر لەیەکەم سەفەردا بوو، پێکەوە "من و ئازادی کاک مستەفاو سامی شۆڕش و کاک کامیل دارتاش" چووین بۆ شاری "ستارتفۆرد". ئەو شوێنەی، کە گەورە شاعیری ئینگلیزو دنیا "شکسپیر"ی لێ ژیاوە. لەهەموو دنیاوە گەڕیدەکان ڕووی تێئەکەن. ڕۆژێکی تەواومان لەوێ بەسەربرد. هەواری شکسپیرو خانوەکەی و ئەو ژوورو داڵان و هەیوان و باخچەیەمان بینی کەشکسپیر تیایدا دانیشتووەو تیایدا نووستوەو پیاسەی تیایاندا کردووە. هەمان ئەو کەرەسەو شتومەکانەی لەو سەردەمەدا بەکاری هێناون. چەندین وێنەمان لەو هەوارەدا گرت .

مرۆڤ؛ لەشوێنی وادا تووشی جۆرێ لەڕامان و بیرکردنەوە ئەبێ وەک ئەوەی لەخەودابێ و بڕوابکاو نەیکا. پێش سەدان ساڵ ئا لەم حەوشەو ماڵەدا شکسپیر زیندووبووەو بەشێک لەشاکارەکانی خۆی لێرەدا نووسیووە، بەڵام ڕەنگە ئەو هەرگیز بیری لەوە نەکردبێتەوە، ئەوەی بەخەیاڵدا نەهاتبێ، کە لەدوای سەدان ساڵ بەهەزاران هەزار کەس لەهەموو دنیاوە ئەگەنە ئێرە بۆ ئەوەی ئەم شوێنەوارەی ببینن و وێنەیەکی لەبەردەمدا بگرن .

من؛ ئەو ڕۆژە وامئەزانی شکسپیر خۆی زیندووەو قسەمان لەگەڵدا ئەکات و باسی ئەو سەردەمەمان بۆ ئەکات. کەلتووری زیندوو، هونەرو ئەدەبی زیندوو، بەم شوێنەوارانەوە درێژە بەبوون و کاریگەری خۆیان ئەدەن‌و بیرناچنەوە.

**لەوێستگەی شەمەندەفەری "ڤیەننا" دابەزیم. وەختێ تەماشامکرد، کۆمەڵێ لە هاوڕێیان‌و دۆست‌و ناسیاوو شیعر دۆست، هاتبوون بەپیرمەوە، هەر هەموو دەم بەپێکەنین و باوەش پڕ لەگوڵ، یەکەیەکە باوەشیان پێدا کردم. "یەکە یەکە ناوەکانم ناکەوێتەوە بیر"، بەڵام ئەوکاتە کاک "سەعدی پیرە"و کاک "بەهرۆز گەلاڵی" و هونەرمەند "عومەر دزەیی" و کاک "خەباتی مەلا مارف" و "دکتۆر ئامانج"ی برای و "شێخ ئەحمەد" و "فەوزی مەلا مەحمود" و زۆری تر لەڤییەننا بوون .

فازڵی مەلا مەحمود؛ یەکێک بوو لەوانەی هاتبوو بەپیرمەوە، شەرواڵێکی کوردی لەبەرداو جووتێ کلاشیشی کردبوو بەسەر پێیەوە "ئەو دیمەنەم هەر لەبەرچاوە ."

من؛ لەدەستپێکەوە کاک فازڵ-م ئەناسی، کوڕی یەک شارو یەک گەڕەک‌و وەک بنەماڵەیش تێکەڵ‌و نزیک. من بەتەمەن لەو گەورەتر بووم، بەڵام دەمێک بوو نەمدیبوو، ئەو ساڵانەی دوایی ئەو دەنگ و باسانەم ئەبیستەوە، کە ئێستە کاک "فازڵ" بووە بەئیسلامی‌و لەنووسینگەی "بەنی سەدری" سەرۆک کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە زۆر نزیکەو هاوڕێی "ئەحمەد بن بیللا"ی سەرۆکی جەزائیری پێشووە، کە ئەو ساڵانە ببوو بەیەکێک لەڕێبەرە ئیسلامییەکان .!

هەڵبەت من بۆخۆم ئەو دەنگ‌و باسانەم پێ سەیر بوو! چونکە کاک فازڵ؛ یەکێک بوو لەمارکسییە چالاکەکان. ڕۆژگارێکیش کە لەڕێکخستنەکانی قیادەی مەرکەزیدا بەنهێنی کاری ئەکرد، ناوبەناو بۆ شوێن ونی ئەهات بۆ ماڵی ئێمە!. ئەو ماوەیەی لەڤیەننادا مامەوە لەماڵی کاک "خەباتی مەلا مارف" میوانبووم، خۆی‌و "د. ئامانج"ی برای پێکەوە ئەژیان، ماڵەکە گەورەبوو. لەناوجەرگەی شارەکەیشدا بوو .

ڤیەننا؛ شارێکی جوان و ئێسک سووک و پاک و خاوێن بوو. گۆڕەپان و شەقام و باخچەکانی ئەبریسکانەوە. کاک خەبات؛ چێشتخانەیەکی خۆی هەبوو، هەر خۆیشی سەرپەرشتی کاروبارەکانی ئەکرد. ناوبەناو لەوێش سەرمان لێئەدا. چەند جارێکیش لەگەڵ کاک "سەعدی پیرە"دا پێکەوە ئەچووینە کافتریا

خۆشەکانی ڤیەننا. بۆ یەکەمجاریش لەوێ هاوسەرەکەیم ناسی. وەختێکیش هەرسێکمان بەیەکەوە دائەنیشتین، بەجگەرەکێشان ژوورو ناو هۆڵەکانمان قان ئەدا .!

ژنەکەی کاک سەعدی؛ ئەوکاتە دووگیان بوو، دواتر کە گەڕامەوە سوید کاک سەعدی نامەیەکی بۆ ناردبووم، کە ئیتر بەو زوانە منداڵیان ئەبێ و داوای ئەوەی کردبوو، منیش ناوێکی کوردی خۆشیان بۆ بدۆزمەوە. وەلامم دایەوە: (هەرچەند بیرم لێکردنەوەو دیمەنی بەردەوام جگەرەکێشانی هاوسەرەکەیم هاتەوە بەرچاو، بەلای منەوە وا باشە یەکێک لەم ناوانە لەمنداڵەکەتان بنێن: "تووتن، دووکەڵ، تەپڵەک، سوتوو، پاکەت، فلتەر یان کۆکە"!).

لەدەوروبەری ڤییەننا، شوێنەواری مێژوویی ئەو شەڕو شۆڕو غەزایانەم بینی کە لەشکری ئیسلام لەسەردەمی عوسمانییەکاندا گەیشتبوونێ. واتە هاتنیان تالێواری ڤییەننا. لەدڵی خۆمدا وتم: (چاکبوو ئەو لەشکرو دەسەلاتە، بەزیوو مایە پووچ دەرچوون، ئەگینا ئێستا لەوانەبوو ئەم ڤییەننا جوانەیش مانتۆیەکی درێژی لەبەردابوایەو یان لەچکێکی قەلە ڕەش ئاسای ببەستایەو یاخود شارێکی ڕیشن و جبە بەشان بوایەو لەڕەنگی ڕەش بەولاوە ڕەنگێکی ترمان نەدیبایە!).

لە "گرینسێ"، کە من ناوی شاری شەرابم لێنابوو، دڵم ئەکرایەوە. حەزمئەکرد شەوانە لەوێبم. بەشەقامەکانیا پیاسەبکەمو ئەو هەمو گەڕیدەو گەشتکەرانە ببینم، کە لەچوارقوڕنەی دنیاوە ئەهاتنو لەوێ ئەتبینینەوە. باڕو مەیخانەکان، لەسەر تەرزی تازەو مۆدێرن دروست نەکرابوون. بەڵکوو نەخشی بیناسازی سەدەکانی ناوەڕاست دیکۆریان بوو. وەختێ خۆت ئەکرد بەشەرابخانەیەکدا، هەستت ئەکرد گەڕاویتەوە بۆ چەند سەدەیەک لەوەوبەرو لەو کەش و هەوایەدا دانیشتوویت، کەسوارەو عەرەبانچییەکانی ئەو زەمانە تیایدا بوون. نەخشی سەر دیوارەکان هەمووی هەر ئەسپ سوارو بوقی درێژو لوولە تۆپی لەشکرەکانی ئەو وەختەو شیری درێژ و لەولای ترەوە وێنەی مریەمی پاکیزەو مانگی هەڵهاتووی پشت سەری و مێزەکەی بەردەمت لەشێوەی بەرمیلی تەختەی جاران و مەیگێڕیش لەو ساقییە شۆخ و شەنگانەی خەیام باسیان ئەکات .

هەموو شتێ نوقم لەناو کەلتووری ڕەنگینداو تەنانەت هەندێ لەگەڕیدەکانیش پۆشاکی ئەو سەدانەیان پۆشیبوو. دوای چەند شەوێو لەشوێنێکی وەک ئەوێدا، ئەو هاوڕێو دۆستو ئازیزانەی ڤیەننا بەبۆنەی هاتنی منەوە، شەوێکی ئێجگار خۆش و دڵگیریان پێکهێنا. هەڵبەت من ناوی یەکەیەکەی ئەو دۆست و ئازیزانەم

بیرنەماوە. لەو شەوەدا هونەرمەندی ناسراو کاکە "عومەر دزەیی" و هاوسەرەکەی "ڕووناک" خان و کاک "سەعدی پیرە"و کاک "بەهرۆز گەلالی" و کاک "خەبات" و د. "ئامانج" و "شێخ ئەحمەد"ی قسەخۆش و "گێلاس" خانی خانەقاو زۆری تریش بوون، بەکورتی نزیکەی پانزە بیست کەس ئەبووین. قسەی خۆش، شیعر، موزیک، گۆرانیی، شەرابی بەهەشتیی، ژنی جوان، چراکانی ئەو شەوە بوون. کاکە عومەر دزەیی و یادگارەکانی دەشتی دزەیی و حەیران و شیعری فۆلکلۆری وەختی جۆ و درەوو مانگەشەوو بووک بردن و ڕەشبەڵەک .

کاک عومەر؛ بەتەنها هەر هونەرمەندێکی دەنگخۆش نییە، بەڵکوو شارەزاییەکی فرە لایەنی لەکەلتووری کوردو بەتایبەتی دەشتی هەولێرو دزەییدا هەیە. بەوردی ئاگای لەداب و نەریتو پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانی ڕابوردووی ئەو دەڤەرە هەیە. بەشی زۆری ئەم زانیارییانەی خۆیشی بەشیعری میللی هۆنیوەتەوە. دانیشتن لەگەڵ کاک عومەردا ،وەڕسبوونی تێدا نییە. ئەو شەوەیش دوایئەوەی شەرابی سوور ڕەنگی ئاڵ هەڵگەڕانین، کاکە هۆمەر؛ بەدەنگە خۆشەکەی خۆی تێیچریکانو تادرەنگانێ ئەوەی ئەیوت نەیئەوتەوە. من ئەو شەوەو ئەو کۆڕەو ئەو گۆرانییانەو ئەو ئازیزانەم هەرگیز بیرناچێتەوە.

ئەو ماڵە کوردانەی ئەو کاتە لەوێبوون، یەک لەدوای یەک بانگهێشتی لای خۆیان کردم. چ ئەو سەفەرەو چ سەفەرەکانی دواتر، زۆریان منیان بەسەرکردەوە. لەوانە ماڵی کاک "فەوزی مەلا مەحمود" و ماڵی کاک "دیاری کوڕی عەبدوڵلا میدیا" و هەر لەوێش بۆ یەکەمجار دوای چەندین ساڵ کاک "قوبادی مەلا ڕەسول"م بینیەوە. هەروەها هاوڕێی خۆشەویستم کاکە "کوردۆ عەلی" نووسەرو وەرگێڕم هەر لەڤییەننا دییەوەو پێکەوە دانیشتین. پێموایە لەیەکەم سەفەریشداو لەیەکەم کۆڕی ڤیەننایشدا هەر ئامادەبوو. هەر لە هەمان ساڵدا، کاک "عارف تەیفور"یش بۆ نانی نیوەڕۆیەک داوەتی ماڵەوەی کردم. ئەو کاتە کاک "عارف" کاری حزبی نەئەکردو وەک بێلایەنێک بیروڕاکانی خۆی دەرئەبڕی. "نەسرین"خانی هاوسەریشی لەو ژنە سەلارو دەم و دوو شیرین و ڕێزدارو کەیبانووە دەگمەنانەیە، کە کورد واتەنێ "شەکرە ژنە"و لەو میوانداریيەدا ئەوەندە بەدەورووپشتما هاتووەو ئەوەندە ڕێزی گرتووم، هەرگیز لەبیریناکەم. ئەمەیش بەمانای ئەوە نییە لەنرخی میوانداریی‌و بەهای هەموو ئەو خوشکانەم کەمبکەمەوە کەڕوومکردۆتە ماڵەکانیان نا، بەڵام وێنەی نەسرین خانم لەخوشکەکانی خۆیشمدا نەبینیوە .

کاک فازڵی مەلا مەحمودیش؛ داوەتی ماڵەوەی کردم. ئەو ژوورەی لێی دانیشتبووم بەدیوارەکەی بەرامبەرمەوە بەخەتێکی کۆفی گەورەو لەچوارچێوەیەکدا "ئایەتەلکورسییەک" هەڵواسرابوو!. لەولای تریشەوە وێنەی قورئانێکی کراوە. لەدڵی خۆمدا ئەموت: (ئەمە چییە؟! تۆبڵێی بەڕاستی بێت؟!) ماوەیەک بێدەنگبووبووین، بەڵام من ئیتر خۆم پێڕانەگیراو ئەوەی لەدڵما بوو بە کاک فازڵم وت: (ئەریێ تۆ بەڕاستتە یان ئەمەیش هەر گەمەو تەکتیکێکی سیاسییە؟!). لەوەڵامدا وتی: (بەڕاستمە). وتم ئەی نوێژو ڕۆژوو؟ وتی: (ئەوانیش). وتم: (من دامنابوو پێکەوە لەبارە خۆشەکاندا دابنیشین!). وتی: (نا، ئێستە من وانیم) .

بەکورتی سەرمکردە سەریێو لەماڵی خۆیشیدا تۆزیێ پەستمکرد، بیرمە لەدواییدا وتی: (ئێمە زۆر ڕێگەو پەیامیمان تاقیکردەوە بائەمەیش تاقیبکەینەوەو زەرەر ناکەین). هەروەها بەگەرمییەکەوە وتی: (کاک شێرکۆ! من هەرچییەک بکەم بۆ کوردی ئەکەم، هەر ڕێگەیەک بگرم بۆ ئەوەیە بمگەیەنێتە ئەو شوێنەی ئازادی کوردی تێدا دەرئەکەویێ!). دوایئەوەی نانمان خوارد. کۆمەڵێ پرسیاری لێکردم. دەربارەی بارودۆخی شۆڕش‌و ژیانی پێشمەرگەو منیش لای خۆمەوە بەدورو درێژی ئەو ژیانەی نێو شاخ و داخ و نەبەردانەی ڕوویاندابوو بۆمگێڕایەوە. زۆری پێخۆش بوو. پێموت: (بۆ ناچیتەوە بۆ کوردستان؟!). لەوەڵامدا وتی: (ئەوە یەکێکە لەئامانجەکانم و هەر ئەبێ بگەمەوە کوردستان!). پرسیاری بنبیلا و بەنی سەدر و ئەوانەم لێپرسیێو لەوەڵامدا وتی: (باشە، باشتر نییە ئەوانە دۆستی مەسەلەی کوردبن، وەک لەوەی سەنگەرمان لێبگرن!).

ڕۆژی کۆڕی شیعر خوێندنەوەم دیاریکرا. پۆستەرێکی ئاسایی ڕەش و سپیشیان بۆ کردبوو، لەهۆڵێکی مام ناوەندیدا کورسییەکان کرابوون بەدوو بەشەوەو دانرابوون. نزیکەی دووسەدو پەنجا تا سیێ سەد کەسیێ ئامادەببوون. ئەوە بۆ ڤیەننا زۆربوو، بەشێکیان لەشارەکانی دیکەی نەمساو ئەڵەمانیاوە هاتبوون. لەبیرمە کاک فازڵ لەپشتی پشتەوە دانیشتبوو. دوایئەوەی نزیکەی هەفتەیەک لەڤیەننا مامەوە، چوومەوە هەمان وێستگەی شەمەندۆفێر، کاک فازڵ بەهەمان شەرواڵ و کڵاشەوە هاتبوو بۆ خواحافیزی لێکردنم .

بەداخەوە ئەوەدواجار بوو کە ئیتر کاک فازڵ ببینم. دواتر وەک هەمووان ئەزانین، هەر لەڤیەننا لەگەڵ "د. قاسملو"دا لەبۆسە بۆنانەوەیەکدا، لەلایەن دوژمنانی میللەتەکەمانەوە شەهیدکران.!

لەشەمەندۆفێرەکەدا، تاچەند دەقیقەیەک، بیرم لەوە ئەکردەوە هەمیشە پیاوی، دەمارگیرو دەروێش و ئەوپەڕگر، جاسەر بەهەر ئایدۆلۆژیاو بیروباوەڕێک بن. مارکسی بن، یان قەومی، یان دینی، ئەگەری هەڵگەڕانەوەی ترسناکییان لێچاوەڕوان ئەکرێ! بەڕاستی لەوڵاتی ئێمەداو لەڕۆژهەلاتدا بەگشتی ئەو ئایدۆلۆژییە شمولییانە، کە پێیانوایە هەموو ڕاستییەکان لە هەگبەی خۆیاندایە، زیانی گەورەیان بەو میللەتە هەژارانە گەیاندووە!

بادوور نەڕۆمو لەخۆمەوە دەستپێبکەم. ئەوکاتەی گەنجێکی خوێن گەرم بووم و لە کاژێکدا کارم ئەکرد، پێموابوو لەم دنیایەدا، هەر ئێمە ڕاستین و ئیتر هەموو ئەوانی تر درۆ ئەکەن! پێموابوو ئەگەر کوردێ وەکوو من بیرنەکاتەوە هەر کورد نییە! ئێمە لەو سەردەمەدا مەرحەبای ئاسایی یەکێکمان نەئەکرد ئەگەر بیانوتایە ئەوە کۆمۆنیستە یان پارتییە! هەر ئەو ئایدۆلۆژیا شمولییانەیش بوونو تائێستەیش هەموو پردێکی دیالۆگ و گفتوگۆو تێگەیشتنیان لەنێوان مرۆڤدا ڕوخان. ئەو نەهامەتییانەی بەسەر مرۆڤایەتیدا هاتوون ئەو عەقڵە داخراوو کڵۆمکراوانە سەرچاوەیان بوون. سەیرە هەندێک هەن شانازی بەو عەقڵەی جارانیانەوە ئەکەنو هەتا ئەمڕۆیش نایەنەوێ ڕەخنەیەکی جیدی لەخۆیان بگرن. عەقڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی کورد، هەمیشە عەقڵی پاشکۆی کەلتوورەکانی دەوروبەر بووە. ئەو وەختەی کورد بووە بەموسڵمان لە هەمووان دەمارگیرتربووە. کەبووە بە مارکسی موازییەدەی بەسەر عەرەب و فارس و تورکی مارکسییەوە کردووەو ویستوێتی لەوان توندوتیژتربێ. نەوەکانی پێش ئێمە لەکوردستانداو بەتایبەتی لەشاری سلەیمانیدا ساڵانێکی تەمەن و عەقڵی خۆیان بەخەساردا! وەختێ بەردەوام لەشەڕی یەخەگیری ئەوەدا بوون "کورد ئوممەیە یان ئومە نییە؟". ئێمە ئێستا تێئەگەین مارکسییەکانی ئێمە، نە ڕووناکبیر، بەڵکوو "ئوممی" بوونو کەچی ڕێبەرایەتی خەڵکیشیانکردووە. لەوەختی حوکمی تۆلیتارانەو دیکتاتۆریانەی "بریجنێف و تۆسجین"دا، تاقمێک لەڕووناکبیرانی کورد لەیەکێتی سۆڤییەتی جاران ئەیانخوێندو خۆیان لە نزیکەوە ئاگایان لەبارودۆخی ژیانی پڕ لەچەوسانەوەی ئەو میللەتە ژێر دەستانەی ئەوێبووەو ئاگایان لەگەندەڵی و عەقڵی نادیموکراتیانەی کۆمۆنیستەکان بووەو زانیویانە ئەو پڕوپاگەندانە لەدەهۆڵ چوون و دەنگیان هەر لەدوور خۆشبووە. نەک قەڵای گەلان نەبووە، بەڵکوو بەچەک و جبەخانەو فڕۆکەو تۆپی ئەوان کوردستان دائەبێژراو هەزاران

هاوولاتیان بوون بەقوربانیی بەرژەوەندییەکانی ئەو ملهوڕانەی سۆڤیەتی جاران‌و ئەیانزانی یەکەمین کارەساتی ڕاگوێزانی کورد لەسەردەمی دیکتاتۆرێکی گەورەی وەک "ستالین"ەوە دەستیپێکردووە. کەچی ڕۆژێ لەڕۆژان، ئەم ڕاستییانەیان بەنەوەی تازەی کورد نەئەگەیاندو دیزە بەدەرخۆنەیان ئەکرد .!

جا ئیتر لەبەر هەر هۆیەک بووبێ، بێدەنگو خامۆش بوون. نەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو لەسەرەتای حەفتاکاندا، بەتایبەتی کۆمۆنیستەکانیان. ببوونەوە بەبوقی حوکمی ئەو دیکتاتۆرانەو عەقڵیشیان هەر هەمان عەقڵی جاری جاران بوو!. بەلای منەوە بەرپرسییەکی مێژوویی کەوتۆتە ئەستۆی ئەوانە، وەختێ لاوانی وڵاتی ئێمەیان چەواشە کردووە، درۆیان لەگەڵدا کردوون!. ڕاستییەکانیان لێشاردوونەتەوە! دیوی ڕاستەقینەی سۆڤیەتی جارانیان کەدیکتاتۆریەت و زمان بڕین و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ بووە پێ نەوتوون‌و پەردەپۆشیانکردوون.

لەویستگەی شەمەندەفەری "جونێف" هاتمە خوارەوە، کۆمەڵێ لەو هاورێ و دۆستو ئازیزانەی ئەوێش بەچەپکە گوڵەوە هاتبوون بەپیرمەوەو لەپێش هەموویانەوە کاک "حەسەن ساڵح"ی ئەکتەر بوو .

من؛ لەولاتەوەو لەحەفتاکانەوە کاک "حەسەن"م ئەناسی، لەبەرئەوەی لەسەرودەمێکدا ماتۆرێکی پێبوو (حەسەن ماتۆر)یشیان پێئەوت. هەندێجار شەوان درەنگ، کەتاکسی نەئەما، لەیانەی مامۆستایانەوە لەپشتەوە سوار ئەبوومو ئەیبردمەوە. گەنجێکی بزۆزو پڕ لەئاوات و خۆزگە. هەر لە سەرەتاوەو لەوکاتەوە گەیشتبوومە سوید، نامەی بۆناردمو ئیتر پەیوەندیمان بەردەوام بوو. بۆ ئەم سەفەرەیش پێش وەخت ڕێککەوتبووین و زورتریش شیعرەکانم بۆ وەرگێران بۆ ناردبوون .

لەکۆتایی حەفتاکانیشداو لەبەغدا کاکە "کەریم عوسمان" و کاک "حەسەن" و کۆمەڵێ گەنجی هونەرمەندی تر، لەڕێی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردییەوە لەبەغداو هەر لەسەرشانۆی ئەوێش، شانۆنامەی "ئاسک"ی منیان نمایشکردبوو. کاک حەسەن و هاورێکانی، چەند تابلۆیەکی ئەم شانۆنامەیەیان کردبوو بەفەرەنسیو جگە لەخوێندنەوەی شیعرەکان، ئەمیشیان خستبووە نێو بەرنامەکەی خۆیانەوە. بۆ ئەوەی لەهەمانڕۆژدا نمایشی بکەن .

هۆڵێکی بەشانۆیان بەکرێگرتبوو، ڕیکلامیان بۆکردبوو. لەبەرئەوەی لەوکاتەدا کوردو پەناهێندەی کورد لەسویسراو بەتایبەتی لە "جونێف"دا ئێجگار کەمبوون و بەپەنجەی دەست ئەژمێردران، لەبەر ئەوە هەموو وزەی خۆیان بۆ ئەوە تەرخانکردبوو، کە لەو ڕۆژەدا ژمارەیەکی لەبەرچاوی سویسرییەکان کۆبکەنەوە. ئەمەیش هەروا کارێکی ئاسان نییە تۆ بتوانی کۆمەڵێ سویسری بانگبەکەیت بۆ کۆڕی شاعیرێ، کە ئەوان نایناسن و نازانن کێیەو هیچیشیان نەخوێندۆتەوە .!

سویسرا؛ بەسەر سێ کانتۆنی ئیتاڵیو فەرەنسیو ئەڵەمانیدا دابەشبووە. ئەو بەشەی ئێمە کۆڕەکەمان لێئەگرت، دەڤەرە فەرەنسییەکەی بوو. لەبەر ئەوە خوێندنەوەی شیعرەکان و نمایشەکەیش هەر ئەبوو بەزمانی فەرەنسی بن. کاک حەسەن؛ فێری فەرەنسییەکی باش ببوو. بەهاوکاری هاوڕێ سویسرییەکانی، بەشێک لەکورتە شیعرەکان و هەروەها چەند تابلۆیەکی شانۆنامەی شیعری "ئاسک"ی وەرگێڕابوو، هەرخۆیشی ڕۆڵی سەرەکیی شانۆنامەکەی ئەبینی. ئێوارەی کۆڕەکە نزیکەی (١٠٠-١٢٠) کەس هاتبوون، پێموایە هەر حەوت هەشت کوردی تێدابوو. کچێکی هاوڕێی حەسەن شیعرەکانی لەگەڵدا خوێندمەوە. واتە من بەکوردی و ئەو بەفەرەنسی. دوای شیعرەکان بۆماوەی نیوسەعاتێکیش شانۆنامەکە پێشکەشکراو لەلایەن دانیشتوانەوە پێشوازی باشیان لێکرا. بەلای خۆیشمەوە، یەکێک بوو لەکۆڕە باشەکانم، پێئەچوو وەرگێڕانی شیعرەکانیش باش گەیشتبنە سویسرییەکان، چونکە دوایئەوەی لەسەر شانۆکە هاتمە خوارەوە، نزیکەی بیست کەسێ چاوەڕوان بوون بمبینن و قسەم لەگەڵدا بکەن. لەناو چاوەڕوانکەراندا، کچێکی باڵابەرزی چاو سەوزی سپیکەلەی قژدرێژی تێدا بوو. لەگەڵماندا دانیشت. کاک حەسەن قسەکانی وەرئەگێڕا. پوختەی قسەکانی ئەوەبوو کە زۆر سەرسامبووە بەو شیعرانە، چونکە لەدەمێکەوە خۆی وتەنی گوێی لەم جۆرە شیعرانە نەبووە. داوای ئەوەیشیکرد شیعرەکان چاپبکرێن و بڵاوبکرێنەوە .

لەدواییدا لێی پرسیم: (ئینگلیزی ئەزانم؟)، وتم: (نە ء). ئەی فەرەنس؟ی وتم: (نە ء). ئەی ئیتاڵی؟ دیارە هەر (نە ء) ئیتر کچەکە دۆشداماو. خواحافیزی کردوو چووە دەرەوە. ئەم فریشتە چاوسەوزە شۆخ و شەنگەش یەکێک بوو لەو جوانە دەگمەنانەی کە لەژیانی خۆمدا ڕەنگە هەر چەند جارێک لەوێنەیم دیبێت. هەر

لەبەر ئەوەیشە گۆران وتەنی: (لەپەردەی بیرم هەڵکەنراوەو بیرچوونەوەی بەزاندووە).

بۆ شۆڕە ژن؛ چاوی سەوزو لوتی تۆزێ قنج، ئەفسونێکیان تێدایە کە بەرەو بنی قوڵی خەیاڵێک ئەمبەن، هاتنە دەرەوەم نییەو چون کڵۆ بەفرێک تیا ئەتوێمەوە! من ئەو ئێوارەیە وامڵێهات! جوانیی چییە؟! ئەی ئەویش هەر لەڕاستییە دەگمەنەکان نییە؟! هەر ئەو سیحرە نییە کە لەمنداڵییەوە لەوێنەی "کچە کافرۆشی" سەر دیواریماڵەکانماندا ئەمانبینی؟! شێوەی کامڵ نییە؟! یان هەر ڕواڵەتێکە کەمەندکێشی خۆیت ئەکاو هیچی تر؟! ئەم جوانیانە لەمرۆڤدا کاتیی نین؟! ناوەڕێن؟! یان هەمیشەیینو نەوە لەدوای نەوە دەرئەکەونەوە؟ ئەی جوانی ژنێک بێ جوانی عەقڵ چی ئەگەیەنێ؟! ئەی هەردووکیان پێکەوە ژنە خواوەندێ دروست ناکەن؟! بەڵام لەهەمانکاتیشدا بۆ هەر تاکێک لەئێمە ژیان خۆشی وەک جوانیی کاتیی نییە؟! نازانم..! ئەم پرسیارانە زۆرجار ئەوروژێنو بەڵام من لەدەستیان ڕائەکەم! تا ئەوکاتەی لەشیعرێکدا زمانیان بۆ ئەکەم بەتۆڕی هەستو نەستو خەیاڵو هەوڵئەدەم بیانگرم.

لەپەنجەرەی شەمەندۆفێرەکەوە چاوم بە عەرەبانەیەکی دوو ئەسپی کەوت، ئەمە بەس بوو بۆئەوەی بگەڕێمەوە سەردەمی منداڵیم. چاوم بەلوتکەی شاخێ کەوت. ئەمیش بەس بوو بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ "بەرگەڵو".

بەڵام لەهەمانکاتدا نەئەویان عەرەبانە دوو ئەسپییەکەی سلەیمانییەو نەئەمیشیان دەربەندەکەی بەرگەڵو. ئەوەتا وائێستەیش، کاغەزە سپییەکەی بەردەمم خەریکە کچە چاو سەوزەکەی تیا ئەنەخشێ! دوایئەوەی هەوری بارشتی شیعر لەخەیاڵمدا کۆبۆوەو وشەکان بوون بەدڵۆپ و، وێنەکان داباریێن. دوورم و نزیک. ئەوە جەستەیە دوورەو ئەوەیش ڕۆحە نزیکو لەنێوان هەردووکیشیاندا مەودایەک هەیە پێی ئەوترێ "غوربەت". من قەت ئەم نامۆییەم بەخۆمەوە نەدیوە! چونکە نەئەتوانم لەنزیکەوە دەستبدەم لەدەستی دایکمەوەو نەبۆنی بکەم و نەئەتوانم بچمە سەر شەقامی مەولەوی‌و نەشەربەتێکی مێوژی پەنا قەیسەرییەکەی وەسمان پاشا بخۆمەوە. من هەر خەیاڵم هەیەو بەڵام خەیاڵ جەستە نییە. غوربەت؛ دوورکەوتنەوەی جەستەیە لەو شوێنو کەسانەی تۆ خۆشتئەوێنو، بەڵام نایانگەیتێ.

"چل و حەوت ساڵ بوو" هەموو ڕۆژێ، هەموو سەعاتێ، هەموو دەقیقەیەک، خاک و خۆڵێکم بۆن ئەکرد، کە لەهیچ شوێنێکی تری ئەم دنیایەدا ئەو بۆنە

ناکەم. چل و حەوت ساڵ بوو؛ شاخێکی ڕووتەنی وەک گوێژە لەهەموو سەر هەڵبڕینێکدا ئەهاتە نێو گلێنەکانمەوە. ئێستا نەئەمبینیو نە ئەیبینم. "چل و حەوت ساڵ بوو؛ هەموو ڕۆژێ سڵاوم لەهەزار درەختی خۆشەویست ئەکردو ئەوانیش سڵاویان ئەکرد، بەڵام ئێستە درەختێک نییە بمناسێت. غەریبیی ونبوونەو هیچی تر!. من وەک شاعیر؛ تەماشای غەریبی ئەکەم، نەک وەک باسکاری بەمەنتیقی عەقلی. من؛ هەستم بیر ئەکاتەوەو ڕائەمێنێو بڕیار ئەدات بەر لەعەقڵم! ئەو وەختەی زیاد لەئەندازەی خۆی، عەقڵ بچێتە شیعرەوە یان ئەترشێ یان ڕەق و تەق و وشک و برنگ دەرئەچێ!. ئەو پلەی گەرمایەی کە هەموو شیعرێ ئەبێ تێیدا بێت، سەرچاوەکەی لەهەستو نەستەوەیە نەک لە عەقڵەوە. شیعری عەقڵانی لەپیاوێک یان لەژنێک ئەچێ، ئەو وەختەی دڵداری بکات، بەزمانی فەرهەنگ و زمانی لۆجیکی فەلسەفیو تیۆرییەکان بدوێ، نەک بەزمانی خەونو دنیای ئەفسانەو ئەودیوی وشەی فەرهەنگەکان.

سەیرە! زۆربەی هەرە زۆری ئەڵمانەکان بەهەر زمانێ قسەیان لەگەڵدا بکەیت، ئەگەر ئەو زمانەیش بزانن، هەر بەئەڵەمانی وەڵامت ئەدەنەوە!. واتە بێدەنگت ئەکەنو یان ناڕاستەوخۆ پێت ئەڵێن: (یان ئەبێ ئەڵەمانی بزانیت، یان پرسیارمەکە!). ئایا ئەم سروشتی خۆ بەزلزانینو لووت بەرزییە چییە؟! تۆ بڵێی هەر پاشماوەی ئەو بیرە ناسیۆنالیستە چەق بەستووە بێت کە لەدەرەوەش "ئەڵەمانیا لە سەروو هەمووانەوە"ی سەردەمی نازیەکانەوە هاتبێ؟! یان ڕەگی ئەم شانازی بەخۆوەکردنە بۆ کەلتوورو مێژووی زۆر دووریان ئەگەڕێتەوە؟! وتم زۆربە وایە، بەڵام دیارە پێچەوانەکەیشی هەر هەیە، من بۆ خۆم دووسێ جارێ بەئینگلیزییە شەق و شڕەکەی خۆم چ لەناو فڕۆکەکەداو چ لەناو فڕۆکەخانەدا پرسیارمکردو بەڵام بەئەڵەمانی وەڵامیان ئەدایەوە!

لەکاتی خۆیدا کاک "نزار خەیلانی"و چەند برادەرێکی تر هاتبوون بەپیرمەوە. نزیکی سەنتەری شارەکەبوو، کاک نزار، ئەوکاتە لەگەڵ کچە هاوڕێیەکی ئەڵەمانیدا ئەژیا. زۆری پێخۆش بوو لای ئەو بووم. کاک نزار شیعریشی ئەنووسیی، بەوردیش ئاگای لەشیعرەکانی من بوو. بڕیاربوو یەک هەفتە بمێنمەوە، بەڵام ئەوان پێشتر کاروباری هۆڵگرتنو ڕیکلامی کۆڕەکەیان جێبەجێکردبوو. ئەو ڕۆژانەی پێش کۆڕەکە، بەیەکەوە ئەچووینە دەرەوە. ئەو مۆزەخانەو شوێنەوارانەی هەبوون بینیمن، بەڵام ئەو یادەوەرییەی لەهەموویان بۆ من خۆشترو زیندووتربوو بینینی ماڵەکەی "بیتهۆڤن" بوو .

گۆڕەپانەکەی بیتهۆڤن؛ نزیکی ماڵی کاک نزار بوو. هەر بەپێ ئەچووین و من هەموو ڕۆژێ پیاسەم پیا ئەکرد. هەر نزیکی ئەوانیش چەندین دووکانی سەوزەو میوە فرۆش هەبوون، کە خاوەنەکانیان تورک بوون. پەیکەرێکی برۆنزی گەورەی بیتهۆڤن بەخۆی و قژە بژەکەیەوە لەوسەری گۆڕەپانەکەوەو لەسەر سەکۆیەکی بەرز دانرابوو. کوتومت بیتهۆڤن و ئەتوت هەر ئێستا دێتە خوارەوەو تەوقەت لەگەڵدا ئەکات. ماڵەکەی "بیتهۆڤن"یش کەئێستە موزەخانەیەو ڕۆژی هەزاران کەس ڕووی تێئەکەن، لەپەیکەرەکەی خۆیەوە هەر دووسەد مەترێ دوورە. خانوەکە دووقاتە، بلیتمان بڕی و خۆمانکرد بەماڵی ئەو بلیمەتەدا. ژووری نووستن، پیانۆکەی، ئاگردانی ژوورەکەی، کورسی و مێزەکەی، عەینەکەکەی، کتێبخانەکەی، جووتێ پێڵاوی، شتومەکە عەنتیکەو وردەکانی، نۆتەکانی، تەنانەت ئەو پارچە کاغەزانەی، کە بەخەتی خۆی پێداویستی ڕۆژانەی خۆی بۆ کڕینیان تێدا نووسیوە، ئەو نامانەی نووسیونیو وەڵامی نامەکانی، ئەو تابلۆیانەی لە ژوورو داڵانەکاندا هەڵواسیون، هەر هەمووی وەکوو خۆی ماون و بەکورتی هەر خۆی لەماڵ نییەو ئیتر هەموو شتێ لەجێی خۆیدایەتی .

ئێمەی کورد؛ لەبینینی ئەم شوێنانەوە تێئەگەین لەکاروانی مرۆڤایەتی و شارستانیدا لەکوێداین!. یان چەندمانماوە بۆ ئەوەی لەنرخی ئەو پارچە کاغەزو شت و مەکە بچووکانە تێبگەین، کە هونەرمەندێکی گەورەمان ڕۆژێ لەڕۆژان دوای خۆی بەجێبێڵێ و ئێمەیش بیپارێزین؟! بەڵام کەی؟ ..!

ئێمە دوێنیی نزیکی خۆمان سڕیوەتەوە! تەنانەت خاوو خێزانی شاعیرو نووسەرە گەورەکانمان، کە نزیکترین و شارەزاترین کەس بوون بەوان، هیچیان نەکرد. نە عەینەکێکی گۆران و نە جووتێ پێڵاوی بێکەس و نەکراسێکی ئەمین زەکی و نە سدارەیەکی پیرەمێرد و نەقەڵەمپاندانێکی ڕەفیق حیلمی-یان بۆ هەڵنەگرتین.!

بیستبووم حەمامی تێکەڵی ژن و پیاو لەشاری "بۆن" هەیە، بەڵام نەچووبووم. بە کاک نزارم وت: (حەز ئەکەم بیبینم). وتی (زۆرباشە و سبەینێ ئەچین). بۆ سبەینێ سەرو جانتایەکی بچووکمان هەڵگرت و سواری میترۆ بووین و ڕۆیشتین. دوایئەوەی بلیتمان بڕی، چووینە ژوورەوە. هەر یەکسەر لەشوێنی خۆ ڕووتکردنەوەوە لەبەردەم ئەو دۆلابانەی کە جلەکانت تیا دائەنان، ژن و پیاو

بەتەنیشت یەکەوە خۆیان ڕووت ئەکردەوە.. من هەستمکرد تەنها هەر هەردووکمانین، بەلاچاو تەماشا ئەکەینو وەکیتر ژنێک یان پیاوێکم نەدی ناسروشتی بێت و وەکوو من جۆرە شڵەژانێکی دەروونیی پێوە دیاربێ. بۆ ئەوان وەک هەر هەموو ژن بن، یان هەرهەموو پیاوبن، بەوجۆرە بووا! ئاوڕدانەوە نەبوو، کەچی من دووسێجار خەریکبوو ملم بشکێ! گەرماوەکە مۆدێرن بوو، دەیان گەرماو لەناویەکداو هەر گەرماوێکیش پلەی گەرمای دیاریکرابوو. لەزۆر گەرمەوە بۆ گەرم و بۆ مامناوەندی و بۆ سارد. لە ژووری زۆر گەرمەوە ئەچوویتە بەر تاڤگەی سارد. لەپڕێکدا شۆخێکت ئەدی بەو لەش و لارەوە، کە ئارەزووی لێئەباری، لەپڕێکیشدا پیرێژن-ێکت ئەدی بەلەشی چرچ و لۆچەوەو لە بەردەمتا وەک نیشانەی پرسیار کۆماوەو ئەلەرزێ. پیاویش هەروا، کوڕێکی تۆزێ چوارشانەو لەناکاویش پیرەمێردێکی سیس و دەماراوی. ئەمانەیش هەمووی بەڕووت و قووتی. نەخاولی و نە پەشتەماڵ و نەهیچ!. ئەم دیمەنانە بۆ چاوی ئێمە مایەی حەپەسان و سەرسامبوون و دەم داپچڕینە، کوتکەکانی حەرام، لەمنداڵییەوە ئێمەی بەجۆرێک سەرکوتکردووە لە گەورەبوونیشدا، تەنانەت لەگەڵ ژن یان مێردی خۆیشتا، هێشتا هەر شەرمن و چاو ترساوو شڵەژاوی. تا جەستە ئازاد نەبێت هەرگیز دەروونیش ئازاد نابێت. بە ڕووتوقووتی و لەیەک حەمامدا نە پیاو تەماشای ژن ئەکات و نە ژنیش تەماشای پیاو.

ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی؛ بەپێی تازەترین ئاماری کۆمەڵایەتی بۆ لەشفرۆشی ژنان، کێرفەکەی لەسەری سەرەوەیە. لە تارانی کۆماری ئیسلامیداو لەژێر سایەی پەچەو عەباو چارشێوو مانتۆدا کۆمارێکی تری گەندەڵی و بەتایبەتی لەشفرۆشی ژنان هەیەو بەنێوی "زەواجی متعە"وە کاری سۆزانیو کەشیشی لەوپەڕی برەوی خۆیدایەتی..

کوڕەکەی "بۆن" یەکێک بوو لە کوڕە هەرە قەڵەباڵغەکان. لەشارەکانی تری ئەڵەمانیاشەوە شیعردۆستان و هاوڕێ و ناسیاوو خۆشەویستان هاتبوون. لەم گەشتانەدا، چاوم بەناسیاو و یان هاوڕێی وا ئەکەوتەوە، کە چەندین ساڵ بوو

نەمدیبوون یان هەر لەبیرچووبوونەوە. بۆیە کەئەمدین و ئەمناسینەوە، لەلای من وەک زیندوو بووبنەوە وابوو. ئەم جۆرە کۆڕانە ئەبنە جەمسەری ئەو پردی پەیوەندیانەیش، کە تەواوی کوردی هەموو کوردستان بەیەک ئەگەیەننەوە. سەقزی و هەولێری و کەرکوکی و دەرسیمی و خەڵکی قامیشلی و ئامەد و سنەیی بەپاڵ یەکەوە دائەنیشن و گوێ ئەگرن .

شیعرەکانی منیش، یان ئەو هەڵبژاردانەی ئەمخوێندنەوە بریتیبوون لەو باڵندانەی، کە هەریەکەیان لەهێلانەی دڵی شوێنێکی کوردستانەوە هاتبوون، بەڵام لەئاسمانی شیعری منداو لەو هۆڵانەدا، لەشێوەی یەک پۆلدا هەڵئەفڕین .!

دوای زنجیرەیەک گەشتی شیعری، گەڕامەوە ستۆکهۆڵم. وەختێ چوومەوە ناو پۆلی خوێندن بۆ فێربوونی زمانی سویدی. ئەوان فڕیبوون و من ببووم بەقڕە. لە تاقیکردنەوەدا دەرنەچووم. بەڵام وازیشم نەهێنا .

لێرەدا دیمەنێکی کۆمیدیم هاتەوە بیر! هێشتا هەفتەیەک بوو منداڵەکان گەیشتبوون، منیش ئەلف و بێیەکی زمانی سویدی فێر ببووم. هەر چوار منداڵەکەم داناو پێموتن پێویستە هەوڵبدەن سویدی فێربن. دووسێ ڕۆژ بەحساب بووم بەمامۆستایان. دوایئەوەی ئەو تۆزەی ئەمزانی کۆتایهات و چۆڕبڕ بوو، ئیتر کشامەوە! هەمووی پێنج شەش مانگی نەخایاند وەختێکمزانی ئینجا ئەوان دەستی من ئەگرن و لەگەڵمدا دێن بۆلای سۆسیال و دوکتۆرو وەرگێڕانم بۆ ئەکەن! تامنداڵتربی، چاکترو خێراتر فێری زمان ئەبی. زانستی زمان ئەوەی سەلماندووە منداڵێک لەتەمەنی هەشت نۆ ساڵیدا، ئەتوانێ لەیەککاتدا فێری سێ زمانی جیاجیا ببێ. تا گەورەتربێ، لەفێربوونی زماندا خاوترو تەمەڵتری. قوتابخانەکەم گۆڕی و چوومە قوتابخانەیەکی تر لە 'ماریێتۆریێت '.

'نەسرین'یش وەک من لە فێربوونی زماندا هەر تەپەی ئەهات و کاروباری ماڵ و میوانیش بۆ ئەو کۆتایی نەئەهات. دایکیشم هەر لەگەڵماندا بوو. ئیتر ئەویش

کەلکەڵەی ئەوەی چووە سەرەوە، کە بەئێجگاری ئێمە بەجێبهێڵێ و بچێ بۆ لای "ژیان"ی خوشکم لەئەمریکاو لەوێ بژی.

بەچاکی ئاگام لەڕەوت و گەشەکردن و دەقی شیعری تازەی وڵات نەبوو. باروDۆخەکەیش تاریک و نووتەک بوو. لەدوای ئەنفال هیوایەک نەمابوو. هێزی موقاوەمەتی پێشمەرگەیش بەشی هەرە زۆریان بەرەو سەر سنووری ئێران و نووسەران و هونەرمەندانی شاخیش کەوتبوونە ناو ئێرانەوەو لە "سەقز" ئەژیان .

بەنامە پەیوەندیم لەگەڵ هەندێکیاندا مابوو، بەڵام هیچم پێنەئەگەیشت! دواتر بیستم، کە گۆڤاری "کولتوور" لەوێش بەردەوام دەرچووە. لەگەڵ کاک "حەمەی حەمە باقی"یدا، نامەمان بۆ یەکتر ئەنووسی. ڕۆژێکیان نامەیەکی سەیریم پێگەیشت. چەند جارێک خوێندمەوە، دوای سڵاوو هەواڵپرسین نووسیبووی "هەرچەندە من و تۆ لەیەک ناوچەی جوگرافیداو لەشاخ لەیەکەوە نزیک بووین، بەڵام بەبیروباوەڕ لەیەکەوە دووربووین!" ئەم قسەیەم پێ سەیرو عەنتیکە بوو! چونکە لەکاتی خۆیداو پێش ئێمە کاکە حەمە لەو شۆڕشەو لەو ناوچە ئازادکراوانەدا ئەژیا، کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەسەڵاتی گەورەبوو تیایدا. ئەو پێش من "مام جەلال و کاک نەوشیروان"ی ناسیوەو لێیانەوە نزیک بووەو شیعرو نامەی منی گەیاندۆتە ئەوان و لەوانیشەوە نامەی بۆ هێناوم. ئیتر بیروباوەڕی جیاوازی چی؟ !

نە من لەناو یەکێتیدا بووم و نە ئەو، بەڵام یەک مەسەلەی هاوبەش و کوردایەتییەکە ئێمەی پێکەوە بەستبۆوە. بەهەرحاڵ هەندێ قسە هەیە بیرناچێتەوە. هەر لەو سەردەمەداو لەڕێی پۆستەوە نامەی چەندین شیعردۆستی کوردی ڕۆژهەڵاتم پێئەگەیشت. ئەو نامانەی پڕبوون لەخۆشەویستی و ڕۆحی پاک و شەیدا بۆ شیعر. دۆستەکانم؛ تەنانەت زیاتر لەوەی لەشارەکەی خۆمدا هەن، لەڕۆژهەڵاتی کوردستاندان، تا ئەمڕۆیش، چەندیان بۆ لوابێ، دەستە دەستە سەردانیان کردووم. لەشارەکانی سنەو سەقزو مەهابادو بۆکانو زۆر شوێنی تریش، چەندین جار دیوانەکانم چاپکراونەتەوە، ئەو کاتانەی ڕێم کەوتۆتە ئێران

و تاران، میوانداریبیانکردووم‌و یان هاتوون بۆ لام و بەخۆشەویستیی بێ ئەندازەی خۆیان بەختیاریان کردووم .

لەسالانی (١٩٨٨-١٩٨٩)دا لەگەڵ کاک "شوان کابان" یشدا ئاڵوگۆڕی نامەمان لەبەیندا هەبوو. لەچالاکییەکانی تیپی مۆسیقای شەهید کارزان و کوڕاڵەکانیان ئاگاداری ئەکردم. هەواڵ و دەنگ و باسی برادەرەکانی تریشی بۆ ئەنووسیم. منیش لای خۆمەوە لەدوا شیعرو بەرهەمی خۆم ئاگادارم ئەکردن.

لەو سالانەدا "ستۆکهۆڵم" بۆ چاپ و چاپەمەنی کتێب و گۆڤاری کوردی لەهەموو شوێنەکانی تری ئەورووپا بە بەرهەمترو دەوڵەمەندتر بوو. بەشێکی لەبەرچاوی نووسەرو شاعیری ئاوارەی کورد کەوتبوونە ئەو ولاتەوە. چ کۆمەڵی فیدراسیۆن و چ ڕێکخراوە ڕۆشنبیرییەکان و چ کتێبخانەی کوردی لەسویددا ژمارەیان ڕوو لەزیادبوون بوو. گۆڤارەکانی مامۆستای کوردو بەربانگ و گزنگ و زۆر بلاوکراوەی تریش دەرئەچوون. لەهەموو شارێکی گەورەی سویددا چالاکی ئەدەبی و هونەری بەردەوامبوو. لەستۆکهۆڵم و هەندێ شاری تریش چەندین کەناڵی ڕادیۆی جیاجیا پەخشی خۆیان هەبوو. دەوڵەتی سوید، یارمەتی شاعیران و نووسەرانی کوردی ئەدا بۆ ئەوەی بەرهەمەکانیان چاپبکەن. لەنەورۆزی هەموو ساڵێکداو لەهەرشوێنێ کوردی لێبوایە ئاهەنگی گەورە ڕێکئەخرا. ناو بەناویش شانۆنامە نمایش ئەکرا. بەڕاستی ئێمەو مانان گیانێکمان بەو چالاکی و پەیوەندییانەوە بەندبوو. بۆ خوێندنەوەیش بەزمانی عەرەبی، جگە لەڕۆژنامە ناسراوەکان، لەهەموو کتێبخانەیەکی سویددا چەند ڕەفەیەک کتێبی کۆن‌و تازەی عەرەبی هەبوون‌و ئەتتوانی بۆ خوێندنەوە وەریانبگریت‌و لەکاتی خۆیدا بیانگەڕێنیتەوە. هەروەها دوو سێ کتێبخانەی ئەهلیش بۆ فرۆشتنی کتێب هەبوون. خۆ ئەگەر ڕێشم بکەوتایە لەندەن، ئەوا تازەترین‌و باشترین کتێبێ، کە خۆم بمویستایە لەوێ دەستم ئەکەوتن. کتێبخانە بچکۆلەکەی ماڵەوەم وردە وردە گەورەتربوو. بەمجۆرە لەپاڵ نووسیندا خوێندنەوەیشم بەردەوامبوو. هەر لەوماوەیەشدا لە کەناڵە جیاجیاکانی ڕادیۆی کوردی هەفتانەی ستۆکهۆڵمەوە ناوبەناو بەشداری پانێل و مێزگردەکانم ئەکرد، بەلام دوایئەوەی هەندێ لەو

ڕادیۆیانەیش کەوتنەناو زەلکاوی شەڕەجنێوو سووکایەتی پێکردنی ئەم و ئەوو یەکترەوەو لەسنوری ڕەوشتیان تێپەڕاند، بڕیارمدا بەتەواوی بکشێمەوە.

هەر لەسالّی (١٩٨٨)یشدا بوو. شیعری "جودایی"م کەوتە ناو بەرنامەی خوێندنی وڵاتە یەککرتووەکانی ئەمریکاو کەنەدا-وەو لەئەنتەلوێگای ئەو بەرنامەیەدا لاپەڕەیەکیان بۆ تەرخانکردبووم. جگە لەدەقی شیعرەکەیش، پێشەکییەکی چەند دێڕیشیان سەبارەت بەناسینی گەلی کورد نوسیبوو، ئەوەندەی ئاگاداریشبم تائێستەیش ئەو بەرنامەیە هەروەکوو خۆیەتیو بەردەوامە.

تاسەرەتای سالّی (١٩٩١) چەند سەفەری دیکەی شیعرم بۆ وڵاتە جیاجیاکانی دنیا کرد. هەندێکیان لەسەر گیرفانی خۆم و هەندێکی تریشیان، لەسەر بودجەی ئەو کۆمەڵەو ڕێکخراوانەی بانگهێشتیان ئەکردم.

زللەیەک لە هەڵبەست ئەدەم؛
پەرداخێ شەرابی سوورم دەڕێ!..

فەڕەنسا؛ وڵاتی ئەدەب و هونەرو جوانییە. پاریس؛ خۆی بۆ خۆی دایکی فریشتەی شیعرو سەرچاوەی ئەفراندن و داهێنانی گەورە گەورەیە. تا ئەو کاتە هەر دوراو دوورو بەڕێی کتێبەوە، لەڕێی سینەماوە، بینیبووم. بەڵام ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو ڕاستەوخۆ بچمە ناو دڵییەوە. ڕاستەوخۆ ببینم و دەست لەدەستییەوە بدەم و لەگەڵیدا لەسەر یەک مێز دابنیشم و بیدوێنم و بمدوێنێ. هەر کاتێ ناوی "پاریس"م ئەبیست بەر لە پادشاکانی و بەر لەناپلیۆن و پێش کڵێساو سەرکردە سیاسی و تەنانەت شۆڕشە گەورەکەیشی، من ناوی "هۆگۆ و بۆدلێرو ڕامبۆ و فرلین و مالارمیەو سان جۆن بیرس و هتد.." لە گوێمدا ئەزرنگایەوە .

پاریس؛ واتە شیعرو شیعریش واتە پاریس. لەفامکردنەوەمانەوە ئێمە ئەم ناوە چۆتە بیرو هزرمانەوە، وەک مانگ لەخەیاڵماندا هەڵهاتووە. وائێستەیش بەڕێوەم و پاش سێ سەعاتێ لەفڕۆکەخانەی "شارل دیگۆلا" دائەبەزم. فەڕەنسای سیاسەت و دەوڵەت ئێستە بووە بەیەکێک لەدەلالە چاوچنۆکەکانی سەدام. بووە بەشەریکی تاوان و جینۆسایدی بەعس. بیرمئەکردەوە: "بەداخەوە لەوڵاتی شیعرو هونەرەوە، مەرگ ئەنێرن بۆ بەغداو، بەغدایش لەڕێی میراجەکانی ئەمانەوە بەسەر گوندو کێڵگەو مەزراو مندالانی کوردستاندا دابەشی ئەکەن.

بەڕاستی سیاسەت لەم سەردەمەدا، کوتومت لەو سۆزانییە ئەچێت کێ زۆرتری بداتێ لەگەڵ ئەودا ئەنوێت ..!

ئیتر هەق و منداڵ و جوانی و شیعر وشەگەلێکن بۆ سیاسەتمەداران جێی گاڵتەو پێکەنین و تیز پێوەکردنن! ئێستە ماف و یەکسانی و دیموکراتی و ئەمجۆرە زاراوانە لەناو بەرمیلی نەوتدا نوقم بوون! جاک شیراکی لەئێستەدا سەرکۆماری فەڕەنسا و دوێنێیش سەرۆکی شارەوانی پاریس، سەدام هاوڕێی نزیکی بوو. چونکە نەوت خۆشەویستی بوو. فڕۆکەکە لەناو هەوراو منیش لەناو هەوری خەیاڵی خۆمدا بووم....)

دیسانەوە شۆڕشێکی تر تووشی نوشوستی بووە، ئەم نوشوستییە، دنیای سۆزانی و سیاسەتی نێودەوڵەتی لێی بەرپرسیارە. دیسانەوە جارێکی تر ڕیسی جەستەمان بووەوە بەخوری زەمانێکی دەستبڕو درۆزن. سیاسەت یەعنی درۆی ڕەنگاوڕەنگ و تەڵەکەبازی و دەست بەزاخدا کردن و مل شکاندن! ئەوە هەر شیعرەو هونەرەجوانەکان، هەوایەکی پاکیان تێداماوەتەوە بۆ هەناسەدان. ئەوە سیاسەتە ژینگەی پیسکردووە، سروشتی ئەنجن ئەنجن کردووە. جوانیی شێواندووەو درۆی سەرخستووە. ئەوە هەر سیاسەتە؛ خوێنی هاوڕێی خۆتت بۆ حەلاڵ ئەکاو ئازادیخوازی ئەمڕۆ بۆ سبەینێ ئەکا بەدوژمنی خوێنەخۆی ئازادی و چەپلەیشی بۆ لێئەداو میدالی شەرەفیش ئەکا بە سنگییەوە! سیاسەت ڕەنگە تا ئەوکاتە پاک بێ، کە بێدەسەلاتە، کە نەگەیشتۆتە سەرکورسی حوکمڕانی، کە هێشتا نازانێ پارە بژمێرێ و ڕێی بانکەکان بەڵەد نییەو سەری لەماتماتیکی بەرژەوەندی دەرناچێ. شیعرو هونەری ڕاستەقینە نەبانکیان هەیەو نە بەرژەوەندی! هەر ئەمەیشە خاڵی هەرە جەوهەری بۆ جیاوازیی نێوان سیاسەت و شیعرو هونەر .

سیاسەت ئەتوانێ هەموو شتێ دروستبکات، هەموو شتێ بخولقێنێ، ئەوەی ناتوانێ بیکات دروستکردنی شیعرو هونەری ڕاستەقینەیە. بەڵێ دەسەلات ئەتوانێ بۆدلێرێ یان ڕامبۆیەک بکوژێت! بەلام هەرگیز بۆدلێرو ڕامبۆیەکی بۆ دروستناکرێ. ئەتوانێ چەندین بریجنێف بخولقێنێ، بەلام هەرگیز پوشکین-ێکی بۆ ناخولقێنرێ. فڕۆکەکە لەهەورەوە چووە دەرێو منیش لەهەوری ناو خەیاڵمەوە هاتمەوە ناو فڕۆکەکە) ..

فرۆکەکە دائەچێ و تاریک ئەبێ و کپ ئەبێ و منیش لەناو لۆکەی خامۆشی و کربوونی جەستەیەکی چاو بەوەنەوزدا پێلوم ئەنیشێ و خەوم لێئەکەوێ و خەوێک ئەبینم:

"لە سلەیمانییە، بەلام دارو دیوارو شەقام و کۆلان و مالەکان، هەر هەمووی رەنگیان سوور هەلگەراوە، سورێکی تەڕ. ئەپرسم: ئەمە چییە؟! بێگەردی هاورێم پێئەکەنێ ئەلێ: شێرکۆ تۆ ئاگات لەچییە؟! تۆ نازانی هەموو رۆژێ چەند گەنجی ئەمشارە قۆچی قوربانین. ئەوەیش بارانی سوورەو باریوە. دوێنێ شەو تابەیانی بێوچان باریوە .

شێرکۆ؛ ئێستا هەموو بالندەکان و هەموو درەختەکان هەر سوورن. تۆ ئاگات لەچییە؟ شێرکۆ!. ئەها تەماشا! خەلک سەریان پێوە نەماوەو بەلام ئەجولێن و ئەیشرۆن. دیسانەوە ئەپرسم: ئەی باشە گۆیژە کوا! گۆیژە نابینم؟! بێگەرد شان هەلئەتەکێنێ و ئەلێ: ئاخر نالێم ئاگات لەهیچ نییە! گۆیژەی چی؟ و ئەزمڕی چی؟.. تەم.. تەم.. تەم و مژێکی زۆر ئەستووری مەلاس دایپۆشیون. تەنانەت رەشەباکان ناتوانن دڕی پێبدەن. ئەپرسم: ئاخر چۆن؟! چۆن؟ چۆنی ناوێ! هیچ نەماوەو بڕایەوە. بەدەنگی بەرزیش قسە مەکە بۆچی تۆ وا ئەزانی ئێرە سویدە. ئەپرسم باشە ئەی "ئاری" لەکوێیە؟! ئەویش ئەلێ. ئاری زۆرباشە.. کونە ورچێکی دەستکەوتووە.. زۆرباشە. کونە ورچی چی بێگەرد؟! سەرێک بائەداو ئەلێ. ئاخر ئەلێم ئاگات لە هیچ نییە.. کورە بابە.. خۆ ئەمە دنیاکەی جاران نییە.. بڕوانە بڕوانە! وەختێ سەرم هەلبڕی بەسەدان ژن، ئاپوورەیەک ژن، روویانکردۆتە سەیوان و بەلام هەموویان ئاگریان تێبەربووە، کلپەکلپ ئەسووتێن، بەرلەوەی من پرسیار بکەم بێگەرد وتی: شێرکۆ ئەمانە هەموویان لەموسل و ئەبوغرێبەوە گەڕوانەتەوە هەریەکەو جەرگێکی ئەنجن ئەنجنی خۆی هێناوەتەوە. ئەو ئاگرانەیش رۆحی کورەکانیانەو ئەسووتێن. شێرکۆ؛ ئێمە هەموو رۆژێ ئەمە حالمانە. دوایی پێی ئەلێم: ئەی چیرۆکی تازە؟! دەستێک ئەبات بۆ سەری و ئەلێ: هەر لێرەدا ئەتوانین بینووسین. قەلەم و کاغەزیش ترساون و ناوێرن وەک جاران بەئاشکرا دەرکەون. ئەها تەماشای سەرەوە بکە !.

وەختێ تەماشا ئەکەم هەزاران قەلەم و پەڕەکاغەز بەدەم گێژەلووکەیەکی سووری تووڕەوەو لەتەندورەیەکی باریکدا بەرەو قولایی خۆلەمێشی بەرزئەبنەوە....".

لێرەدا؛ دەنگی کاپتنی فڕۆکەکە بەئاگای هێنامەوە وەختێ وتی: (تکایە خۆتان ببەستن، چونکە دوای دە دەقیقە لەفڕۆکەخانەی "شارل دیگۆل" ئەنیشینەوە!

"ئاری" تاقە کوڕی هاوڕێم ڕەووف بێگەردە. ئەچێتە شاخ و ئەبێ بە پێشمەرگە. ئەکەوێتە بەری قەرەداخ و لێرەوارەکانی قۆپی. ئەنفال دێتو بەڵام ئەو هەر ئەمێنێتەوە. بە باوکی ئەڵێن بۆ تەسلیم نەبێتەوە، هیچ نەماوە! ئەویش ئەڵێ: (پێمخۆشە مەیتەکەیم بۆ بێتەوە، بەڵام تەسلیم نەبێتەوە!). ئەمە ئەو کاتەیە، کە "پ. م" کونە ورچیشی دەستناکەوێ بۆ ئەوەی خۆی تێدا حەشاربدا. ئاری لەوێ ناوی "ڕزگار"ی لێئەنێن .

کۆمەڵێ پێشمەرگەی شەهید "حەمە ڕەش و کاکە عوسمانی حاجی مەحمود"ن و ماونەتەوەو مێرولەیشن‌و ئەچن بەگژ قوللەی قافیشدا! بەعس گوشاری بۆ سەرخاوو خێزانی "پ. م"ێک گەیاندۆتە سەر ئێسقان. بانگی بێگەرد ئەکەن و پێی ئەڵێن (بڕۆ ئاری کوڕت بێنەرەوە). ئەویش ئەڵێ (ئاری چی؟! ئاری چەند مانگە گەیشتۆتە وڵاتی سویدو لەوێیە!). لەڕێی پۆستەوە ڕۆژێک کارتێکی بێگەردم پێگەیشت نووسیبووی: (ئەرێ ئاری گەیشتۆتە سویدو بەڵام دەنگی نییە!). من تێگەیشتم مەسەلە چییە. کارتێکم بۆ بێگەرد ناردەوەو نووسیبووم: (بەڵێ؛ ئاری لێرەیەو ئێستا لە کارگەیەکدا کار ئەکاو تەندروستی زۆر باشە. منیش درەنگ درەنگ ئەیبینم چونکە شەمموان و یەکشەمانیش هەر خەریکی ئیشە، ئەگەر بینیم پێی ئەڵێم نامەت بۆ بنووسێت). کارتەکەم بە "ڕەووف" ئەگات و ئەوش بۆ شوێنەونی ئەیگەێنێتە دەستی کەسێکی وا کە هەواڵەکە بەحکومەت بگاتەوە.

هەردوو پێچکەی فڕۆکەکە بەر شەقامی فڕۆکەخانەکە کەوتن و کاپتن لەڕێی مایکرۆفۆنەکەی خۆیەوە پێیوتین: (بەخێربێن بۆ پاریس!).

لە پاریس؛ لای کاک فەرهاد پیربال میوانبووم. ئەو وەختە خوێندکاری زانکۆی سۆربۆن بوو. لەخانوویەکی گەورەدا بوو، بەڵام چۆن خانوویەک؟!. کۆن کۆن و ڕزیو. پێئەچوو لەسەردەمی شۆڕشی فەرەنساوە دروستکرابێ! ژوورەکەی، نیمچە هۆڵ و وەراقێکی پانوپۆڕ بوو. هیچ جۆرە شۆفاژێکی بۆ گەرمی و هیچ جۆرە ئامێرێکی فێنککەرەوەی تێدا نەبوو. قەرەوێڵەیەک و کۆمەڵێ کتێب و پەڕەکاغەزی پەرش و بڵاو، ڕۆژنامەو گۆڤاری بەسەریەکدا کەوتوو. جلی چڵکنی کەڵەکەبوو. هەندێ پۆستەری هەڵواسراو. وێنەیەکی قەڵای هەولێر. لەسەر تاقێکیش بە بەرزییەوە یەک تاک پێڵاوی پاژنە عانەی ژنانە! بە شەویش زیکەزیک و فرتەفرت و تەراتێنی مشکی گەورە گەورە!. وتم (ئەمە چییە؟! من لە

چالاوام یان لە پاریس؟!). کاک فەرهاد وتی: (ئەمە ئەوەیەو بۆ منی بێ پارەو پوول و قوتابی، کرێیەکی هەرزان و شوێنێک کەم کەس هەیە پێی ڕازیبێ و ئەیبەمە سەر). ئیتر تێگەیشتم و پێمخۆشبوو هەر لەلای ئەو بمێنمەوە. لەولاوە هەرچۆنێک بوو جێگەیەکم بۆ خۆم چێکرد. ئێمە شەواو شەو ئەکەوینەوە ماڵ و لای مشکە بەڕێزەکان !.

کاک فەرهاد؛ زمانە فەرەنسییەکەی باش بوو، جگە لەوەیش وێستگەکانی میترۆو هەموو شەقام و مۆزەخانەو شوێنەوارو شوێنە گشتییەکان شارەزابوو. لە بەیانییەوە ئەچووینە دەرەوە. ئەو پێشمئەکەوت و منیش بەدوایەوە. ئەگەر برسیشمان بوایە بەدەم ڕێوە بابۆڵەی خۆمان ئەخوارد. جگە لەماڵەکەی پیربال، ئیتر هەموو شوێنێ خۆش و لەپاک و خاوێنیدا ئاوێنە بوون .

پاریس؛ ئەو شارە جوانەیە هێتلەر دڵی نەهات کاولی بکات!. چەندمان توانی گەڕاین، ئەوەی پێویست بوو بیانبینم، بینیمن. هەر لەموزەخانەی بەناوبانگی "لۆڤەر"ەوە تا ئەگاتە سەر بورجی "ئیڤل" و تەلاری هونەری "بۆمبیدۆ"و شەقامی گەورەی "شانزلیزی" و تاقی "سەرکەوتن" و کڵێسەکەی "ڕۆژدام" و چەندین شوێنی گرنگی تریش .

ئەوەی من پێمخۆش بوو، ئەو هەموو کافتریاو چایخانە جوانانە بوون، کە لەژماردن نەئەهاتن! وەک وتراوە لەپاریس لەنێوان چایخانەیەک و چایخانەیەکی تردا چایخانەیەکی تریش هەیە. ئەوەی ڕاستیبێ، بۆ ئەوەی مۆزەی لۆڤەر بەچاکی ببینی، ڕەنگە نزیکەی چوار پێنج ڕۆژێکی بوێ!. بەڵام لەبەرئەوەی من تەنها یەک ڕۆژم بۆ ئەم بینینە تەرخانکردبوو. بەنیوە ناچڵ بینیم. لە لۆڤەر-دا مرۆڤ هەست ئەکات هونەری مەزن چییە!. لەوێدا مێژووە ڕاستەقینەو ڕاستگۆکان ئەبینین. تۆ؛ لەوێداو لەبەردەم ئەو تابلۆیانەدا هونەر چۆن ئەتوانێ شەیداو سەرسامت بکات. لەوەیش زیاتر ئەوە هەر لەوێیە، کە لەبەردەم ئەو هەموو جوانیانەدا ئەبێ کڕنووش بەریت و زمانێک نییە بۆ ئەوەی بتوانێ باسیانبکات و هەقی خۆیان بداتێ. ئەو چاوانە چیبوون، ئەم قولایی و ناخانەیان کێشاوەو ئەم ڕۆحانەیان کردوون بە بەردا؟! ئەوە خۆر خۆی نییە دابەزیوەتە ناو ئەم دەشتەوە؟! باشە ئەم شاژنەی بەر لە چەند سەدەیەک لەم ئاهەنگەدا بووە، بەردەوام زیندوو نییە؟! ئێستایش لەژیاندا نییە؟! تینوومەو خەریکم لەئاوی ئەم ڕووباری ناو تابلۆیە بخۆمەوە!. خەریکم ئارەقەی لاملی ئەو ئەسپە بسڕم. حەز ئەکەم بچم لەژێر سێبەری ئەو درەختەدا دانیشم. مەحاڵە هیچ کامێرایەک

بتوانێ یەکە یەکە گەندە موی قۆڵی ئەو شۆخە دەربخات؟! لەرینەوەی ئەو وردە شەپۆلانە چۆن؟! نەمری لێرەدایە. وزەی نهێنی سیحری بینینی هونەرمەندو دەست و پەنجەی خوداوەندی وێنەکێشان هەر لێرەدایە. کەلتوور لێرەدا بەرجەستەیە. رابوردوو نەمردووەو سەدەکان بەسەر نەچوون و فریشتەکان نەچوونەتە ژێرخاکەوەو بۆدلێرو رامبۆ هەر ئەژین و قسەت لەگەڵدا ئەکەن .

کاک فەرهاد ئەوەی پێویستبوایە بۆی روون ئەکردمەوە. وەختێ چووینە کڵێسەکەی رۆتردامەوە، من بۆ قەموورەکە ئەگەرام. بەسەدان مۆم داگیرسابوون. ئەم کڵێسەیە کێی نەدیوە؟! ئەبێ چەند جار "هۆگۆ" هەر لەم دەروازەیەوە چووبێتە ژوورەوەو هاتبێتە دەرەوە؟!. کەماندوو ئەبووین لەسەر کورسییە تەختەکان دائەنیشتین. کاک فەرهاد خەریکی وێنەگرتن ئەبوو، ئەو دووعاشقەی لەراموو‌ساندان نەسەرەک کۆماری فەرەنسا و نەدنیایش بەسەپانی خۆیان نازانن. لەماچێکی دورودرێژی تەروپاراودا نوقمبوون و بەو زوانە نایەنە دەرەوە. کۆترە شینکەکان دێنە سەر شان و مل و بەگمەگم شیعرت بۆ ئەخوێننەوە. لە مۆزە خنجیلانەکەی "رۆدان"داو لە بەدرەمی پەیکەری تێکئاڵاوی هەردوو جەستەی ژن و پیاودا بەبێ ئەوەی بەخۆت بزانیت، وردە وردە ئەتوێیتەوە. هەر لەوێ و نزیکی ئەو پەیکەرە تووشی کچە شۆخێکی لوبنانی بووین. دیاربوو پێشتر کاک فەرهاد ئەیناسی. ئەویش هەر شاعیر بوو. منی پێناساند. دواتر چووین لەکافترێایەکی خۆش پێکەوە دانیشتین، بوو بە کۆڕی شیعر خوێندنەوە. گەنج بوومەوەو قسەکانم کەوتنە شنەشن و شیعرەکانم ئاوێزانی بوون. کافتریاکە بوو بەکەژاوە. سەرمێزەکەمان پڕبوو لەپەپوولە. ئاخم بۆ ساڵانی لاوێتی و هەرزەکاری خۆم هەڵئەکێشا. تازە درەنگە درەنگ! بەڵام کوا دڵی شاعیر لەتەسکەرەی نفوسدایە؟ دڵی شاعیر هەمیشە هەر بیست ساڵانە. دڵی شاعیر هەمیشە هەر ژێی کەمان و دەمی تازە خونچەو دڵۆپی بارانە. بەشێکی زۆری تەمەنی ئێمە رەشەبای وڵات بردی. وەیشوومەکانی مێژوومان بردیان. قەلەرەشەکان بەرەو کاولاتەکان بردیان. ئەو دەمەی لەتەمەنی گوڵدا بووم. دڕک و داڵ رنیانم! ئەو وەختەی لە قەڵبەزە ئەچووم، چواردەورم قاتر بوو. تینوێتی هەڵیمژیم. لەوکاتەدا وام هەست ئەکرد؛ گوێم لە "مەردان"ە و ئەیڵێت و ئەیڵێتەوە: "لە دەسم چوو، بەخوا هەرگیز نایەتەوە.!"

کۆڕەکەم گرتو هەڵبژاردەیەک لەشیعرەکانم خوێندەوە. بەشێکی زۆری ئەم شیعرانەیش هەر کورتە شیعرەکان بوون و دوای چەند ساڵێ لەلایەن کاک

"کەمال مستەفا"وە بۆ فەرەنسی وەرگێردرابوون و دەزگای چاپی "لارمەتان" بلاویانکردەوەو تەنها دوو دانەیشیان بەدیاری دا بەخۆم و هیچی تر و منیش مەمنوون. هەر وەکوو لە لاپەڕەکانی پێشوودا ئاماژەم بۆ کردبوو هەر لەم سەفەرەو دوای ئەو کۆڕە بوو کە لەگەڵ کاک فەرهاد و برادەرەکانی تردا چووین بۆلای "د. قاسملو". ئەو شەوە میوانداری کردین و دواجاریش هەر لەپاریس و لەکافیتریایەکی خۆشدا بوو، ئەو و "کاک عەبدوڵلای قادری و کاک فەرهاد و من" پێکەوە دانیشتین و ئیتر ئەوە دوا بینینی و دوا دانیشتن بوو.

ئەو ڕۆژەی بەمیترۆ بەرەو بورجی ئیڤل ئەچووین، بەرلەوەی لە تونێلەکە بچینە دەرەوە، دیمەنی کابرایەک سەرنجی ڕاکێشام، کە هەر لەوێداو لەسەر ئەرزەکە بەهەزاران دەنکە شقارتە، تەواوی وێنەی ئیڤلی بەرجەستە کردبوو. ئەمە چ تاقەت و وردەکارییەکە ئەم پیاوە هەیەتی و کردویتی بۆ ئەوەی گەشتکەران سەرسام بکات و ئەوانیش چەند پولێکی بۆ فڕێدەنە ناو شەپقەکەیەوە .

بورجی ئیڤل؛ بەشەوو بەڕۆژ جمەی دێ. بلیتمانبڕی و سواری کابینەی سەرخەر بووین و بەرەو ژوور بووینەوە، بەلام لەبەر ئەوەی لە کابینەکەدا خەوشێکی میکانیکی هەبوو. تاناوقەدی بورجەکەی بردین، کەچی لەوێشەوە هەموو پاریست لەبەردەمدا بوو، بەلام گەڕیدەکانی تر بەپێ پاشماوەی ڕێگەکەیان بڕی و سەرکەوتن .

شەوانی پارس؛ زۆر لەڕۆژی خۆشترە. لە هەندێ شەقام و گۆڕەپاندا تابەیانی خامۆشبوون و چۆڵبوون نییە. کوردەکانی باکوور کاسبی چست وچالاک و ئیشکەر ترن وەک لەئێمە. لەوێش دوو چێشتخانەیان هەبوو. من حەزم لەو خواردنانە ئەکرد، بۆیە هەمووجار داوای ئەوەم ئەکرد بچین بۆ ئەوێ و لای ئەوان نان بخۆین. هەر لەیەکێ لەو چێشتخانانەدا بوو جارێکی دی "هەڤاڵ خەجۆ"م بینییەوە.

کاک فەرهاد؛ یەکێکە لەو نووسەرانەی قایمکارەو لەبواری ئارشیفکردنی دیکۆمێنتو بەڵگە مێژوویی و دۆزینەوەی نەخشە دەگمەنەکاندا چالاک و دەستڕەنگینە و لەوکاتەوە خەریکەو هەوڵی بەدەست خستنیانی داوە. پیاسەمان ئەکرد، بەلای کوشکێکدا تێپەڕین و پێیوتم: (ڕۆژێکیان ئالەم خاوەنی کۆشکە نەخشەیەکی کۆنی سەردەمی عوسمانیم بەهەرزان کڕیو هەڵمگرتووە). ڕۆژێکی تر لاماندایە کافتریایەک و دانیشتین. ئەوەندەمنەزانی پارچەیەک کلینیسکی سپی یان وەرەقی سەر مێزبوو خستیە بەردەمم و وتی: (حەز ئەکەم وێنەیەک لەسەر

ئەم کاغەزە دروستبکرێت یان هەرچیەک خۆت ئەتەوێ، شیعر، نووسین، هەرچییەک بێت. منیش هەر لەخۆمەوە کەوتمە خەتکێشان و نووسینی هەرەمەکی و سەری ژنێکم کردوو دامەوە دەستی. کەچی لەو سالانەی دواییدا. لە دانیشتنێکدا کاک فەرهاد پێی وتم: (تۆ ئەزانی ئەو کاغەزەم هەر لاماوەو هەڵمگرتووە!). ئەوەی ڕاستیبێ. من لای خۆمەوە ئەوەم هەر لەبیرنەمابوو!)

هەڵبەت هەر لەو سەفەرەدا ڕۆژێکیان سەری ئەنستیتۆی کوردیماندا لەپاریس و یەکەمجار بوو کاک "کەندال نەزان" ڕووبەڕوو ببینم. زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی کردم و باسی پرۆژەو بەرنامەکانی ئەنستیتۆی بۆ کردم. چەند کارگێڕێکی تریش لەوێ بوون. خەڵکی باکوور بوون. بۆ شەویش داوەتیانکردین پێکەوە دابنیشین. لەسالانی دواتریشدا دوو سێ جاری تر هەر لە پاریس کاک "کەندال"م بینییەوەو ئەمجارە وتی: (ئەتبەم بۆ شوێنێ قەت نەتدیبێ). هەروایش بوو، بردمی بۆ "لیدۆ".

"لیدۆ" هۆڵ و شانۆیەکی ئێجگار گەورەیەو ئەکەوێتە سەر شەقامی شانزلیزێ. ئەوەی بچێ بۆ پاریس و لیدۆ نەبینی وەک هیچی نەبینیبێ وایە. بلیتی چوونە ژوورەوە گرانە. بەمەزەنەی خۆم لەهەزارکەس زیاتر ئەگرێ. بەرلەوەی بەرنامەکە دەستپێبکا. ئەرزی هۆڵەکە کەوتە جووڵە. بەشێک ئەچووە سەرێ و بەشێکی تر ئەهاتە خوارێ، تا ئەو شکڵەی بەخۆیەوە گرت کەخۆیان ئەیانەوێ. بەرنامەکە نزیکەی سێ سەعاتێ ئەخایەنێ و هەرچی هونەری ئەکرۆپاتیک و ئۆپەرێت و شانۆو سەماو گۆرانی و جادووگەری و دەیان تابلۆی کۆمیدی و تراژیدی و دیمەنی سەرسوڕهێنەر هەیە تێیدایەتی. لەیەک ساتدا بەدەیان شۆخی نیوەڕووت سەما ئەکەن. شانۆکە ئەمەندە گەورەو قووڵە جێگەی سەدان ئەکتەر و سەماکەری تێدا ئەبێتەوە. بەکورتی دیمەنەکان ئەمەندە خێرا خێرا ئەگۆڕدرێن، ناتوانی بۆ یەک سات چییە چاو دابخەیت و سەیر نەکەیت. من؛ بۆ خۆم نەم ئەتوانی پەرداخەکەی بەردەمم هەلگرم "ئەوساتە وەختەی تەماشای پەرداخەکە ئەکەیت بۆ ئەوەی هەڵیبگریت" چونکە ئەزانیت وێنەیەک، دیمەنێک، شتێکت لەکیس ئەچێ و ناگەڕێتەوە. ئەم هەموو فریشتە جوانەو یەکێکیان تێدا نییە بەگرامیش لەویتر زیاتر بێ.

هەموو مانگێک بەرنامەکان ئەگۆڕدرێن، کاک کەندال وتی: (ئەم کچە جوانانە، خشتەی تایبەتی خواردنی ڕۆژانەیان بۆ ڕێکخراوە. هەموو مانگێک ئەیانکێشن، ئەوەی نیوکیلۆ زیادی کردبێ، نابێ بمێنێتەوە). دوای ئەوەی هاتینە دەرەوە کاک

کەندال وتی: (چۆن بوو؟)، من هەر ئەوەندەم وت: (بەڕاستی دووچاو کەمە بۆ ئەوەی تەماشای ئەم نمایش و هونەرو پەری بەهەشتانەی پێبکەیت!).

نازانم چووبووم بۆ کوێ. من و کاک فەرهاد پیربال ڕۆژێک لەیەکتر دابڕاین. بۆ ڕۆژی دوایی دیمەوە، وتی: (لە ڕۆژنامەیەکدا ئاگادارییەکم خوێندۆتەوەو ئەڵێت: سبەی ئێوارە لەفلان شوێن کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ هەشت شاعیر ڕێکدەخرێت. ئەو هەشت شاعیرە لەفەڕەنسادا گەورەبوونو هەر بە فەڕەنسیش شیعر ئەنووسن. بەلام بە نەژاد فەڕەنسی نین. ئەڵێی چی بچین؟!). منیش لەوەلامدا وتم: (ئەی باشە ئێمە نەچین کێ بچێ!). هەر وەکوو کاک پیربال-یش باسی ئەکرد لەمشارە گەورانەی دنیادا، ژیان ئەوەندە جەنجاڵ و لق و پۆپدارە، ئەوەندە کۆڕ و کۆبوونەوەی هەمە جۆری تێدایە لە ژمارەنایەن. بۆ کۆڕی شیعر خوێندنەوەیش جگە لە هەڵبژاردەو ئەوانەی عاشقی شیعرن، کەسی تر ناچێ. من بۆ خۆم لەسوید چووم بۆ کۆڕی هەندێ نووسەرو شاعیری ناودار، بەلام گوێگرانیان جاری واهەبووە لەبیست سی کەس تێپەڕیان نەکردووە، لەئەورووپاو ئەمریکادا، کەم تا زۆر، هەموو هونەرێ لەهەموو بوارو ئارەزووە جیاجیاکانی مرۆڤدا، لەشەڕە کەڵەشێرەوە تائەگاتە سەر کێبڕکێی کیسەڵ بینەری خۆیان هەیە. هیچ ئارەزوویەک ئارەزوویەکی دیکە ناسڕێتەوە. هیچ هونەرێ هونەرێکی تر لانابات. وەک یاری تۆپی پێ ئەو هەموو تەماشاکەرە بێ شومارەی هەیە. یاری بلیاردیش خەڵکێکی خۆی هەر هەیە. بۆ شیعریش هەر هەمان شتە. تەلەفزیۆن پەیدا بوو، بەلام سینەمایش هەروەکوو خۆی مایەوە. سینەما هاتو بەلام شانۆیش هەر بەرەوو ژیانی خۆی هەیەو بەردەوامە. تۆ بیر لەوە بکەرەوە لەشارێکی گەورەی وەک پاریسدا کێ ئەچێ بۆ کۆڕی شیعر خوێندنەوەی هەشت شاعیری بەزمان فەڕەنسی و بەلام بەنەژاد و ئەسڵ نافەڕەنسی، ئەگەر ئەو کەسە خۆی شەیدای هونەری شیعر نەبێ، چونکە هەر بۆ وەختی چوون و گەڕانەوەو کەوتنە ناو ترافیکی پاریسەوە، تۆ ئەبێ لەدوو سێ سەعات کەمتری بۆ دانەنێی، جگە لەوەختی کۆڕەکە خۆی.

کاک فەرهاد ڕۆیشت و منیش بەدوایەوە. سواری میترۆ بووین، لەدوای ئەو پاس و ئینجا بەپێو کاک فەرهاد تەماشای ناوی شەقام و ژمارەی خانوو ئەکات و ئەم لقی شەقام و ئەو کۆلان و تاگەیشتینە بەردەمی بینایەکی چوار نهۆمی. کاک فەرهاد وتی: (لەنهۆمی سێیە). بەپێ سەرکەوتینە سەرەوە. کە خۆمانکرد بە ژووردا، هۆڵێکی لاکێشەیی بوو، نزیکەی دووسەد کورسییەک دانرابوون.

شانۆی نەبوو، بەڵام لەبەردەمەوە مایکرۆفۆنێک و هەشت کورسی دانرابوون. بەرەبەرەیش خەڵکی تر ئەهاتن .

لەوەختی خۆیدا هەشت شاعیرەکە پێکەوەهاتن و لەسەر کورسییەکانی خۆیان دانیشتن. تەنها یەک ژنیان تێدابوو کە بەئەسڵ لوبنانی بوو. بەڕێوەبەری کۆڕ لەکاتی خۆیدا کەوتە قسەو بەخێرهاتنی هەمووانی کرد. ناوبەناویش کاک فەرهاد هەندێ قسەی گرنگی بۆ وەردەگێڕام. شاعیرەکان هەر یەکەو لەدایکبووی وڵاتی جیاجیای دنیا بوون: لوبنانی، عێراقی، کوبی، ئوسترالی، ئێرلەندی، گینی، مالیزی، سودانی. هەر لەناو هۆڵەکەیشدا نزیکی دەرگاکە دووسێ مێزێ دانرابوون، کە دیوانە چاپکراوەکانی ئەم شاعیرانەیان بەزمانی فەڕەنسی لەسەردانرابوون. شاعیری وایانتێدابوو، دوو دیوان تا سێ دیوانی چاپکراوی هەبوو. هەڵبەت هەموو دەقەکان بەفەڕەنسی نووسرابوون .

شاعیرەکان یەک لەدوای یەک شیعرەکانی خۆیان خوێندەوە. هەر شاعیرێ بۆ ماوەی دە دەقیقە ئەیخوێندەوە. گەیشتینە کۆتایی و هەستین بچینە دەرەوە. کاک فەرهاد سەری هێنایە پێشەوەو پێی وتم: (کاک شێرکۆ ئەڵێی چی ئێستا ئەچم پێیان ئەڵێم شاعیرێکی کوردیش لێرەیە ئەگەر ماوەی پێنج دەقیقەمان بدەنێ تائەویش دووسێ شیعری کورتی خۆی بخوێنێتەوە؟). وتم: (وەڵلا بڵێم چی!). بەڵام ئێمە لەبەرنامەدا نەبووین، ئارەزووی خۆتە. ئیتر یەکسەر کاک فەرهاد هەستاو ڕوویکردە مێزەکەو چاوم لێبوو قسەی لەگەڵ بەڕێوەبەری کۆڕەکەدا کردو دوای قەیرێک هاتەوەو وتی: (ئەڵێن زۆرباشە و پێمانخۆشە گوێشمان لەشاعیرێکی کورد بێت) .

بەڕێوەبەری کۆڕەکە قسەی کردو داوای لەئامادەبووان کرد، کە چەند دەقیقەیەکی تریش بمێننەوە. کاک فەرهاد دووسێ کورتە شیعری وەرگێڕدراوی بۆ بردن. پێموایە هەر خۆیشی وەریگێڕابوون. پێمخۆشبوو هەر کاک فەرهاد خۆی لەگەڵ مندا بەفەڕەنسی بیخوێنێتەوە. بەڵام ئەوان خۆیان یەکێکیان بۆ خوێندنەوە فەڕەنسییەکە دانا. لەوەختی خۆیدا هەستام و چوومە بەردەمی مایکرۆفۆنەکەو دیارە هەر بەپێوەوە سێ کورتە شیعرم خوێندەوەو بەدوای منیشدا شیعرەکان بەفەڕەنسی خوێنرانەوە. هەر ئەوەندەو ئیتر هۆڵەکە جماو بوو بەهۆڵی ئەو دووسێ شیعرە. خەڵکەکە لەدەورمان کۆبۆوەو دەستیانکرد بەپرسیارکردن. دوو ژن کە تەمەنیان لەسەروو پەنجاکانەوە ئەبوو، دیاربوو لەدەرویشەکانی شیعر بوون، خەڵکەکە ڕۆیشتنو ئەوان هەر لامان مانەوە.

بەڕێوەبەری کۆڕەکە هات بۆلامانو زۆر بەخێرهاتنی کردین و وتی: (ئێمە ئەم ئێوارەیە گوێمان لەشاعیرێ بوو، کە قەت لەبیرمان ناچێتەوە!). بەم بۆنەیەوە ئێوەیش ئەم ئێوارەیە لەگەڵ شاعیرەکانی تردا میوانی ئێمەن. دوو ژنە فەرەنسییەکە ناوی کوردیان بیستبوو، بەڵام هیچ شتێکیان دەربارەی ئەدەب و شیعری کوردی نەئەزانی. کاک فەرهاد هەوڵیدا بەکورتی ئەوەی ئەیزانێ بەفەرەنسی پێیانبڵێ. هەردوو ژنەکە زۆریان بەلاوە مەبەست بوو، دیوانێکم بەزمانی فەرەنسی دەربچێت. دوایئەوەی ئەو دوو ژنەیش ڕۆیشتن. ئێمەیش لەگەڵ شاعیرەکانی تردا، چووینە خوارەوەی بیناکە، پێموایە قاتی ئەرزی بوو. ئەو شوێنە وەک بۆ بارو چێشتخانە چاککرابێ وابوو. من و کاک فەرهاد لەسەر ئەو مێزە دانیشتین، کەشاعیرەکانی تری لەسەر دانیشتبوون. هەر هەموویان پێخۆشحاڵی خۆیان دەربڕی، کە ئێمەیان ناسیوە. بیرمە شاعیرە بەنەژاد کوبییەکەیان کەوتبووە لای منەوەو چاوەڕێی ئەو قسانەم نەئەکرد، کە ئەو کردنی. پێیوتم ("دیارە کاک فەرهادیش قسەکانی وەردەگێڕا" ئەم کورتە شیعرانە شیعری ئاسانی گرانن. من یەکێک لەخۆزگەکانم ئەوەیە ڕۆژێ لەڕۆژان بتوانم بەمشێوازەی تۆ شیعر بنووسم!).

ئەو شەوە تادرەنگ ماینەوە، شەوێکی شیعری بوو. شەوێک، کەشیعر و ژن و بادە پێکەوە جیهانێ دروست ئەکەن، مەگەر هەر لەخەوندا بیانبینی. دوای دوو ڕۆژ ئیتر وەختی گەڕانەوەم هاتبوو بۆ سوید. ماڵئاواییم لە کاک فەرهاد پیربال کرد، کە ئەو ماوەیە ئەرکی زۆری لەگەڵمداکێشاو ماندوومکردو ئەوەیشم لەبیر نەچوو پێی بڵێم: (سلاوی گەرمم بەمشکە بەڕێزەکان بگەیەنێ!).

رۆحی بێگەرد؛
لەو شارەی هێتلەر دڵی نەهات وێرانی بکات!

ئێوارەبوو؛ لەپەنجەرەی فرۆکەکەوە، زەردەی خۆرئاوابوون‌و بریسکە بریسکی گلۆپە مرواریییەکانی ناو پاریس و بەژنی شیعرێکی ناو خەیاڵم ئاوێتەی یەکتری بووبوون. قومێکم لەشەرابە سوورەکەی بەردەممداو بەناو ناخی خۆمدا شۆڕبوومەوە تا ئەو ئاستەی پرسیارەکان ئاپوورەیان تێدا بەستووە. باشە تۆ تائێستە چەند شیعری جوانت نووسیوە؟! بەڵام واز لەختووکەی فیزو چەپڵەڕێزان و تەنانەت واز لەنیشتمان و هەموو شتە پیرۆزەکان بێنە؟! خۆم وەڵامی خۆمدایەوە...

ئەوەی ڕاستیبێ و جارێ با بەینی خۆیشمان بێ، کەم!. ئاخر چۆن کەم؟! کەمەکە چەندە؟! بۆچی؟!. یەعنی ئەگەر بابڵێین لەو دوو هەزار لاپەڕە شیعرەی نووسیومە دووسەد تا سێ سەد لاپەڕەم بۆ بمێنێتەوە ئەوا بەختیارو ئاسوودەم ئەکەن. ئەی ئەگەر لەوە کەمتریش بێ؟! بۆ نا؟! لەوانەیە. ئاخر خۆ شاعیری مەزنی وا هەبووە لەم دنیایەدا ڕەنگە هەر دیوانێکی هەبووبێ. باشە ئەو زیادانە چیبوون؟! ئەوە خەتای ئەو ڕۆژگارانە بوون، کە ئێمەی تێکەوتین. زۆربڵێیمان کرد. بێژنگی عەقڵم پێنەبوو!. وامئەزانی هەموو خۆ هەڵکێشانێ لەئاوی شیعر هونەرە. درەنگتر زانیم مەسەلەکە لەوەدایە وەختێ ئەچیتە ئەو ئاوەوە چی دەرئەهێنی؟ کوتومت وەک ئەو خۆ نوقم کەرانەی ئەچنە بنی زەریاوەو بەشوێن

زمرووت و مرواریدا ئەگەڕێن. لەهەزار چوونە خوارەوەدا، ڕەنگە جارێک بەردێکی گرانبەها بدۆزنەوەو بیهێننە دەرەوە. ببوورە بەم پێیە ئەو ژمارەیەی لەسەرەوە دیاریمکرد هێشتا هەر زۆرە!. زۆرباشە ئەی ئێستا بیر لەچی ئەکەیتەوە؟! ئەمەوێ قەسیدەیەک بنووسم بیرنەچێتەوە؟! باشە کەواتە ئەوانی ترت بیرچوونەتەوە؟! هەمووی نا، بەڵام زۆریان بەڵێ و مەبەستیشم لەبیرچوونەوە ئەوەیە لەبنەڕەتدا مەعدەنی ئەو زمانانە بەرگەی ڕۆژگار ناگرن و ژەنگ هەڵئەهێنن. من بەشوێن زمانی زێڕیندا ئەگەڕێم!. ئەی باشە هیچت لەو قەسیدەیە نووسیوە؟! تائێستە هیچم نەنووسیوە، بەڵام هەست ئەکەم لە هەناوما تووڵەکەی دروستبووە. یەک کلیلیم لەلایەو هیچی تر. باشە ئەڵێن تۆ زۆر "مێبازی" ڕاستە؟ !

ڕاستی تێدایە، بەڵام ئەگەر بشێ، بڵێی "جوان باز" باشترە! چونکە بەو مانایە من "درەخت باز"م و "گۆرانی باز"م و "بادە باز"م و زۆر بازی تریش. یەکێک لەو "باز"انەیش کە بەڕاستی دڵم لێی تێکەڵ دێت "نێربازی"یە!. باشە تائێستە وەک هاوڕێ و ئاشنا و ڕۆشناو شیعر دۆست چەند ژنت ناسیوە؟! ئەوەی ڕاستیبێ نەم ژماردوون، بەڵام کەم نین. ئەی باشە بۆ یەکەیەکە باسیان ناکەیتو چیرۆکەکانیان ناگێڕیتەوە. لەبەر یەک هۆی سەرەکی و هیچی تر، چونکە مۆڵەتیان نەداومەتێ و منیش نامەوێ هەرگیز باسی یەکێک بکەم ئەگەر خۆی ڕێگەم پێنەدا. باشە ڕاستە ئەڵێن ژنەکەت دوو شیعری تۆی بەتەواوی لەبەر نییە؟ (بەڵێ ڕاستە). باشە بۆ ژنێکی ترت نەهێناوە؟! ئەوەی ڕاستبێ وەک حەز حەزم لێیبووە، بەڵام بڕوام پێی نەبووە!. نا ئەمە ڕاست نییە، بەڵام لە هەموو ژیانما بۆ یەک ژن نا، چونکە مەنتیقی ژیان خۆی وانییە، نە جوانی و نەخۆشەویستیی لەیەکێکداو هەتا سەر کۆنابێتەوە. من دەروێشی یەک تەریقەت نیم، من دەروێشی چەند تەریقەتێکم. من عەشق و جوانی وەک ڕەنگەکانی ناو سروشت تەماشا ئەکەم. بە(ڕاستی لەڕەنگێک و لەدوو ڕەنگ جوانتریش هەیە و ناتوانم لەیەک جوانیداو لەیەک گۆرانیداو لەیەک ئاسۆدا خۆم قەتیس بکەم، من لەمەدا سروشتی پەپوولەو هەنگم هەیە!. باشە گریمان پێیان وتی: (تۆ هەموو دیوانی شاعیرانی دنیات لەلایە، بەڵام دوژمنانی شیعر دێنە سەرتو ئەڵێن ئەم کتێبخانەیەت ئەسووتێنین؟ تۆیش بۆت هەیە تەنها دیوانی یەک شاعیر لەگەڵ خۆتدا بەریت، بەڵێ تەنها یەک دیوان و نابێ بەدووان. کامیان هەڵئەبژێریت؟! دیوانەکەی "وڵات وتمان"ی ئەمریکی "پەلکە گیا"! ئەی لەناو ڕۆماندا؟! "برایانی

کارامازۆف"ی دستۆفیسکی. ئەی لەناو کورتە چیرۆکدا؟! چیرۆکەکانی "چیخۆف"!. باشە ئەگەر وێنەی ئەو ژنە فریشتەیە بکێشی کە خۆت حەزی لێئەکەیت بەوشە چۆنی باس ئەکەیت؟

کەڵەگەتو سپی، چاو سەوزو قژڕەش، گەردن بەرزو کەمێ لووت قنج. گۆرانیش وتەنی: "نەباریک و نەگۆشتن". ئەی تۆ قەت خواردنت بۆ خۆت دروستکردووە؟! بۆ نا؟! جارێکیان هێلکەو ڕۆن و پەنجەی خۆم سووتاند! دووەم جاریش برنجێکم لێنا! بەڵام لەباتی خوێ شەکرم تێکردبوو! ئەی لەچی ئەترسی؟! شوێنی بەرز. ئەڵێن پرخە پرخیشت هەیە؟! ئێستا باشترم، بەڵام جاران هالیکۆپتەر بووم!. لەگەڵ منداڵاندا چۆنی؟! خۆشم ئەوێن، بەڵام زۆریش ڕوویانناداەمێ. ئەی قەت لەمنداڵەکانی خۆت داوە؟! زۆرکەم، بەڵام هەرگیز ئەو زللەیەم لەبیرناچێتەوە کە لە(هەڵبەست)ی کچم دا، وەختێ شەش ساڵان بوو. ئێستایش ئازارم ئەداو سەرزەنشتی خۆم ئەکەم چۆن ئەو کارەم کرد!. ئەڵێن خراپ تووڕە ئەبی؟! جاران زۆرترو ئێستا کەمتر، لەساڵێکدا جارێ دووجار، لەسەر شتی وایش، کە خۆم دوایی ئەڵێم بەخوا منیش گەوجم! ئاخر ئەوە ئەوەئەهێنێ لەسەری تووڕەبم! ئەی ئەو شتە بچووکانەی وەڕست ئەکەن چین؟! بۆ نموونە کراسێک قۆپچەی ملیوانەکەیم بەگران بۆ دابخرێ. یان لەوەختی نان خواردندا کەوچکەکەم لەدەست بەربێتەوە. یان لە حەمامدا سابوونەکەم لەدەست بپەڕێ. یان یەکێک قسەم پێببڕێ. یان دەستکاری بەرزیی و نزمی سەرینەکەم کرابێ. یان نیشانەکردنی لاپەڕەی کتێبێکم بۆ خوێندنەوە لابرابێ. یان لەپڕێکدا بێ بەڵێن و ئاگادارکردنەوە بەتەلەفۆن یەکێک خۆی بکات بەماڵدا. بەقرچەی نیوەڕوانی هاوین تۆ ئەتەوێ ڕاکشێیت و لەپڕ زەنگی تەلەفۆنت بۆ بێت. تۆ لەوەختی خۆیدا گەیشتوویتەتە شوێنی بەڵێن و بەڵام ئەوانی تر دیارنین و کەدێشن ئەڵێن: (داوای لێبوردن ئەکەم دواکەوتم)!. چی تر؟! چی تر؟!. ئەی باشە تۆ لەنێو هەموو ئاژەڵی دنیادا کامیانت لا جوان و خۆشەویستە؟! ئەسپ. ئەی لەنێو تەیروتواڵ و باڵندەدا؟! کەڵەشێر!. ئەی لەدرەختدا؟! دار هەنار .

فڕۆکەکە کەوتە ناو تاسەیەکی هەواوەو پەرداخە شەرابەکەی بەردەمم لاربۆوەو ڕژا. هاتمەوە ناو فڕۆکەکە. دەرەوە تاریکو نوتەک. ئەم گەردوونە چەند بەسامە!. کەیبانووەکانی ناو فڕۆکەکە خەریکی دابەشکردنی ژەمە خۆراکێکن. من نایخۆم و لەجێی ئەو داوای شووشە شەرابێکی سووری تر ئەکەم!. ئەم تەکنەلۆجیایە زۆر بەخێرایی پێشئەکەوێ، باشە ئەبێ پاش پەنجا ساڵی تر چی

تازە بێتە کایەوە؟!. لەڕۆژنامەیەکی سویدیدا نووسرابوو، لەساڵی (٢٠١٥)دا فڕۆکەیەک دێتەئاراوە کە، لەستۆکهۆڵمەوە بە (٤٥) دەقیقە ئەگاتە سیدنی لەئوستڕالیا!. بڕوا بکەین یان نەیکەین. بۆ نا؟! کەچی لەم لای تریشەوە زانستی پزیشکی لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنانەی پێیگەیشتووە، بەڵام هێشتا لە بەردەم نەخۆشی شێرپەنجەدا دەستەوەستانە. خەیاڵ ڕۆیشتن سنووری بۆ نییەو هەر ئەڕوات و ئەڕوات. ئەو پیاوەی لەبەردەممەوە دانیشتبوو هەستایە پێیان بۆ ئەوەی بچێ بۆ توالێت. ئەو وەختەی لایکردەوە خورپەیەک بەدڵمدا هات، ئەم دەموچاوەم دیوە. یان لە ناسیاوێکی زۆر نزیکم ئەچێ، گەڕایەوەو باشتر لێی وردبوومەوە.خۆیەتی زانیم، هەر تەواو بێ زیادوکەم لەکاک "سەعید گەوهەر" ئەچێ !.

چوومەوە بۆ بەرحەوزەکەی ناوبازاڕی سلەیمانی و ئینجا بەرەو خوار بەدەستە ڕاستداو چایخانەکەی کاک "سەعید گەوهەر" لەوێدابوو. لەکۆتایی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکاندا ناوبەناو سەرم ئەدا. ئەویش لەناو کاژێکدا کاری ئەکرد. پیاوێکی کاسبکاری هەژار، لەبەیانییەوە هەتا ئێوارە، بەسەرپێوە خەریکی چابردن بوو بۆ دوکانەکانی ئەو گوزەرەو بەردەوامیش لەسیاسەت ئەدوا. ناو چایخانەکە سێ چوار کورسی تاک و دوو قەنەفەی تەختەی درێژی لێ دانرابوو. بەهەناسەی سوارەوە، چای تێئەکردو ئاوی سەماوەرەکەی ئەگۆڕی و لەدراوسێ دوکانەکان پیاڵەو ژێر پیاڵەکانی ئەهێنایەوەو بەپەشتەماڵی بەرکۆشیش دەستەکانی ئەسڕی و ئەگەر زستان بوایە ئاگری زۆپا تەنەکەکەی خۆش ئەکردو بەردەوامیش لەسیاسەتو بارودۆخی ئەو ڕۆژگارە ئەدوا. کاکە سەعید گەوهەر؛ دەروێشێکی کوردایەتی بوو. زەحمەتکێشێکی ئازادیخواز بوو. لەپڕێکدا ئەیوت "باشە ئەم شیوعییانە بۆ وائەکەن؟! بۆ گاڵتە بەجوگرافیای کوردستان ئەکەن؟! تائێستەیش بە "ئوومە"مان نازانن!. بەڵام بۆیان ناچێتە سەر. دنیا دەوران دەورانە" ئای کاکە سەعید گەوهەر ئەبێ ئێستا لەکوێ بێ؟! ماوی نەماوی؟! چوومەوە ناو بازاڕی سلەیمانی و گەیشتمە بەردەمی ئەسحابە سپی کاک "حەمەی بەکری" مەقامبێژو دەنگخۆش و قسەخۆشی شارم بینی. دەسەتێ ڕانکوچۆغەی سپی لەبەرداو جوتێ کلاشی دۆمیش بەسەرپێوە. کاک حەمەی بەکر؛ لەسالانی (١٩٥٨-١٩٥٩)دا لایەنگری حزبی شیوعیی عێراق بوو. ڕۆژێ خەریکی پێتاک کۆکردنەوەو باربوو بوو بۆ حزبی شیوعیو ئەچێ بۆ لای کاک ئەحمەد میرزا بۆ هەمان مەبەست. دوای ئەوەی دائەنیشێ کارتێک ئەخاتە سەر

مێزەکەی کاک ئەحمەد، کەوتنەی فەهد و باسم و حازمی تێدایە. کاک ئەحمەد ئەڵێت: (ئەمە چییەو بۆچی هاتوویت؟!) کاکە حەمەیش پێی ئەڵێ: (دەستبکە بە باخەڵتاو سەری خۆت بقەبڵێنەو پارمەتی حزب بدە!). کاک ئەحمەد تۆزێ ڕائەمێنێ و لەپاشدا لەسەر پارچە کاغەزێک ئەنووسێت:

زۆر موحتەرەم جەرجیسە فەندی

پاش عەرزی ئیحترام

وا کاک حەمەی بەکر هات بۆلاتان، ڕەجائەن پێنج قاپ عەرەقی مەستەکی بدەنێ و لەسەر حسابەکەی خۆم قەیدی بکەن!. ئیمزا ئەحمەد میرزا عارف

کاغەزەکە ئەداتە دەست کاکە حەمە. ئەویش دوای ئەوەی ئەخوێنێتەوە توورە ئەبێ و بەکاک ئەحمەد ئەڵێ (ئەمە چییە؟! بۆ ئێمە مەیخانە ئەکەینەوە!). کاک ئەحمەدیش پێی ئەڵێ: (گوێبگرە! حەمەی بەکر! تۆ ئەتەوێ من خۆم تووش بکەم و سبەینێ وەزع بگۆڕێ و یان یەکێک ئیعترافم لەسەر بکاو بڵێ پارەی داوە بە حزبی شیوعی. من ئەوە ناکەم. فەرموو برۆ ئەو قاپە عەرەقانە وەربگرەو بچۆ بیکەرەوە بەپارەو بیبەرەوە بۆ حزب!).

بەیادی ئامە چەقالەوە...

شەراب بۆمن حەرامە، بەڵام مرۆڤ کوشتنی ئەو حەڵاڵە!

خەیاڵ؛ خەیاڵ ڕائەکێشێ، لەنەورۆزی (١٩٥٩)دا لەتووی مەلیکی ئێستا، بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە ئاهەنگێکی زۆر گەورە ڕێکخرا. هەموو لایەک بەپارتی و شیوعییەوە بەشداربوون. بەڵام دیارە دەنگی زاڵی ئەوکاتە پڕوپاگەندەو قسەی شیوعییەکان بوو. زۆرباشم لەبیرە وتاری حزبی شیوعی مامۆستا "سەعید ناکام" خوێندییەوەو لە شوێنێکدا بەئاشکرا هاواریکرد: (ئەوەی ناوی کوردستان ئەهێنێ، سەریدا لە بەردا). ئەم قسەیە بووە هۆی ئەوەی خەڵکەکە بخرۆشێ، بەتایبەتی کوردستانییەکان بەیەکدا بێن و پەلاماری مامۆستا ناکام بدەن! بەڵام ناوبژیکەران کەوتنە بەینەوەو نەیانهێشت نەورۆزەکە تێکبچێ.

من؛ ئەوکاتە تەمەنم نۆزدە ساڵان بوو، یەکێک بووم لەگەنجە نەتەوەییە خوێن گەرمەکان و ئەم قسەیە ئەوەندەی تر ئاگری تێبەرداین و بوو بە بەڵگەیەکی زیندوویش بەدەستمانەوە بۆ ئەوەی لەقازانجی خۆمان بانگەشەی بۆ بکەین. ئەو ڕۆژە من لەگەڵ "کەمالی سەلیم بەگ"دا بووم. کەمال-یش وەک ئێمە کوردستانی بوو، گەنجێکی چاونەترس بوو، بەوبوایە، هەر لەوێدا مامۆستا ناکام بەسزای توندی خۆی بگات.!

خەیاڵ خەیاڵ ڕائەکێشێ؛ هەر لەهەمان سەردەمداو بەتەنیشت دەرگای دووەمی سینەمای سیروانەوە، دوو دووکان ئەملای سەرتاشخانەکەی کاک "قادر کابان"،

کتێبخانەکەی شێخ "مستەفا گولانی" بوو. کتێبخانەیەکی هەژار، کۆمەڵێ کتێب و هەندێ گۆڤارو ڕۆژنامەی لێدانرابوو. شێخ مستەفا؛ پیاوێکی قسە خۆش و بەردەوامیش مەست بوو. هەر تەواو ئەنتی شیوعی بوو. ئەوانەی هاتو چۆیشیان ئەکردو لای دائەنیشتن. هەر هەموویان زۆر دەمارگیرانە دژی شیوعییەکان بوون. ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارو کتێبانەی هەیبوون لەو بڵاوکراوانە بوون کەشیوعییەکانی پێ پەست ئەبوون‌و بەقسەی ئەوان "ڕەجعی" بوون. بۆ نموونە لەبەغداوە ڕۆژنامەی "الحریە"ی ئەهێنا، کەڕۆژنامەی قەومییە عەرەبەکانی بەغدا بوو. یان بیرەوەری ئەو شیوعیانەی کە لە شیوعییەت پەشیمان بووبوونەوە. هەڵبەت ئەم هەڵوێستانە هەر هەمووی پەچەکرداربوون‌و لەئەنجامی سیاسەتی هەڵەی شیوعییەکانەوە بەرامبەر بە مەسەلەی کورد سەریانهەڵدابوو. لەو ڕۆژگارەدا، کاری سەیرو سەمەرەیان ئەکردو کێ لەگەڵ ئەوان نەبوایە بەپیاوی ئەمریکایان لە قەڵەم ئەدا، ساویلکەبوون.!

بیرمە سەرلەئێوارەیەک دنیا تاریک بووبوو، لەناوشاردا بوو بەمقۆمقۆ. لەسەر ئەزمڕەوە ئاگرێک دیاربوو، یان ڕووناکییەکی بەشەوق. وتیان: (ئەوە پیلانەو پیاوەکانی ئەمریکان هاتوون). دوایەوەی کۆمەڵێ لەجەیشی شەعبی چووبوون، تەماشا ئەکەن کاک "حەسەنی سەید ئەحمەد"و هاوڕێکانیان و دانیشتوون ئەخۆنەوەو گۆشت ئەبرژێنن!. هەموو دەمارگیرییەک قەومی بێ یان مارکسی یان دینی وەک سەرئەنجام هەر بەڵاو کارەسات بەدوای خۆیدا دێنێ. لەسەرەتای شەستەکانیشدا، کۆمەڵێ لەو کەسانەی خۆیان بەنەتەوەیی ئەزانی و پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول بوون و لەناو خەڵکیدا وەک کاژێک ناسرابوون، لە"کانی ماسی"و لەناو سلەیمانیدا جانەوەرانە هەڵیانکوتابووە سەر کۆمەڵێ لەو کەسانەی شیوعی بوون، یان لایەنگیری ئەوان بوون و کوشتیانن. لەنێو ئەو کوژراوو قوربانیانەدا من بۆ خۆم دووانیانم ئەناسی. کاک نوری کە بە "نوری فافۆن" ناسرابوو، لەگەڵ کاک "عارفی کۆپاندروو"، کە یەکێک بوو لەو وەرزشکارانەی یاری ئاسن هەڵگرتنی ئەکردوو هاوڕێی سەردەمی گەڕەکی "حاجی حان"م بوو. سەبارەت بەو تاوان و قەسابخانەیە من لە کاتی خۆیدا قسەم لەگەڵ مامۆستا "ئەحمەد هەردی" و کاک "فەرەیدوون عەلی ئەمین"دا کرد و وتیان: (ئەو تاوانە دورو نزیک پەیوەندی بەکاژێکەوە نییەو ئێتر بڕوامان بەوە نییە لەڕێی کاری تیرۆری و هەڕەشەوگوڕەشەو خوێنڕشتنەوە پەیامی خۆمان ڕابگەیێنین).

بیرەوەری تاھەڵیکەنی شوێنەوارو شتی تازەتری تیا ئەدۆزیتەوە. وێنەی دەم و چاوی خوێناوی مرۆڤێ، کە لەلاپەڕەی یەکەمی ئەو ڕۆژنامە سویدیەدا بوو، کە لەوەختی ھاتنە ژوورەوەدا بۆ ناو فرۆکەکە، کەیبانووەکە دایە دەستم و لەسەر ڕانم دامنابوو. ئەم وێنەیە منی گێڕایەوە بۆ ساڵی (١٩٦٤)و گەڕەکی "ئیسکان". شەو ڕەشەبابوو، تا ئەھات گڤەگڤ بەھێزترو بەلوورەتر ئەبوو. بۆ سبەی بەیانی دوای نان و چا خواردن خۆم گۆڕی و چوومەدەرەوە بۆ ئەوەی بچم بۆ دەوام. کە ئەوکاتە لە دایرەی ئیشغالی سلەیمانی کارم ئەکرد. ئەو سەردەمە لەگەڕەکی ئیسکانەوە تا کانیسکان دەشتێکی ڕووت بوو. ھەر بەپێش ھاتوچۆم ئەکرد. لەگەڵ ھاتنە دەرەوەدا وەک ڕەشەباکە لوولم بدا وابوو، چەند دیوارێکی کۆلانەکەی خۆمانم بینی ڕووخابوون. لەبەر ئەوەی پشت لەڕەشەباکە ئەڕۆیشتم ھەروەکوو بەباوەش ھەڵمبگری وابوو. نەمئەزانی بەچ خێراییەک گلۆر ئەبمەوە. تازە نەشمئەتوانی بگەڕێمەوە. سەربەرەو خوار بەدەشتەکەدا بردمی. تا گەیشتمە کانیسکان و نزیک شوێنی کارکردنم. لەوێشدا چەندین دیوارو خانووی ڕووخاوی ترم بینی. بەرلەوەی خۆمبکەم بەدایرەدا. پیاوێکم بینی خوێن لەدەم و چاویەوە ئەھاتە دەرێ. ئەم دیمەنە ترساندمی و دوای یەک دەقیقە لەژوورەوە بووم. چەند جارێکیش ھەر لەو سەردەمەدا بوومەلەرزەی بچووک بچووک لەسلێمانی داوە، بەلام زیانی گەورەی بەدواوە نەبووە. کارەساتە سروشتییەکان بۆ سلەیمانی زیاتر لەڕێی لافاوەوە بووە. چەند بەفر بارینێکی گەورەیشم لەبیرە کە ماڵە دراوسێکان بەناو تونێلی بەفردا ھاتوچۆیان بۆلای یەکتری ئەکردو تەیرو تواڵ و کەوو پۆڕێکی زۆر ھاتبوونە نێو کۆلانەکانی شارەوە. ئەم بەفرە زۆرەیان پێموایە لەکۆتایی چلەکاندا بوو. جارێکیش ئاسمانی سلەیمانی ڕەوە کولله گرتی و ھەتاو کزکز دیاربوو، بەلام لەبیرم نەماوە چ ساڵێ بوو! دیمەنی سواڵکەرەکانی ئەوسای سلەیمانیشم ھەر لەبەچاوە کە بەشێکیان پیرێژن و پیرەمێردی بەساڵاچووبون، لە دەرگایان ئەداو ئەپاڕانەوەو داوای پارە یان نان یان شەکرو چایان ئەکرد. من زۆرم پێخۆش ئەبوو دایکم دوو فلسییەکم بداتێ و منیش بۆیانبەرم. یان چەند کلۆ شەکرێ. یان نانێک، بەلام زۆریشم پێناخۆش بوو دایکم بڵێ: (خوا بتانداتێ!). خۆ ئەگەر سواڵکەرەکە گەنج بوایە ھەمیشە ئەیوت: (ملی بە نۆ تەور نابڕدرێتەوە، کەچی سواڵ ئەکا). بەلام دیمەنی پیرێژنێکم لەوانی تر زیاتر لەخەیاڵدا ماوەتەوە. ئەم پیرێژنە سیس و

لەرولاوازبوو، پرچەکانی سووربوون. ڕاستەوخۆ سواڵی نەئەکرد. توورەکەیەکی ئەدا بە کۆڵیاو لەدەرگای ئەداو ئەیوت: (چەقالە ناکرن؟) .

ئەم پیرێژنە ڕەنجدەرە ناوی ئامەی چەقالە بوو! ناو بەناویش دەرویشەکانی تەکیەی قادری لەدەرەوەی شارەوە ئەهاتن و بەدەم دەف لێدان و های هوو زیکرکردنەوە بەرەو مزگەوتی گەورە ئەڕۆیشتن و ئێمەیش شوێنیان ئەکەوتین. هەموو پرچ درێژو ڕیشن و سەرو شمشێرێکیشیان بە دەستەوەبوو. هەموو جارێ ئەیانوت باحاڵیان لێبێت، ئەوسا بەشمشێر بەر ئەبنە خۆیان. هەندێکیان خۆیان بریندار ئەکرد. ئەم دیمەنانە ترسێکی زۆریان ئەخستە دڵی ئێمەی منداڵەوە. بیرمە دوای بینینی ئەم دەروێشانە بۆ شەوێ خەوی ناخۆش، ناخۆشم ئەبینی!. بەڵام ئەو دیمەنەی لە منداڵیدا دڵی منی پێئەکرایەوە، لەگەڕەکی جولەکان ئەمدی، بەتایبەتی لەجەژنی "کەپرەشینکە"دا، کە پێموایە ئەکەوتە پایزێکی درەنگەوە. کەپرەکانیان بەکاغەزی ڕەنگاوڕەنگ ئەڕازاندەوە خواردنێکیشیان هەبوو وەکوو حەڵوا وابوو ئەیاندا بەخەڵکی. جەژنێکی هێمن و لەسەر خۆو جوان و بێوەی بوو.

فڕۆکەکەمان؛ بەخێرایی حەوت سەد کیلۆمەتر لەسەعاتێکدا ئەفڕێ و سێ و دوو هەزار پێش لەسەروو زەوییەوەیە. ئەمە چ موعجیزەیەکە زانست دروستیکردووە. کێوێکەو بەئاسمانەوە، ئێستا سەرنشینەکان بەشی زۆریان خەویان لێکەوتووە. دیسانەوە داوای شەرابە سوورەکە ئەکەمەوە، کەیبانوکە، تەماشایەکەم ئەکات کەلە تەماشاکانی تری ناچێ: "تێئەگەم"، وەک پێمبڵێ: (زۆرت خواردۆتەوە بەس نییە؟!). بەڵام قسە ناکاو بۆم ئەهێنێتەوە. بەشێک لەئیسلامەکان، لەئەورووپادا گۆشتی بەرازو شەراب ناخۆنەوە، لەبەر ئەوەی حەرامە. هەموو کەسێ لەبیرکردنەوەو بیروڕای دینی و مەزهەبی خۆیدا ئازادە چی ئەکاو چی ناکات. بەڵام سەیر ئەوەیە حەرامی گەورەتر ئەخۆن و قسەناکەن. بۆ نموونە ئەو یارمەتی سۆسیالەی کە هەموویان وەریئەگرن. پارەی ئەو سکاتو باجانەیە کە دەوڵەت لەخەڵکی خۆی ئەسێنێ و لەنێو ئەو خەڵکەیشدا، ئەو باجانەی قەحبەخانەو سۆزانییەکان ئەیدەن!. دیارە حەرام پەیوەندی بەپارەی ئەوانەوە نییە؟!

ژنێکی لەچک بەسەری باریکەلە کەدوو ڕیز پێش من و لە سەرپەڕ دانیشتبوو، هەستاو بەرەو توالێتەکە ڕۆیشت!. لەچک!. ژنە سفوری لەچکدار لەوڵاتی ئێمەدا نەبوو. یان بەعەباو پەچەوە بووە. یان کە عەباو پەچە فڕێدراوە، سفور بوون و

سەریشیان ڕووت و ئازاد بووە. بۆ نموونە لەکۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکاندا لەزانکۆی سلێمانیدا سێ کچە خوێندکاری لەچکداری تێدا نەبوو. گەڕانەوە بۆ دواوەیش ئەبێ! دیاردەی لەچک لەدوای هاتنە سەرحوکمی مەلاکان لەئێران دەرکەوت و لەدوای بزووتنەوەی ئیسلامی سیاسی لە کوردستاندا پەرەی سەند. واتە ئەم پەڕۆیەی، کە سەری بەشێک لەو کچ و ژنانەی دیلکردووە، دەست و دیاری ئیسلامی سیاسییەو ئەوان بانگەشەیان بۆ کردووەو ئاگری جەهەننەمیان بۆ کردووە بەهەڕەشەو گوڕەشەو حەرامیان بۆ کردوون بەحەلال! بەڵێ ئەوان برەویان بەڕیش و لەچکداو کردیانن بەلۆگۆی سیاسی خۆیان .

دەرکەوتنی قژ ئەبێتە حەرام، بەلام پانتۆڵی تەسک و ترۆسکی جینس ئەبێتە ئەو حەلالەی ئاولێل ناکات!. ئەمە لەکاتێکدا قژ زۆرکەم ئارەزووی سێکسی ئەجووڵێنێ، بەلام پانتۆڵی تەسک و ترۆسک ئاگرێ ئەکاتەوە، پیاوی چوار ژنەیش نەیکردبێتەوە!! من بۆ خۆم پێمناخۆشە ژن سەری خۆی بەدەستی خۆی بخاتە قەفەزی پەڕۆوە. بەلام هەر تاکێکیش بۆ خۆی ئازادە کام پۆشاک و جلوبەرگ هەڵئەبژێرێ و لەبەری ئەکات و لەسەری ئەکات. سفووری لەچکدار لەئازادییەکی نیوە ناچڵ ئەچێ یان لەئاوازێکی کۆت لەمل یان لە درەختێکی سەر داپۆشراو. من دڵنیام و زۆریش دڵنیام مۆدەی ئەم ڕەوە لەچکە لە ناوچەکەدا تەمەنی لەگەڵ تەمەنی ڕژێمێک و هەندێ لەو بزووتنەوە ئیسلامییە سیاسیانەدایە کە مەحاڵە دواڕۆژی دیموکراتی و شارستانی ئەو سەرانەو ناو ئەو سەرانە ڕووناک نەکاتەوەو هەر خۆیشیان بەدەستی خۆیان ئەو قەفەزی پەڕۆیانە فڕێنەدەن.!

کەلتووری ئەخلقی ئیسلامی؛ کە کۆنترین و زاڵترین کەلتووری ناو کۆمەڵی ئێمەو خێزانەو بەحوکمی دین و شەریعەتەکەی بوون بەکۆمەڵێ یاسای نەگۆڕو تەنانەت پرسیارکردنیش لێیان بەمانای سەرپێچی و کفرو ئیلحاد لێکئەدرێتەوە. ئەخلاقی ئادەمیزادی وەک سەرئەنجام، یان بەشی زۆری بەناو گەلەوە بەستۆتەوە. وەک ئاکامیش لەش و ئارەزووەکانی لەش، لەوێناکردنی شەیتاندا خۆی ئەبینێتەوە. لە کەلتووری ئیسلامدا لەش خراوەتە ناو بازنەی حەرامەکانەوەو گەورەترین هەڕەشەیش لەئازادی ئەو کراوە. کەلتوورێکی ڕەش و سپی و خاڵی لەهەموو ڕەنگەکانی تر. کەلتورێک یان کۆمەڵە دەقێک کەچەندین سەدەیە بەهەمان تۆنی خۆی ئەدوێ‌و حوکم ئەکاو کرانەوەیەکی بەخۆیەوە

نەدیووە. ناتوانی دەستکاری دێڕێکی بکەیت و بەو بارەدا بیگۆڕیت، کەخۆی لەگەڵ ژیانی دوای چەندین سەدەدا بگونجێنێت. ئەمە گەورەترین بەربەستی پێشکەوتنی عەقڵی نەقدییە لە کەلتووری ئیسلامیدا، بەواتایەکی تر هەتا ئەو شەریعەتە لەم قاڵبانەی ئەوساو ئێستای خۆیاندا بەوجۆرەی هەن و بوون، بمێننەوە، دنیای ئیسلام و عەقڵی ئیسلامی بەلای منەوە خۆرەتاوی شارستانی و دیموکراتی و پێشکەوتن نایانگرێتەوە.

تازەترین تەکنەلۆجیای سەردەمیشیان لەبەر دەستابێت، خاوەنی جوانترین شاروشارۆچکەو شەقام و بازاڕیش بن، ئەگەر عەقڵیان وەرچەرخانی گەورەی بەسەردا نەیەت. سەرلەنوێ بەهەموو دەقێکی دینو شەریعەتدا نەچنەوەو لێکدانەوەو تەفسیری تازەیان نەبێتو پرسیار قەدەغەکەنو موقەدەس نەخەنە بەر لێپرسینەوەو گومان و خوێندنەوەیان نەکەن بەو خوێندنەوەیەی هەموو شت لەبەریەک هەڵوەشێنێتەوەو سەرلەنوێ دروستبکاتەوە، پێموانییە ببنە دۆستی ژیان و ئازادی و ژن و، بڕوام نییە لەئایندەیەکی دووردا بتوانن لەگەڵ جیهاندا هەڵبکەن و یان جیهان لەگەڵیاندا هەڵبکات.!

زۆرجار لێم ئەپرسن: (تۆ بڕوات بەخوا هەیە؟!) ئەڵێم: (بەڵێ، بەڵام ئەو خوایەی، کە خۆم ئەیزانم، نەک ئەوەی لەدەرەوەی خۆم مەلاو قەشەکان باسی ئەکەن)!. من بڕوام بەئازادی هەموو ئایین و ئاینزایەک هەیە تا ئەو شوێنەی نابنە کۆسپ و یان بکوژی ئازادییەکانی مرۆڤ. تا ئەو شوێنەی تێکەڵ بەسیاسەت و دەوڵەت نابن. تا ئەو شوێنەی حەرام و حەلاڵم بۆ دیاری ناکەن و ئازادیم وەک تاک لێناسەننەوە!. تا ئەو شوێنەی بە موو جیاوازی لەنێوان ژن و پیاودا ناکەن و پرسیارم لێ قەدەغە ناکەن و هەڕەشەی دۆزەخ و سووتاندنم لەسەر هەڵئەگرن و جەستەی خۆم ئەدەنە دەست خۆمو بڕیاری خۆم. تا ئایین لەدەوڵەت جیانەبێتەوە، ڕۆژهەلاتی ئیسلامی ئاشتی و دڵنیایی بەخۆیەوە نابینێ. فەزای سروشتی خواپەرستی و عیبادەت تەنها ناو مزگەوت و کڵێساو شوێنەکانی تری ئاین و ئاینزا جیاجیاکانە. کە ئایین کەوتە ناو سیاسەت و حوکمڕانییەوە، حوکمە موتڵەقەکانی خۆی بەتەنها حەقیقەت ئەزانێ و ئیتر لێرەوە بۆ خۆی بەڕەوا ئەبینێ هەموو جیاوازییەکانی تر بکوژێت و بەناوی خودایشەوە ئەم تاوانانە ئەنجامبدات و لەنێو دەقە پیرۆزەکانی خۆیشییەوە ئەو ڕستانە هەڵبژێرێ بۆ ئەوەی درێژە بەدەسەلاتی پاوانکردنی خۆی بدات .!

چەندین سەدەی دادگا تەفتیکییەکانی دیانییەکان لەئەوروپادا، ئەو خوێن و تاریکی و سوتاندن و بەربەرییەتەمان بۆ ئەگێڕنەوە، کە قەشەکانی کڵێسە بەرامبەر مرۆڤ و مرۆڤایەتی کردوویانە. هەروەکو چۆن مێژووی چەندین سەدەی خەلیفەو والییەکانی ئیسلام لەمەشریقەوە بۆ مەغریب، هەمەجیەتی ئەو فەرمانڕەوایانەمان پێڕائەگەیەنن، کە سەدان منارەیان لە کەللەسەری مرۆڤ و نەیارەکانی خۆیان دروستکردووە. لەپێست گورونەوە بۆ لەتوکوتکردن و مەنجەنیق داخستن و هەڵتلیشان بەزیندوویتیو تادوایی.

مێژوویەک، کە هەر لەدەستپێکەوە بریتی بووە لەمێژووی غەدرو لەچوار خەلیفەی دوای پێغەمبەر سیانیان هەر بەدەستی موسڵمانان خۆیان کوژراون و تەنانەت مردنی "ئەبوبەکر"ی خەلیفەی یەکەمی ئیسلامیش هەر جێی گومانە. مێژوویەک، کە ناوبەناو تروسکەیەکی تێدا ئەبینیو ئیتر سەرجەم هەر خوێن و تاریکیی بووە. لەپێناوی دەسەلاتدا، باوک لەکوڕو کوڕ لەباوک سڵیان نەکردۆتەوەو بەئاشکرا یەکتریان سەربڕیوە. ئەوەی مێژووی "تەبەری" خوێندبێتەوە تێئەگات چ وەحشییەتێک باڵی بەسەر سەدان ساڵی ئەم ئایینەدا کێشاوە .

ئەم توندڕەوی مێژووی خوێنە، لەو کەلتوورەوە هاتووە لەجیانەکردنەوەی ئایین لەدەسەلاتەوە هاتووە. ئەم مێژووی ژن کوشتن و نابەرامبەری و نایەکسانی و نامرۆڤایەتییەوە، لەو عەقڵەوە هاتووە، کەهەموو ڕاستییەکانی بەتەنها لای خۆی دیوەتەوەو دوای عەقڵ و پەیامی خۆی ئیتر شتێک نەبووە، پێی بوترێ عەقڵ و پەیامی جیاواز. تیرۆریستە ئیسلامییە سیاسییەکان لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا هەمان خوێنڕێژەکانی ڕۆژگاری فتوحات و سەردەمەکانی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی و سەفەوین و هاتوونەتەوە! تەنانەت ئەگەر جوانی و پاکی و عەقڵێکی ڕووناک و ئاسۆیەکی کراوەیش لەم مێژووەدا ببینن، ئەوانەیش خوێن دایپۆشیون و پەراوێز کراون و لەبیر براونەتەوە. تا ئەم عەقڵی خوێنە نەگۆڕدرێت بەعەقڵی دیالۆگ و کرانەوە، تا ئەم بەربەرییەتە جێ بۆ کلتووری ئاشتی و لێبوردن و سنگ فراوانی چۆڵنەکات. تا ئەم ڕوانینە موتڵەقە نەبێتە

ڕوانینێکی میانڕەوی گوێگر بەهەموو جیاوازییە ئایینی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگییەکانی تری مرۆڤایەتی، دوا ڕۆژێک نابێ بۆ شارستانی و دیموکراتی ئازادی. ئایدۆلۆجیا شمولییەکان بەردەوام ئەو عەقلانەبوون ئاگریان بەرداوەتە ژیان و مەرگ دۆستبوون و دەرئەنجامیش ئەوەی بۆ مرۆڤایەتییان بەجێهێشتووە هەر خۆڵەمێش بووە.

کاپتنی فڕۆکەکە ئاگاداری کردین لەوەی ئێستا چووینەتە ئاسمانی سویدەوە. واتە دوای یەک سەعاتی دیکە ئەگەینە فڕۆکەخانەی ئەرلەندا لەستۆکهۆڵم.

هەواڵەکانی ولات هەرهەمووی هەواڵی جەرگبڕ و ناخۆشن! هەواڵی گرتن و کوشتن و لەسێدارەدان و ڕاگوێزان و خاپوورکردنی گوند و سووتانی مەزراو دارستانەکان.

ئەنفالەکان؛ گەیشتوونەتە دوا قۆناغ و بە هەزاران کیلۆمەتری کوردستان زیندەوەریشی تێدا نەماوە!. هەر کەسێکیش تەنانەت ئەگەر بەڕێکەوتیش بێ، ڕێی بکەوێتە ئەو ناوچە "موحەڕەمانە" ئەکوژرێت. تراژیدیای ئەنفالەکان لەم مێژووە سووتاوەی ئێمەدا، دووکەڵەکەی درێژترین و ڕەشترین دووکەڵی دنیای ئەمڕۆیە. هۆلۆکۆستی کورد ئەنفالەکانە. قەڵەم و خەیاڵیش لەئاستی ئەم کارەساتە گەورانەدا، نەتوانای دەربڕینیان هەیەو نە ئەیشتوانن ئەو ئەدەب و هونەرەی بۆ بخوڵقێنن، کە پڕاوپڕی ئەو هاوار و ئازارانە بێت و بە پێچەوانەوە شاکاری شیعرو ئەدەبیش بالایان لەبالای بچووکترو لەخوارترە. لەو هەوالانەی کە لەم دواییەدا پێمگەیشتن، ئەڵێن: "ڕژێمی دیکتاتۆر، ماوەیەکە دەستیکردووە بەگرتن و فڕاندنی کوڕە مێردمندال و هەرزەکارەکانمان و بێ سەرو شوێنیان ئەکەن ."

دەماو دەم و بەچرپە باس لەو هەموو کوردە ئەکرێ کە بەرەو نوگرەسەلمانی بیابان ڕاپێچکراون و چۆن لەوێ ڕۆژانە ئەمرن و لاشەکانیان فڕێ ئەدرێ و سەگ ئەیانخۆن!. باسی ئۆردوگای زۆرەملێی بەعس ئەکرێ، کە هەرەمەکی ئەو هەموو خەلکی گوندە ڕاگوێزراوانەیان تێئاخنیون و بچووکترین مەرجی تەندروستی و ژیانیشیان تێدا نییە، ئەمە جگەلەوەی، کە بەعس بەدەستی

ئەنقەست تۆڕی قاچاخچێتی تلیاک و لەڕێی جاشەکانییەوە تۆڕی لەش فرۆشی ژنان بڵاوئەکەنەوە! ئەم خەیاڵو مەراقانەی دواییم دڵی گوشیم و هەستمکرد وەک تەم و مژێ سەرمی داگرتبێ وابوو. ئەو وەختەی فڕۆکەکەیشمان نیشتەوە لەپەنجەرەکەوە تەماشای فڕۆکەخانەکەو گڵۆپەکانم کرد، لەوێش تویژاڵێ لەتەمومژی تەنک خەریکبوو وردە وردە ئەتەنییەوە .

من؛ ئێستا لە ناودەروونما تەم و لە دەرەوەی جەستەیشم هەر تەم و شیعرم تەماوی و غەریبیم تەماوی و ئەمەوێ بنووم و هیچ خەوێکیش نەبینم!

ماوەیەکە باش ئەخوێنمەوەو نووسینم کەمترە. خوێندنەوەی ڕۆمان بۆ من بووە بەهاوڕێیەکی هەمیشەیی. ئەوکتێبانەی لەسەفەری پێشووی لەندەن-دا لە "دارالساقی" کڕیبوومن، یەک لەدوای یەک تەواومکردن. لە فەزای ڕۆماندا هەست بەئازادییەکی زیاتر ئەکەم. هاوڕێکانم پێم ئەڵێن: (ئەی باشە بۆ ڕۆمان نانووسی؟!). ئەوەی ڕاستیبێ: (لەبەرئەوەی زمانی مەجاز بەسەرمندا زاڵ و دەست ڕۆیشتووە. یەکدوو جارێ خۆم تاقیکردەوە، بەڵام هەرچییەکەم ئەنووسی، ئەبوونەوە بەشیعر، یان پەخشان. ڕۆمان بەبێ پلان بۆ کێشان نانووسرێ. من تاقەتی ئەو پلان دانان و مەنتیقە عەقلاییانەم نییە، کە هەموو ڕۆمانێ کەمتازۆر ئەبێ پەنایان بۆ بەرێ. بەڵام زۆر خوێندنەوەی چیرۆک و ڕۆمان کاریگەری خۆیان لەناو شیعرەکانمدا بەجێهێشتووە، دیارە بەو ئەندازەیەی قوڵاییەکی تر بدەن بەشیعریەت و ئاسۆی تریان لەبەردەمدا بکەنەوە. .

بەڵام بۆ کەمتر شیعر ئەخوێنمەوە؟! لەبەرئەوەی هەر لەسەرەتای خەملینی بەهرەوە بەتایبەتی پێشئەوەی بکەومە سەرڕێی خۆم، ترسام لەوەی بکەومە ژێر کاریگەری شاعیرە ناودارەکانەوە، ئەمە جگەلەوەی ڕەخنەی بێ بەرنامەی ڕەخنەگرانی کورد، بەردەوام شیعری ئێمەیان ئەخستە ژێر ئەو زەڕەبینانەوە، کە

لە بنەڕەتدا زەڕەبینی خوێندنەوەی خۆیان بوون، نەک خوێندنەوەی ئەو دەقەی لێی ئەدوێن. لەبەر ئەوە وشەیەک، وێنەیەک بەس بوو بۆ ئەوەی بتکەن بەدزو تەپڵت بۆ لێبدەن. ڕەخنەی سەردەمی سەرهەڵدانی شیعری ئێمە، ڕەخنەیەکی توندو تیژو پڕ لە هەڕەشەوگوڕەشەبوو. یان بەواتایەکی تر، ئەو ڕەخنەگرانە دەلیل نەبوون، بەڵکوو هەوڵیان ئەدا ونت بکەن .

بەئەنقەست ئەیانویست بتشێوێنن. نەهێڵن نشونما بکەیت و هەر بەنەونەمامی لقەکانت بشکێنن. من هەر زۆر زوو قسەیەکم کردو وتبووم: (تۆ پێم بڵێ کێ لەسەرکێیی نووسیوە. من پێت ئەڵێم ڕەخنەکەم چۆنە!) پێناسەی ئایدۆلۆژی و خەتی سیاسی بەپلەی یەکەم چۆنیەتی ڕەخنەکانی پێکئەهێنا. نەک ئەفراندن و خوێندنەوەی جیدی بۆ بەرهەمەکان. ئەی ئەگینا بۆچی لەچەندین دیوانی چاپکراوی مندا چوار پێنج قەسیدەیەکی تیانەبوو جوان بن و بەشی زۆری ئەو ڕەخنەگرانە ئاوڕی لێبدەنەوە؟! ڕەخنەی ئەوکاتانە لەشەڕە قۆچەقانی ئەچوو، یان شەڕە گەڕەکی جاران! تۆ لەگەڵ کێدا تێکەڵی و نزیکی لەبیروباوەڕی سیاسی ئەوەوە، ئەوە ئەبووە پێوانە. نەک شیعرو چیرۆکەکەت. ئەوەی لەبەشی زۆری ئەو ڕەخنانەدا باسی نەئەکران دەقەکان بوون. جارێ چەند لاپەڕەیەک بۆ ئەوە تەرخان ئەکرا، ئەدەب لەڕوانگەی فیکری مارکسییەوە چییە؟! ئەدەبی بۆرژواو وردە بۆرژوا کامەیە؟! لینین چی وت؟! بلیخانۆف؛ چۆن ئەمە لێکئەداتەوە؟! ڕەخنەی ڕیالیزمی ئیشتراکی چۆن تەماشای شیعر ئەکات؟ هەموو قاڵبەکان ئامادەئەکران و لەدواییدا تۆو شیعرو چیرۆکەکەت ئەخرانە یەکێک لەو قاڵبانەوەو سەریان لەحیم ئەکردی!. دیارە من لە هەمووان زیاتر ئەکەوتمە بەر ئەو شیرو شمشێری ڕەخنانە...

چونکە یەکەم: مارکسی نەبووم و جیاواز بیرم ئەکردەوە. دووەم: هەندێ شیعرم بەدەنگی بەرز دووابوو، ئەمەیش بۆ ئەوان نێچیری باش بوو بۆ ئەوەی چەندین داوی بەچواردەورا بۆ بنێنەوە. خۆ ئەگەر بەبارێکی تردا، شیعرەکە هەر هونەری ڕووت بوایە، ئەوسایش ئەخرایتە خانەی عەبەسییەت و هونەری ناموڵتەزیم و بەرەڵڵاو سەرلێشێواوە. تۆ شاعیر و ئەدیبی بەڵام چیت نووسیوە بۆ پرۆلیتار؟! چیت نووسیوە بۆ کرێکاران و جوتیاران؟! چەند دژی سەرمایەدارانی؟! ئیتر مەسەلە جوانی داهێنان و ئەدەب نەبوو. تەنانەت بەشێکی زۆری بایەخدان لەلایەن ئەو ڕەخنەگرانەوە بە "گۆران" لەبەر ئەوە بوو گۆران لەسەردەمێکدا مارکسی بوو، ئیلتیزامی بەحزبی شیوعییەوە هەبوو. کارگەیشتبووە ڕادەیەک،

شیعری "جوانی بێ ناوی" گۆران لەکۆڕوکۆبوونەوەو دانیشتندا تەفسیری چینایەتی بۆ ئەکرا! جوانی و ستاتیکی هونەری ئەو شیعرەیان ئەکوشت، بۆ ئەوەی هەرچۆنێک بێ، شیعرەکە لە قاڵبی ئامادەکراوی خۆیان بدەن .

لەنێوان سالانی (١٩٨٨-١٩٩١)دا لەچەندین شارو شارۆچکەی تری ناو سویدداو لەسەر داوای ئەو کۆمەڵەو ڕێکخراوە کەلتووریانەی دایانمەزراندبوون، کۆڕی شیعر خوێندنەوەم بۆ گرتن. بەسەدان کوردی بەشەکانی تری کوردستان بوون بەدۆست و هاوڕێم. جگەلەو وڵاتانەیش، کە پێشتر سەفەرم بۆ کردبوون. بەهەمانشێوە لە"ئەمستردام"ی پایتەختی هۆڵەندایش بۆ یەکەمجار یانەی کەلتووری و کۆمەڵایەتی "میدیا" کۆڕێکیان بۆ گێڕام. لەو سەردەمەدا کاک "عیماد" لەوێ بوو، لەماڵی خۆی و لەدەرەوەیش میوانداریکردم و بەدەستمەوە ماندوو بوو. شاری ئەمستردام بەڕووبارو جۆگەکانی، شاری "ڤینیسیا"ی بیرخستمەوە، ئازادی لەم شارەدا بێ سنوورە. تەنانەت تلیاکخۆرو حەشیشە کێشەکانیش هەر ئازادن. ئەم ئەمستردامە لەتورەکەیەک ئەچێ، هەموو شتێکی عەنتیکەو نەبینراوی تێدا بێت. کڵێسەو مەیخانەو کابەرێ و دوکانی حەشیشە فرۆش و یانەی نێربازی و ماڵی ژنانی لەشفرۆش و بارەگای حزبەکان و ساختمانی ئامێرە هەرە تازەکانی تەکنەلۆجیا و کۆمەڵەی خێرخوازی بەتەنیشت یەکەوە ئەبینی .

دیسانەوە دیاردەیەکی تریش هەر لەوێ سەرنجی ڕاکێشام، یەک گەڕەکی گەورەو فراوان، کە کوردەکان پێی ئەڵێن "ناوچە" هەر هەمووی بریتییە لەو خانوانەی، کە کاری سێکسیان تێدا ئەکرێ و گڵۆپی سووریان بەسەردەرگاکانیانەوە داگیرساندووە. ئەم ماڵانە هەموو کەوتوونەتە سەر شەقامەکان‌و بەشێکیان جامخانەو شووشەبەندەو لەناوجامخانەکاندا ئەو ژنانە خۆیان نیشان ئەدەن، کە ئامادەن بۆ ئەوەی کاری سێکسی لەگەڵ پیاواندا ئەنجامبدەن. ڕەگەزی جۆراوجۆر، پێست ڕەش و قژ زەردو سورو سپی و لەهەموو نەژادو ڕەگەزێ. ژاپۆنی و ڕووسی‌و لەئەفریکاوە بۆ ئەمریکای لاتین .

لەو سەفەرەدا نیوەڕۆژێکم بەسەیرکردنی ئەم جامخانانەوە بەسەربرد، بەڵام هیچم نەکرد! هەر تەماشاکردن و وردبوونەوە. ئاخر ئەم نمایشکردنە بۆ لەشفرۆشی و لەجامخانەدا، لەهەموو دنیادا تەنها هەر لە ئەمستردام هەیەو وەک بڵێی تایبەتە بە هۆڵەندا. بۆ نموونە لەئەڵەمانیا لەئەپارتماندان، وەختێ سەر ئەکەویتە سەرەوە لەهەموو نهۆمێکدا دیارە چەند شووقەیەکی تێدایە. لەوێش

گڵۆپی سوور بەسەر دەرگاکانەوە ئەسووتێن و لە هەمانکاتیشدا دەرگای دەرەوە کراوەتەوەو دوراو دووریش ناوەوەو ژنەکانت لێدیارن. لەئەمستردامدا هەرچی شتی سەیرە تۆ ئەیبینی .

بۆ نموونە کۆگایەکی زۆر گەورە و فراوانم بینی بەتەنها ئەندامی ناوگەڵی پیاوان یان ژنانی لەپلاستیک دروستکراوی ئەفرۆشت و لەسەر ڕەفەو تاقەکان ڕیزکرابوون. من خۆم بۆ ڕانەگیرا، زۆر پێکەنیم و خێرا چوومە دەرەوە. هەر لەوێ برادەرێک بۆیگێڕامەوە جا ئیتر نازانم ڕاستی و دروستی قسەکان وان یان نا؟! گوایە هەموو ساڵێ جارێک سەرگەورەی ئەم ناوچەیە لەگەڵ شاژنی هۆڵەندا کۆ ئەبێتەوە لەڕێوڕەسمێکی تایبەتیدا ڕێزی لێئەگیرێ. چونکە ئەم ناوچەیە گەڕیدەو گەشتکەرانی دنیا لە هەموولایەکەوە ڕووی تێئەکەن و ئەمەیش ساڵانە داهاتێکی باش بۆ هۆڵەندا پەیدا ئەکات! ئەمە تەنها ڕوویەکی ناو ئەمستردامە، بەلام لە هەمانکاتدا، کۆنترین زانکۆی دنیا لەم شارەدایە. بەدەیان مۆزەی گەورە گەورەی تێدایە. جگە لە کتێبخانەی هۆڵەندی خۆی، کتێبێک و سەرچاوەیەکی گرنگ نییە لەزمانەکانی دنیادا بن و بۆ هۆڵەندی وەرنەگێڕدرابن. یەکێک لەگەورەترین ناوەندەکانی بازرگانی و گەشتوگوزارە لەهەموو جیهاندا. ولاتێکی بچووک و بەلام عەقڵێکی گەورەو بەرهەمهێنەر. لەجوانیشدا ئەمستردام لەگوڵدانێکی پڕ لەگوڵ ئەچێ. لەڕاستیشدا ئەو دوکانە گوڵفرۆشانەی لەهۆڵەندا هەن وێنەیان لەدنیادا دەگمەنەو بەشێک لەولاتەکانی ئەوروپا بۆ گوڵفرۆشی ولاتی هۆڵەندا بازاڕی گەورەیانە. من بۆ خۆم زۆرجار ئەو گوڵە هەمە جۆرانە سەرنجیان ڕائەکێشام و بەدیاریانەوە ئەوەستام و لێیان ورد ئەبوومەوە. لێرەیش هەر لەسەر هەمانشێوەو تەرزی "مۆزەی مۆم"ی لەندەن موزەخانەیەک هەیەو سەردانمانکرد. وەک هەندێ سەنتەرو شەقامی لەندەن و پاریس لێرەیش هەندێ ناوچەیان هەیە بەنیوەڕوان چەند بەئاپوورەن، دوای نیوەشەویش هەروان.

بەرلەوەی بچم بۆ "بۆدابست" چووم بۆ "سۆفیا"ی پایتەختی بەلگراد. دوو ڕۆژێ مامەوە. هیچ شتێکی وای تێدانەبوو سەرنجم ڕابکێشێ، تەنها مەزارو لەشی مۆمیاکراوی "دیمترۆف" نەبێ، بۆیە وەختێکم بۆ تەرخانکردو لەگەڵ هاوڕێکەمدا چووینە ڕیزەوە، ڕیزێکی دوورودرێژو یەک لەدوای یەک، ئەوەی لەبەردەم ئەم مەزارەدا سەرنجی ڕاکێشام ئەو پاسەوانانەبوون .

بەلام چۆن ڕاوەستانێ، قنجوقیت و بێجووڵە تەنانەت پێڵویشیان نەئەتروکان. ئەمویست یەک جوڵانەوەی بچووک یان لەرەیەک یان مشەیەک یان بەرزونزمی سەر سنگیان لەهەناسەداندا ببینم، نەمئەدین!. وەک باسیانکرد ئەم پاسەوانە تایبەتیانە هەردوو سەعات جارێک ئەگۆڕدرێن، ئەوکاتەی چووینە ژوورەوە یەک لەدوای یەک بەدالانێکدا بێدەنگ، ئەبوو تەقەی قاچت نەیەت، چووینە ژێر قوببەیەکەوە. ئەوسا ڕیزەکە شێوەی بازنەیەکی وەرگرتو لەناوەڕاستی ئەم شوێنەدا "دیمترۆف"م بینی، لەسەر تەختێکو هەر لەسەر پشت پاڵخرابوو، تا سەر ناوکی بەمتیلێک داپۆشرابوو. تەنها دەستێکی هاتبووە دەرەوە، بەلام بەڕاستی هەر ئەتوت ئەوەندە نابێ نووستووە. ئەم بینینە هەر بەدەم ڕێوە بوو، چونکە ڕاوەستان نییە. تەنها وەختێ ئەگەیتە نزیکی بەلای چەپدا ئاوڕئەدەیتەوەو تەماشای ئەکەیت تا تێپەڕ ئەبیتو لەوسەرەوە لەدەرگایەکی ترەوە ئەچیتە دەرەوە. ئەم مۆمیاکردنە ئەوەندەی بزانم هەر لە مۆسکۆ و لێرە کراوە .

له مۆسکۆ بۆ لینین و ستالین و لێرەیش بۆ ئەم. لەدوای کۆنگرەی بیستی حزبی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەتی جاران و هەر لەسەردەمی "خرۆشۆف"دا لاشەی ستالین لابراو خرایەوە ناو دیوارو لەدوای لەبەریەک هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەتیش بەماوەیەک لاشەی مۆمیاکراوی "لینین"یش هەڵگیراو بەڵام هیچ زانیاریەکم نییە کە ئایا ئەوەی "دیمترۆف" ماوەتەوە یان ئەویش لابراوە؟. خۆزیا ئەم لەش مۆمیاکردنە بۆ گەورە نووسەران و هونەرمەندان ئەکران. بۆ بلیمەتەکانی وەک "تۆلستۆی و دیستۆفیسکی و پۆشکینن" بۆ ئەوانەی تەمەنی ئەفراندن و داهێنانیان نەکۆن ئەبێ و نە زریانی سیاسەت و ئایدیۆلۆجیا ڕایان ئەماڵێ و نەدەوران دەورانی زەمان لەبیریان ئەباتەوە. چەند خۆش ئەبوو، ئێمە ئێستا لەشی مۆمیاکراوی "چیخۆف یان کازانزاکی یان کامۆو یان پیکاسۆو یان بۆدلێر" و سەدانی تری لەو مرۆڤە مەزنانەمان بدیایە، ئەشێ ڕێگرێکی ئایینی و کڵێسەیی هەبێت، بۆیە نەکراون.

"بۆدابست" پاریسی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتی پێئەڵێن، لەڕاستیشدا هەروایە. ڕووباری "دانوب"ی ئەزەلی، کردوویەتی بە دوو بەشەوە. ئەو وەختەی گەیشتمە ئەوێ، کۆمەڵێ لەخوێندکارانی کوردو دۆستو ناسیاو بەگەرمی پێشوازییانلێکردم .

کاک "دیاری ئەحمەد مەجید" و کاک "محەمەدی حەفید" و کاک "هەڵۆی ڕەووف مارف هەروەها کاک "تەحسینی بادینانی"ی قسە خۆش کە لەدەمێ ساڵەوە لەوێ بوو، بۆ خۆیشی هەمیشە چرای ناو کۆڕو دانیشتن بوو. ئەو ئازیزانە چەندیان توانی منیان بەو بووکەشارەدا گێڕا. مۆزەو شوێنەوارەکان، شەقام و کڵێسا دێرینەکان، باڕو کافتریا خۆشەکان. شاری بۆدابستی لەبیر ناچێتەوە. کچانی شۆخی بۆدابست لەبیرناچنەوە. باخچەکانی و پەیکەرەکانی و باندی مۆزیکو گۆرانی و دانووبی شەوانە بریسکەداری ڕەنگاوڕەنگ، کە لە کەناریا سەیرانی فریشتە جوانەکانی و ڕیزە کافتریاو سەماگەو هەوارە فێنکەکانی هەرگیز ناهێڵن گەردی بێزاریت لیبنیشێ و هەر ئەوەندەیش نا، بەڵکوو ماندوێتی عومرت لەبیر ئەبەنەوە .

کاکە دیاری ئەحمەد مەجید؛ ئەو سەردەمە لەوێ ئەیخوێند. ڕۆژانە لەگەڵ ئەو خۆشەویستانەی تردا یەکترمان ئەبینی، هەر لەو سەفەرەیشدا بوو، کاک دیاری بڕیاریدا، کۆمەڵێک لەکورتە شیعرەکان بۆ زمانی هەنگاری وەربگێڕێ. دوای گەڕانەوەیشم بۆ سوید لەڕێی نامەوە پەیوەندیمان هەر هەبوو. هەمووجارێ کە

نامەی ئەنارد، ئەینووسی پرۆژەکەم لەبیرنەچۆتەوە. پێموایە ساڵ و نیوێ یان زیاتر، دوای ئەو سەفەرەی بۆدابست دیوانەکە بەمەجەری چاپکراو بڵاوکرایەوەو دووسێ دانەیەکیشی بۆ ناردبووم. دواتریش لەیەکدوو ڕۆژنامەی بۆدابستدا لەسەر کۆمەڵە شیعرەکە نووسرابوو.

نێوانی ڕووناکبیرانی کورد لەستۆکهۆڵم باش نەبوو! گروپ گروپ و دابڕاو بوون لەیەکتر، هەرچی کوردی باکوور هەبوون دابەشببوون بەسەر چەند ناوەندێکداو تیروشیریان لەیەک ئەسوو!. بەهێزترین کەرتیان ئەوانە بوون، کە سەر بەڕێکخستنەکانی پەکەکە بوون. توانای ماددی و دارایی باشیان هەبوو، لەبەرئەوە ئەیانتوانی چالاکی هەمەجۆر ئەنجامبدەن، پەیوەندی چاکتر لەگەڵ ئەوروپییەکاندا ببەستن. هەروەها نێوانی حزبی کۆمۆنیست- کۆمەڵەی ئێران لەگەڵ حزبی دیموکراتدا خراپ بوو.. نێوانی یەکێتی نیشتمانی و پارتی دیموکراتی کوردستانیش هەر گرژو ئاڵۆز بوو. لەبیرمە وەختێ جەژنی نەورۆز ئەهات. لەچوارپێنج لاوەو بەجیا ئەم یادە ئەکرایەوە. کۆبوونەوەو خۆنیشاندان و ئاهەنگەکانی پەکەکە گەورەبوون، بەڵام تابلێی دەمارگیرو وشک و ڕەق و داخراوبوون، ئەگەر لەبارەگایەکی خۆیاندا، یان لەبۆنەیەکدا دە ئاڵای کوردستانیان هەڵکردایە، ئەوا ئەبوو بیست وێنەی ئاپۆ بەرزبکرایەتەوە! بەرلەوەی من بگەمە سوید هەر لەسالانی (١٩٨٥-١٩٨٦)دا بوو، وەکوو گێڕایانەوە هەڤاڵێکی خۆیان لەناو ستۆکهۆڵمدا تیرۆر کردبوو، لەبەر ئەوەی لێیان جیابووبۆوە .!

من بەینم لەگەڵ ئەندامانی پەکەکەدا خراپ نەبوو، بەڵام لە هەموو دانیشتنێکدا بەردەوام جەختم لەسەر ئەوە ئەکردەوە کەپێویستە واز لەو پەرگیری و دەمارگیری و پەرستنی تاکە کەسییە بێنن. بەڵام لەوە ئەچوو گوێزیان بۆ بژمێرم!. بۆیە ئێتر لەدواییدا کۆڵمداو ئیتر ئەوەندە تێکەڵیان نەئەبووم!

لەناو ستۆکهۆڵمدا چوونە دەرەوەم کەمببۆوە، ڕۆژەکان وەک بنێشت جوون دووبارە ئەبوونەوە. بۆیە زۆترین کات لەماڵەوە ئەبووم. کە تاقەتیشم

لەخوێندنەوەو نووسین ئەچوو، خۆم بەسەیکردنی کەناڵە جیاجیاکانی تەلەفزیۆنەوە خەریک ئەکرد.

من بۆ خۆم قەت لەژیانمدا وەرزشکارو یاریزان نەبووم. وەک بیتەوە بیرم لەسەردەمێکدا، کە قوتابی ناوەندی پیشەسازی بووم لەسلەیمانی، جارێک چوومە ناو گۆڕەپانی یاری فتبۆڵینەوە، بەڵام هەر لەدووسێ دەقیقەی یەکەمدا لەبەرئەوەی من گوایە "دیفاع" بووم، دوو گۆڵی باشیان لێکردین. ئیتر هەر ئەوجارە بوو، ببڕای ببڕ نەچوومەوە بەلای یاری تۆپی پێدا! بەڵام حەزم بەسەیرکردنی ئەکردو هەتا ئێستەیش. دیارە هەموو یارییەک نا، تەنها ئەو یارییانەی لە ئاستێکی بەرزدا ئەکرێن. وەکوو یارییەکانی تۆپی پێی جیهانی، کە چوار ساڵێک جارێک ئەکرێن، یان یارییەکانی کاسی ئەورووپاو یانە بە هێزەکان. بەڕاستی لەیارییە گەورەکاندا، من بۆ خۆم هونەری لەڕادەبەدەر سەرسامکەرو جۆرێک لەنەخشەی ئەندازیاری ئەبینم! چونکە ئەوەی لەخەیاڵدا نییە ئەیکەن. ئەم تۆپە ئەڵێی بەپەتێکەوە بەستراوە وەختێ لەگۆشەی ئەمبەرەوە بۆ ئەوسەر ڕێک ئەچێتە بەرقاچی یاریزانێ. یان لەلێدانی تۆپی ڕاستەوخۆداو بەسەر دیواری لەکۆمەڵێ یاریزانی تردا ئەم تۆپە ئەخرێتە گۆشەی سەرەوەی چەپ یان ڕاستی گۆڵەکەوە. بەڵام ئەوەی هەندێجار سەروو دڵم ئەگرن یاریکردنی هەندێ یاریزانە، کە زۆر زبرو شەڕانینو ئەم دیمەنانەیش بەزۆری لەیارییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و وڵاتە عەرەبییەکاندا ئەبینرێن. هەروەها من بۆ خۆم حەز بەسەیرکردنی یارییەکانی گۆڕەپانو مەیدانیش ئەکەم، بەتایبەتی ڕاکردنەکان و بازی بەرزو یەک باز و زانە. هەر لە سویدیش بووم بەئاشنای یاریەکی ترو بەردەوام تەماشام ئەکردو یاساکانیشی شارەزابووم، ئەویش یاری تێنسی سەرزەوی بوو. وڵاتی سویدیش لەم یارییەدا لەدەمێکەوەو تا ئەو ساڵانەی دواییش هەمیشە لەپلەی یەکەمدا بوو. یارییەکانی مەلەوانیشم پێخۆشە. بەڵام ئەو یارییەی حەز بەسەیرکردنی ناکەم و بەلای منەوە یاریی نییە بەڵکو شەڕە، ئینجا بەکڵاوەوە بێ یان بێکڵاو، یاری بۆکسێن "مولاکەمە"یە! لە دنیای

ئەمڕۆدا هونەرمەندو نووسەرو یاریزانە گەورەکان، پێناسەی هەرە لەپێشن بۆ ناسینی میللەتەکانیان بەدنیا. ڕەنگە زیادڕۆیی نەکەم وەختێ بڵێم :

(ئەگەر کوردێکی یاریزانی پلە یەک هەڵبکەوێ جا لەیاری تۆپی پێدا بێ یان لەهەر یارییەکی جیهانی ناسراودا، لەڕووی ڕاگەیاندنەوە، ناڕاستەوخۆ، ئەوەندەی حزبێکو زیاتریش کاریگەری لەسەر ڕای گشتی ئەبێ بۆ ناسینی کوردو مەسەلەکەی بەجیهان!. هەڵکەوتنی یاریزانێکی پلەیەک لەکوردستان خۆیدا مەحاڵە، چونکە ئەوەی یاریزان دروست ئەکات هێزی ئابووریو پەروەردەکردنی زانستییانەو بەرنامەو دامەزراوە گەورەکانە، بەڵام بۆ ئەو کوردانەی کەوتوونەتە وڵاتانی ئەوروپاو ئەمریکاوەو یاریزانن و گەنجن، ئەم دەرفەتی هەڵکەوتنە مەحاڵ نییە. بەڕاستی لەدنیا کەم کەس ئەزانێ سەرۆک کۆماری بەرازیل یان ئەرجەنتین یان جەزائیر کێن و ناویان چییە! بەڵام هەموو دنیا ئەزانێ "بێلیە" کێیەو "مارادۆنا" کێیەو "زیدان" خەڵکی کوێیە!. دووریش نییە بەشێکی زۆری خەڵک لەدنیادا لەڕێی ئەو یاریزانە گەورانەوە وڵاتەکانیشیان ناسیبن!.

٤

هەر لەسوید؛ بزووتنەوەی ژنانو رۆڵی ئەوان لەپێشکەوتنی ئەو وڵاتەدا، هەڵکەوتنی دەیان ژنی رووناکبیرو سیاسەتمەدار تا ئەو شوێنەی پۆستی سەرۆک وەزیران و وەزیرو سکرتێری حزبە گەورەکان وەربگرنو لەکۆڕو کۆبوونەوەو سیمینارە فیکری و کۆمەڵایەتییەکاندا رۆڵی لەبەرچاو و گرنگیان هەبێ، سەرنجیان راکێشابووم، یان بەواتەیەکی تر، من کۆمەڵێکم نەئەبینی، کە هەمووی هەر پیاوبێ. دەسەڵات هەمووی هەر لای پیاوبێ. یاسا هەر پیاو داینێو لەماڵیشدا هەر پیاو دەنگی دلێربێ و هەرخۆیشی جێبەجێکەری کارەکان بێ .

لەوێ ئەمبینی ژنە هونەرمەندو نووسەرو شاعیر و وەرزشکار نەک هەر هیچیان لەوزەو داهێنانی پیاوان کەمتر نییە، بەڵکوو لەگەڵێ بواردا، ژنان لەپێشترو چالاک ترو داهێنەر تر بوون. فرۆکەوانی ژن و، ئەفسەری گەورەی ژن و ژنە شوفێری ترێلە و حادیلەو تونێل بان و سەختترین کارم ئەبینی. ئەو وزەی عەقڵ و جەستەیەم ئەبینی، کە لەوڵاتی ئێمەدا نووستوون یان خەوێنراون. ئەم بینین و هەست پێکردنە لە نزیکەوەو رۆژانە، کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر بیرکردنەوەو کرانەوەی زیاتری عەقڵ و هۆشم هەبوو. شەرم و ترسی کەڵەکەبووی دەیان ساڵی ئێمەو مانانیان رائەدا. خوێندنەوە، بیستن و فیلم و

گێڕانەوە، دوور بەدوور، هەرگیز جێگەی ئەوە ناگرنەوە، کەخۆت بەچاوی خۆت بیانبینی، بەگوێی خۆت گوێت لێیانبێو لەناویاندا بژیت. بەبێ هیچ مۆنتاژێ، بەبێ هیچ بڕین و پەڕاندن و یان پێوەلکاندنێ. بەبێ هیچکەم و زیادێک، وەک خۆیان چۆنن زیندوو زیندو ئەیانبینی. تۆ لەناو ئەم ئەزموونانەدا تێئەگەیت، کە ژن لەوڵاتی ئێمەداو لەهەموو ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا زیندووی مردووە!. یان مرێنراوەو هەست بەبوون و دەنگ و ڕەنگ و جووڵەیان ناکەیت، وەک ئەوەی هەر نەبن‌و نەبووبن وایە. بەجۆرێکی تر ئێمە ئەوەی کردوومانە "ئەگەر لایەنێکی ڕووناکی تێدا بێ" نیوەی جەستەمان و نیوەی عەقڵمان و نیوەی وزەمان کردوویانەو نەژنی مرۆڤ و نەژنی کارو نە ژنی بەرهەمهێنەری تێدا نەبووە. یان بەمانایەکی تر ئێمە بەنیوە عەقڵ و بەنیوە وزەو جەستەوە تائێستە ژیاوین. لەوڵاتێکی وەکوو سویددا مەیدانی کارو چالاکییەک نییە ژنی تێدا نەبێت، بەم پێیە ئەوەی کراوە هی هەردوو ڕەگەزەکە بووە. بەمجۆرە ئەبینین بەدرێژایی چەندین سەدەو تائێستە چ مێردەزمەیەکی ڕمووزی ئایینی و داب و نەریتی دواکەوتوو سواری سنگمان بووەو دەرئەنجامیش کۆمەڵێکی شەپلە لێدراوی بۆ خولقاندووین. ئەم مراندنەی ژن و ئەم بەکۆیلەکردنەی، لەعەقڵی ئەو دەق و شەریعەتانەوە هاتوون کە ژنیان بەتەنها وەک ئامرازێکی زاوو زێکردن و ڕابواردنی ناو جێگە تەماشاکردووە !.

لەم دەقانەدا خودا هەر نێرەو پێغەمبەرەکان هەر نێرن و یاسا و شەریعەتەکان هەر نێر دایناون و خەلیفە و والی و سوڵتان و پادشاکان هەر نێربوون و هەر ئەوەندەیشیان بۆ ژن هێشتوتەوە کەنیزەکێک بێ و بە فەرمانی پیاویش هەستێ و دانیشێ و لە پەراوێزدا بژی. یەکەمین نادادپەروەری نێو ئەو دەق و شەریعەتانە لەو غەدرە گەورەیەوە دەست پێئەکات، کە لەژنانیان کردووە. یەکەمین درۆیش هەر لەگەڵ ئەواندا کردوویانە!. ئەوەی بەژنیان ڕەوا بینیوە هەر قسەی ڕووت بووەو لەمەیدانی کارو هەق وەرگرتنیشدا ئەوان هەر سێ یەکیان بەرکەوتووە!. بەلای منەوە پێوانەی ڕاستەقینە بۆ هەر کۆمەڵێ، بۆ هەر نیزام و قانونێ، بۆ هەر سیستەمێکی حوکم، بۆ هەر حزب و ئایدیۆلۆجیایەک. بۆ هەر هەڵبژاردن و پەرلەمانێ، بۆ هەر ئایین و داب و نەریتێ، بۆ هەر خێزانێ، لەوێوە دێت: "کە تا چەند ژنی تێدا ئازادە". مافی ژنی تێدا پارێزراوە. دەنگی ژنی تێدا زوڵاڵە. کاری بۆ دابینکراوە. هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ پیاودا، لەڕووی قانوونی و شەرعی و مەدەنییەوە. من؛ ناتوانم بەهیچ ئایینێ بڵێم پیرۆز. بەهیچ

بیروباوەڕێ بڵێم عەلمانی. بەهیچ کۆمەڵێ بڵێم مەدەنی و شارستانی و دیموکراتی تا ئەوە نەزانم لەسایەیاندا ژن چۆن ئەژێ و شوێنی لەکوێدایەو تاچەند سەربەستە. ئەی بۆچی لەولاتەکانی ڕۆژهەلاتدا پیاوی عەلمانی و پیاوی دیموکراتی و بەناو پیاوی شارستانی، لەناوەندی دەسەلاتی حزب و ئۆرگانەکانی خۆیاندا کەم غەدریان لە ژن کردووە؟! تائیستەیش لەو حزب و ئۆرگانانەدا، بەڕێژەیەکی زۆر کەم هەن و ئەوانەیش لەشوێنی دەسەلات و بڕیارداندا نین و دەرئەنجامیش دیسانەوە بڕیاری دوایی هەر بۆ ئەو پیاوە عیلمانی و دیموکراتییانە ئەگەڕێتەوە. بەڵێ ئەزانم کێشەی ئازادی و دیموکراتی بەرلەوەی کێشەی ڕەگەزێک بێت کێشەی هەردوو ڕەگەزەکەیە. کێشەی مرۆڤە، کێشەی کۆمەڵی مەدەنی و شارستانییە، بەلام هەمیشە ژن دووجار چەوسێنراوەتەوە وەک مرۆڤ و وەک ژنیش!

من؛ لەلاپەڕەکانی پێشووترداو لە وەختی سەرهەڵدانی بزوتنەوەی ئەدەبی نوێخوازی ڕوانگەدا باسی ئەوەمکردبوو کە بەیانی دووەمی ڕوانگە "ئەی قەڵەمە نەترسەکان یەکگرن!" چ وروژاندنێکی کۆمەلایەتی دروستکرد. بۆ خۆم بەیەکێک لەو ناونیشانە جوانانەی ژیانی خۆمی لە قەڵەم ئەدەم، چونکە هاوارێ بوو لەپێناوی ئازدی ژن و یاخیبوونێ بوو بەرامبەر عەقڵی قفڵ لێدراوی ئەو مەلایانەی بەر لەسی و چوار ساڵ لە کوردستاندا فەتوای ڕەجمکردنیان بۆ دەرکردین و ناویان بەدەرگای مزگەوتەکاندا هەڵواسین، چونکە وتبوومان: (نابێ ژن کۆیلە بێ، ئەبێ ئازادبێ و، جیاوازی لەنێوان نێرو مێدا نەمێنێ و یەکسانی و بەرامبەری دروستبێ). بەلام لە سەرێکی ترەوە من سەرزەنشتی خۆم ئەکەم، چونکە لەدیوانەکانی سەرەتادا، وەک شیعر، تەنها لەڕوانگەی جەستەو جوانییەوە تەماشای ژنم کردبوو، واتە هەروەکو گەلێ لەشاعیرانی ڕابوردوومان و بەهەمان چاو ئەوانم بینیبوو!، ئەم قسەیە ئەوە ناگەیەنێ من لەو شیعرانە پەشیمانبم، کە بۆ جوانی ژن و جەستەی ژنم نووسیون، بەلام ئەمە تەنیا دیوێکی بینینە. نیشاندانی لایەکی ژیانی ژنە. ئەم سەیرکردنە نوقسانە. ئەی ژن وەک مرۆڤ و چەوساوە؟! ئەی ژن وەک ڕەنج و خەبات و قوربانیی؟! ئەی ژن وەک ئەوەی ژنەو چۆن ئەڕوانێتە پیاو؟! ئەی ژن ئەوکاتەی جوانی و جەستەی ئەوەرێ؟! ئەی ژن وەک پیرێژنێ؟! هەمان ئەو پرسیارانەبوون، کە لەچەند دیوانمدا نەبوون بەشیعرو نەجوولابوون و کەوتنە درەنگ وەختێ لە تەمەنما.

ڕەخنەکە لێرەوە سەرچاوە ئەگرێ، مانای تازەکردنەوەو نوێخوازیش ناکرێ خۆیان لەم پرسیارانە بدزنەوە، بەڵێ جەستەو عەقڵ. جوانی و ڕاستی، ئارەزووی سێکسی و خەباتی سیاسیشن، واتە تەماشاکردنی ژن وەک ژن و مرۆڤیش، وەک خۆشی و ئازاریش. غەزەلی کوردی، بەدرێژایی چەند سەدە ژنی تەنها وەک جوانیی بینیوەو بەس! هەرگیز تەماشای بەها مرۆڤایەتییەکانی ژنی نەکردووە. ئاخر ناکرێ شاعیر هەروەک پیاوە ئاساییەکان بە تەنها لەچاوی نازداری‌و ناسکی و جوانی چاوو برۆو قەدو بالاو سنگ و مەمکەوە ژن ببینێ. ژن ژیانەو ژیانیش ڕەش و سپی نییەو هەموو ڕەنگەکانی تێدایە. لە دیوانی "کازیوە"دا شیعرێکم بۆ "لەیلا قاسم" نووسیوە. بەلام یەکەم شیعری درێژم بۆ ژن بەو مانایەی پێشتر ئاماژەم بۆ کردبوو. لەساڵی (١٩٨٥-١٩٨٦)دا بۆ "بەیان" نووسی. ژنە کوردێکی "پ. م"ی کۆمەڵەی ئێران کە لەشەڕی پارتیزانیدا شەهیدکرا. دیارە لەو ساڵانەی دوایشدا ئەم ئاسۆی بینینە زۆر فراوانتر لەدیوانەکانی ترمدا دەرکەوتن، بەتایبەتی لەهەردوو دیوانی "ژن و باران" و "خۆم ئەو وەختەی باڵندەم"!.

هەر لەو ساڵانەداو لەسوید "پرسیارێکی جەوهەریم لەخۆمکرد" ئایا ناکرێ دوای شیعرو ئەدەب، یا هەر شان بەشان لەگەڵ ئەودا، خۆم بۆ مەسەلەی لەسەرکردنەوەو پشتگیری مافی ژنانی ولاتەکەم تەرخانبکەم؟! بە بەشداریکردن لەهەموو ئەو چالاکییانەدا، کە پەیوەندییان بەبزووتنەوەی ئازادیخوانەو دیموکراتییانەی ژنانەوە هەیە؟! بەکورتی منیش دەنگێ بم لەو دەنگانەی شێلگیرانە هاواری خۆم بکەم‌و چیم پێبکرێ بیکەم؟! خۆم وەلامی خۆمدایەوە.. بۆ نا؟! دوای گەڕانەوەیشم بۆ ولات هەروامکردوو هەتا ئێستەیش بەردەوامم و لەم ڕێپێوانەیشدا من خۆم بەمۆمێکی پشت سەری ژنانی ولاتەکەم ئەزانم و لە هەشتی مارتی چەند ساڵێک لەمەوبەریشدا بوو، لەسلێمانی هاوارمکرد: (تکایە ئەمڕۆ پێم مەڵێن "شێرکۆ بێکەس" و بڵێن "شێرکۆ شەفیقە"!).

ئەگەر سەفەر نەبووایە، ساردیو تاریکیی سوید، تەنیایی و غەریبی و مەراقی دوورەولاتی ئەیکوشتم! ئەوە هەر سەفەرو گەران بوون، کە ناوبەناوێ چون پەلکە گیایەکی بێ باران و تینوو، ئەی ژیاندمەوەو سەوزی ئەکردمەوەو سەر لەنوێ ئاوی شیعری ئەدامەوەو ئەگەر بۆ هەفتەو دوو هەفتەیش بوایە، بای باڵی خۆم ئەداو کەمێک باری دەروونیم ئەسرەوت و دۆستو ناسیاوو شیعردۆستەکانی خۆم ئەبینییەوەو لە هەمانکاتیشدا ولاتێکی ترم ئەبینی. هەموو سەفەرێ خوێندنەوەیەکی نوێ و ئەزموونێکی تازەیە. هاتنەدی خەونەکانە. بەراستی ئەو کەسەی سەفەر ناکات، یان ناتوانێ سەفەر بکات، لە ئاوی راوەستاو ئەچێت، کە ئاویش بەراوەستاوی مایەوە بۆگەن ئەکات!. دەمێک بوو خەوم بە دوو سەفەری گەورەوە ئەبینی و هەمیشە لەبالا ئاوێنەی خەیاڵما لەهاتوچۆدا بوون. یەکەمیان بۆ رووسیاو ئەویتریان بۆ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا .

ئەوەی ئێمە هەر لەسەرەتای چاو پشکوتنی ئەدەبیمانەوە، لەگوێکرانەوەی وشەکانمانەوە، لەپێرەوکە بوونی شیعرمانەوە، بە پەنجەی شیعرو ئەدەبیاتی زۆر ولاتی دیکە لەرێزی یەکەمی بەهاو بایەخدا، ناوە مەزن و پرشنگدارەکانی ئەوانمان دیوەو ناسیوە. پۆشکین و چیخۆف و تۆلستۆی و تورجنیف و

دستۆفسکی و گۆگۆل و زۆر ناوی گەورەی تریش، ڕۆژانە دراوە بەگوێماندا و باسکراون و لەسەرمان خوێندوونەتەوەو عەودالّی بەرهەمەکانیان بووین. دیارە ئەم بایەخدانە بەئەدەبی ڕووسی و ئەوەی ئێمەیش لێمان خوێندۆتەوە لەڕێی زمانی عەرەبییەوە بووە، لەپێشدا زۆرکەم و لە دواییدا زیاتر ئاشنا بووین بە شیعرو چیرۆکیان. لەحەفتاکانی سەدەی ڕابوردوودا، بەهۆی چاپکراوەکانی "دار التقدم"و دەزگا جۆربەجۆرەکانی چاپ و بڵاوکردنەوەی لوبنان‌و هەروەها میسرەوە، ئەدەبیاتی ڕووسی بەشێوەیەکی بەردەوام ئەگەیشتنە دەسمان، بەڵام دیارە ئەوە لەکوێ ڕاستەوخۆ لەزمانی ڕووسییەوە بۆ کوردی یا هەر زمانێکی ترەوە ئەدەبی وەرگێردراو بخوێنیتەوە یان لەڕێی زمانی سێیەم و چوارەمەوە، کە بێگومان ئەشێوێن‌و ڕەنگە بەناتەواویش بگەنە لات.

یەکەمجار پەیوەندیم لەگەڵ کاک "شۆڕشی د. خالید"دا کرد، ئەو بەڕەسمی کاری بانگهێشتی بۆ جێبەجێکردم و بۆ ناردم. چونکە سەفەرکردن بۆ ڕووسیا پێویستی بەڤیزە وەرگرتن هەبوو. بە پێچەوانەی وڵاتەکانی ڕۆژئاوای ئەوروپاوە. دواتر سەردانی سەفارەتی یەکێتی سۆڤیەتم کرد بۆ داواکردنی ڤیزەو لە هەفتەیەکدا جێبەجێکراو ڕۆژی سەفەرم دیاریکرد .

من؛ مەبەستم بوو سەردانی دوو شاری گەورە بکەم، یەکەم لینینگرادو دووەمیان مۆسکۆ. پێمخۆش بوو، بەپاپۆڕو دوایی بەشەمەندۆفێر گەشتەکەم بکەم.

ئاشکرایە زەریای "بەلْتیک" کەوتۆتە نێوان سویدو فینلەندەوە گەشتی پاپۆڕ بۆ گەیشتنە "هیلسکنی" شەوێکی ئەوێت، ئەوە یەکەمجاریش بوو سواری پاپۆڕی چوار پێنج نهۆمی ببم. بلیتەکەیشم وابڕیبوو هەر لەدوای گەیشتنە هیلسکنی، یەکسەر سواری شەمەندۆفێرببم بۆ "لینینگراد ".

دەمەو ئێوارە سواری پاپۆڕ بووم، لە سەعات هەشتدا دەرگاکان داخران و وردە وردە لەکەناری ستۆکهۆلْم دوورکەوتینەوە. ئەم جۆرە پاپۆڕانە لەناوەوە نیمچە شارێکن بۆ خۆیان. هەموو پێداویستییەکانی ژیان و گەشتکردنیان تیادا دابینکراوە، هەر لەچێشتخانەو بارو کافتریاو بازاڕەوە تائەگاتە سەر دیسکۆو هۆڵی سەماو بەدەیان ئامێری یاریکردن. نهۆمی ژێری ژێرەوەو نهۆمی یەکەمیش ئۆتێلن. لەبەرئەوەی من ئەمزانی ئەگەر ژووریش بگرم خەوم لێناکەوێ لەبەرئەوە وازم لەوەهێناو بڕیارمدا تابەیانی بەخبەربم و ئەگەر ویستیشم سەرخەوێ بشکێنم ئەوا هەر لەسەر کورسییەکان، بەدانیشتنەوە

بنووم!. تۆ کە بەوشکانی و ئاسماندا سەفەرتکردبێ پێویستە سواری پاپۆڕیش بیتو زەریایش ببینی. بینینی زەریا لەنزیکەوە، نە ئەوەیە دوراو دوور بیبینی و نەئەوەیشە لەوێنەو فیلمدا بینیوتە. چونکە ئەو گۆشانەی کامێرایەک ئەیانگرێ یان وێنەگرێ هەڵیانئەبژێرێ ئەوە گۆشە نیگای تۆ نین وەختێ لەناو زەریادا و لەچەندین ڕوانگەوە، بەزیندوویی ئەیبینی و لەچەندین ساتە وەختی جیاجیادا بەڕووناکی و بەتاریکی و لەبەر هەتاوو یان لەبەر باراندا هەستی پێئەکەیت. ئەوەی سواری ئەسپێک بووەو تۆ تەماشای ئەکەیت، ئەوە تۆ نیت وەختێ خۆت سوار ئەبیت و ئەسپەکەی ئەویش ئەو ئەسپە نییە کەخۆت سواری ئەبیت .!

ئێمە لە نەخشەکاندا زەریا ئەبینین، ڕەنگی شینەو کەنارەکانیشی دیاریکراون، بەلام ئەو وەختەی خۆت لەناو زەریادا بیت، ئەبینی نە ڕەنگێکەو نە دووەو نە سەدو نە کەنار دیارەو نەهیچ!. تاریکبوو. سەرکەوتمە سەرەوە بۆ دوانهۆمی پاپۆڕەکە، (با)ی زەریا هەڵیکردبوو، بەلام توورە نەبوو. هێشتا هەر هێوربوو. لەپایینی پاپۆڕەکەدا خۆمدابوو بەسەر بۆرییەکانی لێوارداو تەماشای ئەو شەقامی ئاوەم ئەکرد، کە ڕۆیشتنی پاپۆڕەکە لەدوای خۆیەوە دروستی کردبوو. شەقامێکی سپی لەئاو. لە دوورەوە باریک و بەلام لەنزیکەوە پانوپۆڕ. کەفە ژیلکەی زەریا هەڵئەتۆقین و لە پڕێکیشدا ئەنیشتنەوەو لەچاوان ون ئەبوون. هاژە هاژێکی ئەبەدیی کەسرەوتی بۆ نەبووە. ئەوەتەی ئەم گەردوونە دروستبووە، ئاسمانێکی نزم و ئەستێرەی تازەو پاک و جریوە جریو گەش و هەر ئەوە نەبوو بەدەست نەیانگری. بەلام زەریا لەشەودا سامێکی هەیە، ناتوانی نەترسی و دڵنیابیت. ناتوانی بیر لەنهێنییەکانی ژیان و مردن و بوون و نەبوون نەکەیتەوە. ناتوانی ئاسایی بڕوانیتە ئەو زەریایەی لەناویدایتو لەژێر ڕەحمەتی شەپۆلەکانی و هەڵچوون و داچوونیا کڕ نەبیت و چاوەڕوانی هەر چارەنووسێک نەبیت، کە ئەو بۆت دیارینەکات و خۆتی لێ لابدەیت، نا..ناتوانی خۆت نەدەیتە دەس ئەو سام و هەیبەتەی زەریا هەیەتی. ئەو سامەی هەوڵئەدا ڕاتکێشی بۆ ناوخۆی. تۆ لەناو زەریادا لەمانای بێ کۆتایی بوون ئەگەیت، چونکە هیچ شتێ دیارنییە جگە لەزەریاو جگە لە هاژە هاژێ، کە بڕانەوەی بۆ نییە، مانگ و ئەستێرەکان و هەور دڵنیات ئەکەنەوە لەچواردەورێکی بەئاپوورەتر. زەریا لە شەودا، ئەگەر بەتەنیا تەماشای بکەیت وەک ئەوەی من تەماشامکرد کپترو تەنیاترت ئەکات، خەیاڵت لاڵ ئەکات!، چون ئەوق بوویەک ئەوەستی و ورد ئەبیتەوە. بەلام نازانی لەچی ورد ئەبیتەوە!، نزیکەی سەعاتێک بەوجۆرە مامەوە،

بەڵام وەختێ (با)ی زەریا تۆزێ توورەبوو، دایچڵەکاندم و یەکسەر ڕوومکردەوە خوارەوەو ناو خەڵکەکە. هەندێجاریش خۆشییەک لەنەناسیاویدا هەیە واتە کەس نازانێ تۆ کێیتو چیت و بۆ خۆت ئەسووڕێیتەوەو ئەگەڕێیتو چاوێک نییە بەتایبەتی لەسەر هەڵس و کەوتت بێ! لەشەمەندۆفێردا هات وچۆ سنووردارەو لە ئۆتۆمبیل و فڕۆکەیشدا هەر دانیشتنە. بەڵام لەم پاپۆڕە گەورانەدا، لایەنی کەم، هەست ئەکەیت لە ئەپارتمانێکی گەورەدایت و ئەتوانی بەئارەزووی خۆت بجووڵێی. لێرە تاقەتت چوو، ئەچیتە ئەولاو ئەتوانی زوو زوو شوێنەکانت بگۆڕیت. لەبارەکەدا گەنجێکی خەڵکی "مەغریب"م ناسی. سەرەتا ئەو پرسیی: (تۆ عەرەبی؟!) وتم: (نەخێر). پرسیەوە ئەی ئێرانیت. وتم: (نەخێر). ئینجا وتی: (باشە تۆ بە زمانێکی عەرەبی باش قسە ئەکەیت ئەی چیت؟)، وتم (من کوردم). زەردەخەنەیەک گرتی و وتییەوە: (سەلاحەددینی ئەیوبی کورد بوو. بیستومە). وتم (ئەی تۆ)، وتی: (منیش عەرەب نیم و ئەمازیغی وڵاتی مەغریبم). من وتم: (ئێوەیش وەک ئێمە ژێردەستەن!). وتی: (ڕاستەو ئەمە ڕێکەوتێکی زۆرباش بوو یەکترمان ناسیی). ئیتر کەوتە هەڵڕشتنی دەردەدڵ و زوخاوی خۆیو لەبەر ئەوەی هەردووکیشمان بەیەک ئاگری عەقڵی شۆڤێنی عەرەبی سووتابووین، ئەوەی ئەمانوت نەمانئەوتەوە. ماوەیەک بەیەکەوە دانیشتین و دواتر هاوڕێکانی هاتن بۆ لایی و ئەویش هەستاو بەگەرمی خواحافیزی لێکردم و ڕوویکردە هاوڕێیەکانی وتی: (ئەم پیاوە کوردەو کوردیش وەک ئێمە لەبەشێکی وڵاتەکەیاندا لەلایەن نیزامی شۆڤێنی عەرەبەوە ئەچەوسێنرێنەوە!). لەناو پاپۆڕەکەدا شوێنێکی تایبەت تەرخانکراوەو مەکینەی یاریکردنی تێدا دانراوە، بۆ خۆ خافڵاندن و وەخت بەسەربردن. چووم بۆ ئەوێ و ویستم بەختی خۆم تاقیبکەمەوە، هەندێ پارەی وردەم پێبوو. کەوتمە یاریکردن جارێک و دووجارو چوار جارو بەڵام هیچ. لەولامەوە ژنێک بەتەنیا خەریکی یاریکردن بوو، لەڕۆژهەڵاتی ئەچوو، لەپڕ مەکینەکەی هاڕەی کردوو پارەیەکی زۆر هەڵڕژایە ناو گیرفانە ئاسنینەکەی دامەنەوە، بۆیدەرچوو! بەڵام باش بۆیدەرچوو، سەیریش لەوەدابوو بەکوردی کرمانجی هاواریکردو ئەوەندەی پێنەچوو دوو منداڵەکەی بەڕاکردن هاتن بۆلای. لە دڵی خۆمدا وتم: (باش بوو بەختی کورد نەنووستبوو، بۆ من دەرنەچوو بۆ ئەو دەرچووو!).

بۆ ئەم سەفەرە دوورودرێژانە من هەمیشە کتێبێک لەگەڵ خۆمدا ئەبەم، بەتایبەتی ڕۆمان، ئەوە جاری سێیەمم بوو، "زۆربا"ی کازانتزاکی بخوێنمەوە. دەگمەنن ئەو

ڕۆمانانەی پیاو تاقەتی هەبێ دوو سێجاری بیانخوێنێتەوە. بەڵام (زۆربا) لەو کتێبانەیە ئەو بێتاقەتییەت لادروست ناکات. لەگەڵ هەر خوێندنەوەیەکی تازەدا، وەک ئەویش تازە ببێتەوە وایە. زۆربا، بینینی ژیانە بەڕووتوقووتی! دوور لە هەموو شەرم و پەردەپۆشی و ماکیاجکردنێکی ساختە. ژیانی مرۆڤێکە بۆ ئەوساتە وەختەی کە تیایدایەتی و دوای ئەوەش چش لەهەموو شتێ! لای زۆربا "ئێستا" هەیەو ڕابوردوو ڕۆیشتووەو داهاتوویش نەهاتووە .

زۆربا؛ ئەزموونەو تاقیکردنەوەو چێژکردنی هەموو شتەکانە، بە تاڵ و شرین و بەزێرکەوتن و سەرکەوتنەوە. کتێبی ژیان خۆی زۆربای فێرکردووە نەک کتێبی ناو خوێندنگاو بڕوانامەکان. ئەو وەختەی زۆربا قسە ئەکات، تۆ ناتوانی گوێی بۆ نەگری! چونکە درۆ بەدەم خۆی و بەدەم ژیانەوە ناکات و بێ پێچ و پەنا پەنجە ئەخاتە سەر هەموو شتەکان. زۆربا؛ ڕەنج ئەدا، ماندوو ئەبێ، کار ئەکات، بەڵام ئەو وەختەی ڕەنجەڕۆئەبێ، ناگری و دەستە ئەژنۆ نابێت. بەڵکوو لەسەر ترۆپکی نائومێدی سەما بۆ ژیان ئەکات! وەک ئەوەی هیچ ڕووینەدابێ. ئەو شەوە دوو بەشێکی ڕۆمانەکەم خوێندەوەو هەر لەسەر کورسییەکەم لەگەڵ زۆربادا خەوم لێکەوت. نازانم چەند بوو، بەڵام وەختێ چاومکردەوەو چوومە قەراغی پاپۆڕەکەو تەماشای زەریامکرد، بینیم یەکەم گزنگی هەتاو سەر ڕووی ئاوەکەی بەتوێژاڵێکی زێڕین ڕەنگکردووەو زۆربایش لەسەر یاڵی شەپۆلەکان سەماکەی خۆی ئەکات .

بابۆڵەکەی پیرەمێرد؛

گوڵەکەی شاکیر فەتاح، هەللور بلورەکەی گۆران

ئەو وەختەی لەبەندەری هیلسنکی دابەزین، لەکاتی چوونە دەرەوەدا گەنجە ئامازیغیەکەم بینیەوەو دوور بەدوور دەستی بۆ هەڵبڕیم و منیش هەروا. ئێستە یەک سەعاتم لەبەردەمدایە ئەبێ بگەمە وێستگەی شەمەندۆفێر و بەرەو لینینگراد بڕۆم!

ئەو واگۆنەی ژمارەی کورسییەکەی منی لێبوو، دۆزیمەوەو چوومە سەرەوە. پاش چەند دەقیقەیەک شەمەندۆفێر جوڵاو کەوتەڕێ. بەمنەوە هەر شەش حەوت کەسێ لەواگۆنەکەدا بوون، بەڵام لەوێستگە نزیکەکانی تری ڕێگا بەرەبەرە خەڵکی تر پەیدا بوون و هاتنە ژوورێ. ئەو وەختەی چووینە سەر سنووررو کۆنترۆڵی پەساپۆرتەکانیانکردین و کەوتینە ناو خاکی بەرینی کۆمارە یەککرتووەکانی سۆڤیێتەوە، هەر بەوێستگەی شەمەندۆفێرو خانووبەرەو شەقام و دوکان و بازاڕی ئەو شارو شارۆچکانەدا زانیم لەوڵاتێکی دواکەوتوودام! بەبەراوورد لەگەڵ ئەورووپای خۆرئاوادا. جادەی ناڕێک و پێک و خانووی کۆن و خەڵکێکی هەژارم ئەبینی. لەهەندێ وێستگەدا ئەو جوتیارانە سوار ئەبوون کەجلوبەرگی بەریان شڕو برسێتیان پێوە دیاربوو. نیوەی زیاتری سیاسەتی ئەم دەوڵەتانە پڕوپاگەندەی لەڕاستییەوە دوورو تەفرەدەرن.

ئێستا ساڵی (١٩٩٠)ی زایینییە و سەردەمی "گۆرباچۆف"و ڕیفۆرمەکەیەتی، سیستەمی دەوڵەتی سۆڤیەتی حەفتاوو سێ ساڵە، وەک ئەڵێن لە غەرغەرەی

سەرەمەرگدایە! پێئەچێ بەرەو لێکترازان و هەڵوەشاندنەوە بڕوات، ڕووداوەکان زۆر بەخێرایی تێئەپەڕن و لەوانەیە وەرچەرخانی گەورە لێرەو لەدنیادا ڕووبدەن و سەرلەبەری ئەو دنیایەی جاران بێتە گۆڕین و جیهانێکی تری جیاواز دروستبێت.!

لەناو شەمەندۆفێرەکەدا بیرم لەوە ئەکردەوە: باشە ئەم شۆڕشی ئۆکتۆبەرو یەکێتی سۆڤیەتە بۆ کورد چۆن بوو؟! یان بەمانایەکی تر ئەم وڵاتەی ناویاننابوو "قەڵای گەلان" چی بۆ گەلی کوردستان کرد؟! لەسەردەمی لینین خۆیدا باشترین پەیوەندییان لەگەڵ تورکیای کەمالیدا هەبوو! ئەمە لەکاتێکدا ئاشکرایە ئەتاتورک چی بەو میللەتە هەژارەی ئێمە ئەکرد. دوو جاریش لەگەمەی سیاسیداو لەبازاڕی بەرژەوەندییەکاندا ئێمەیان کرد بەقوربانیی. یەکەمیان لەڕوخانی کۆماری مەهابادداو دووەمیان: لەسەرەتای شەستەکاندا، وەختێ لەڕێی مەنگۆلیاوە ویستیان مەسەلەی کورد لەکۆمەڵی نەتەوە یەککرتووەکاندا بخەنە بەرباس‌و بڕیارو بەڵام دیسانەوە پەشیمان بوونەوە. ئەمە جگەلەوەی بەسەدان کوردی باشووری کوردستان، بەدرێژایی تەمەنی شۆڕشە تازەکانی، بەفڕۆکەو تۆپ و دەبابەی سۆڤیەت لەناوچوون و بەهەزاران گوندی هەر بەهۆی ئەو چەکانەوە خاپوورکران! یەکێک لە دۆستە نزیکەکانی ڕژێمی "سەدام حسەین"ی دیکتاتۆر، سۆڤیەت بوو. دوا شتێ کە قیادەی سۆڤیەتی بیریان لێکردبێتەوە. مەسەلەی مافی گەلان و مافی مرۆڤ و چارەنووسی میللەتانی وەک ئێمە بووە .

خەیاڵم ئەڕواو هەر ساتەی وەک باڵندەیەکی بزێو بەسەر لق و پۆپی درەختێکی ڕابوردووەوە ئەنیشێتەوە. گێڕانەوە، بەپلەی یەکەم ڕابوردووی هەیەو لەبنەڕەتیشدا هونەری گێڕانەوەی ڕۆمان گەڕانەوەیە بۆ زەمانە بەسەرچووەکان. هەمیشەیش ئەمکارە لەڕێی شوێنەوە ئەنجام ئەدرێت. لەبەرئەوەی من ئێستا بەرەو لینینگراد ئەڕۆم، ناوی ئەو شارەو لینین بەسن بۆ ئەوەی بمگێڕنەوە بۆ لای کۆمۆنیستە کوردەکان .

ئەوەی ڕاستیبێ من بۆ خۆم هیچ گیروگرفتێکم لەگەڵ کۆمۆنیستەکانی کوردستاندا نەبووە. بەشێکی زۆری ئەو شیوعییانە هاوڕێم بوون و لەنزیکەوە ناسیومن و پیاوی دڵسۆزو تێکۆشەریش بوون و قوربانیی زۆریشیانداوە، بەڵام تاسەر ئێسقان لەزۆر جومگەی مێژوویدا هەڵەیان بەرامبەر چارەنووسی کورد کردووەو حزبەکەیشیان پاشکۆیەکی بێ ئیرادەی سیاسەتی سۆڤیەت بووە. لەمۆسکۆ چی وترابێ، ئیتر هەر ئەوەبووەو پەیڕەو کراوەو گوێیان لەهاواری

میللەتەکەی خۆیان نەگرتووە. هەڵبەت زەقترین هەڵەو خەتای شیوعییەکان بەرامبەر بەمەسەلەی کورد، زۆرجار، ئەوە بووە لەئاست خواستە نەتەوەییەکانی کورددا پێچەوانە جووڵاونەتەوە. هەر لەبەر ئەوەیشبووە نەیانتوانیوە لەناو کورددا پێگەی گەورەو جەماوەری بەرفراوانیان هەبێت. ساڵانێکی دورودرێژ لەئاست سیاسەتی سۆڤیەتی لەعێراقدا نەک هەر بێدەنگبوون، بەڵکوو پشتگیری سیاسەتی بەعسیان کردووە بەتایبەتی لەڕۆژگاری "بەرەی نیشتمانی و پێشکەوتوو"دا!

بەڵام من هەمیشە بەڕێزەوە تەماشای هەڵوێستی ئازایانەی ئەو کادیرو سەرکردە دیارانەی ئەوانم کردووە کەبوونەتە قوربانیی سەردەمە جیاجیاکانی حوکمڕانی لەعێراق و کوردستاندا، جا لە هەر باڵێکی ئەو حزبەدا بووبن. خۆ قوربانییە گەورەکانی وەک "جەمال حەیدەری" و "نافع یونس" و "ڕەووفی حاجی قادر" و قارەمانی وەک "ئەحمەد حەللاق" و "شێخ عەلی بەرزنجی" و زۆری تریش، کە هەرگیز بیرناچنەوە. وەک پڕۆژەی سیاسیش دەرهەق بەچارەنووسی کورد، بیروڕای ڕوون و بێ پێچ و پەنای سیاسەتمەدار و ڕووناکبیرێکی گەورەی وەک "جەمال حەیدەری" بەتایبەتی لەو ڕابوردووە دوورەدا جێی ئاماژە پێکردن و سەردەق شکاندن و نموونەیەکی زیندووی ئەو مێژووەیە. بەڕاستی شیوعییەکان لەعێراق و کوردستاندا، بەشێوەیەکی گشتی ڕووباری خوێنیان بۆ ئازادی و دیموکراسی داوە، بەڵام لەهەمانکاتیشدا وەک حزب و قیادەی حزب، زنجیرەیەک هەڵەی کوشندەیان کردووە، کە ناکرێ باس نەکرێتو ڕەخنەیان لێنەگیرێ و بەسەریاندا تێپەڕین. بەتایبەتی من مەبەستم لەساڵانی (١٩٥٨-١٩٦١)و هەروەها ساڵانی (١٩٧٤) و بەرەو ژوورە تا ئەوکاتەی کاسترۆی عێراقەکەیان! کەوتە دروێنەکردنی ئەوانیش!

لەواگۆنەکەدا یەکێک هاواری لەیەکێکی تر کردوو بانگی کرد "ئەحمەدۆف". ئەم بانگکردنە خەیاڵی منی بردەوە بۆلای ناوی مرۆڤ بەگشتی و ناوی کوردی بەتایبەتی. بێگومان تا بەر لەسەدەیەکیش بەشی هەرە زۆری ناوەکانی هاووڵاتی لای ئێمە، سەرچاوەیان هەر ئایینی ئیسلام بووەو لەوێوە وەرگیراون. بەتایبەتی ناوی "محەمەد"ی پێغەمبەرو هەرچوار خەلیفەکەی ئیسلام "ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی" لە هەموو ناوەکانی تر چ لەلای ئێمە و چ لەڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا ژمارەیان زۆرترەو ڕەنگە تائێستەیش لەگوندەکانی کوردستاندا هەر وابێت.

دیاره لەکۆنەوە هەندێ ناوی کوردی چ بۆ پیاوو چ بۆ ژن هەر هەبوون، ڕەنگە بشێ ناوی میللی و کەلتوورییان لێبنێین، چونکە سەرچاوەیان یان دیاردەکانی ناو سروشت و گوڵ و ڕووەک بووە، یان لەبەیت و داستانە کوردییەکانەوە هاتوون وەکوو: "نێرگز و ڕێحان و خونچەو کاکڵ و سیامەند و فەرهاد و ڕۆستەم و زۆراب و مەم و زین و ئاسکە و ناسک" و زۆر ناوی تریش. لەلایەکی تریشەوە کورد بۆ خۆی ناوە عەرەبییەکانی کورداندووەو لەبنەوە هەڵیتەکاندوون، وەکوو محەمەد بووە بە حەمە و مەحمود بووە بە خولەو عومەر بووە بە هۆمەر و عەلی بووە بە ئەلی و تادواین. بەڵام ناوی تازەی کوردی لەباشووری کورستاندا بەلای منەوە لەگەڵ سەرهەڵدانی بزووتنەوەی کوردایەتی و ڕزگاریخوازی کورددا هاتۆتە کایەوە بۆیەکەمجاریش لەخێزانە مونەوەرەکانەوە دەستپێکردووە. ئەم ناو نانە تازانە بەکوردی، خۆی بۆ خۆی، نیشانەی جۆرێک لەهۆشیاری ئەو خێزانانە ئەگەیەنێ و لەهەمانکاتیشدا نیشانەیەکە بۆ ئەوەی، ئەو باوکانە، بەرەنگاری ناوی عەرەبی و ئیسلامی ببنەوەو وەک سەرپێچیەک لە کۆمەڵی ئەوسا، ناوی کوردی تازە لەمنداڵەکانیان بنێن. بۆ نموونە لە سەرەتای چلەکاندا بێکەس ناوی هەر چوار منداڵەکەی خۆی بەمجۆرە هەڵبژاردووە. "نەشمیل و شێرکۆو فریشتەو گەزیزە". بەڵام ئەوەی بەلای منەوە سەیرەو تاڕادەیەکیش جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە: بەشی هەرە زۆری سەرکردەی شۆڕشەکانی کورد، ئەوەندەی من زانیاریم هەبێ، ناوی منداڵەکانیان بەعەرەبی ناوە، یان لەمێژووی ناوە دیارەکانی ئایینی ئیسلامەوە وەریانگرتووە. ئەمە ڕەنگە بۆ هاوولاتییەکی ئاسایی هیچ گرفتێکی تێدا نەبێت. بەڵام بۆ ئەو سەرکردانەی ڕابەری شۆڕش و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی بوون جێی پرسیارە! بۆچی؟! ئەشێ وەڵامی هەرە زەق ئەوەبێت، کە لەو سەردەمانەدا ئەو ناوە ئیسلامیانە باوبوون و لەمەیشدا خەوشێک نەبووە، ڕاستە بەڵام ئاخر ئێمە باس لەو سەرکردانە ئەکەین، کە ژیانی خۆیان بۆ مەسەلەی کوردو کوردایەتی و شۆڕش تەرخانکردبوو. با سێ سەرکردەی هەرە دیار بکەین بەنموونە:

یەکەم: شێخ مەحمودی حەفید ناوی کوڕەکانی "ڕەووف و بابەعەلی و لەتیف" بوون. دووەم: قازی محەمەد کوڕەکەی ناو ناوە "عەلی". مەلا مستەفای بارزان کوڕەکانی ناوناوە "لوقمان و عوبەیدوڵلاو ئیدریس و مەسعود"، بۆ کچەکانیشیان نازانم! ئەو ناوانەی لییاناون چیبوون؟! چونکە هیچ زانیارییەکم لەوبارەیەوە

لانییه!. ئەم خەیاڵانە وردەوردە بردمیان بۆ ئەوەی بەدوای شتە بچووکەکانی ژیانی کۆمەڵی لەئەدیبان و ڕووناکبیرانی کورددا بگەڕێم و باسیانبکەم. مەبەستم لەو خوو دیاردەو جۆری جلوبەرگ پۆشین و ڕەوشتانەیە، کە مێژوونووسان ناچن بەلایاندا و تەنانەت ناکەونە پەراوێزی باسەکانیشیانەوە .

بۆ نموونە وەک ئەیگێڕنەوە: ئەحمەد بەگی ساحێبقڕان "حەمدی" شاعیر لەسەرو دەمێکدا سەری بچوایە نوێژی نەئەچوو، بەڵام لەدوا ساڵەکانی ژیانیاو تامردنی بەردەوام خواردویتییەوەو ئیتر نەچۆتەوە بەلای مزگەوت و نوێژو ڕۆژوودا .!

پیرەمێردی شاعیر؛ گوێینەداوەتە پاکو خاوێنی جلوبەرگ و بابۆڵەی نان و کەبابی خستۆتە گیرفانی و چاکەتەکەیەوەو ئەو گیرفانەیشی پەڵەی چەورایی بەردەوام پێوە دیاربووە .

شاکیر فەتاح؛ هەمیشە پاک و خاوێنو شیک بووەو زۆرجاریش گوڵێکی لەیەخەی چاکەتەکەی داوە .

گۆران–ی شاعیر لەکۆیە حەز لەکچێک ئەکات و لەسەر ئەم حەزە کەسوکاری کچە ڕۆژێک ئەیگرن و لێی ئەدەن. ڕەفیق حیلمی؛ کەسێکی زۆر دڵناسک و لەڕادەبەدەر عاتیفی بووە. بەختیار زێوەر؛ سدارەی لەسەر ئەکردو پیاوێکی کەڵەگەت بوو. لەسەرودەمێکدا شێخ سەلامی شاعیر؛ دەم و چاوو سمێڵی کوت ومت لەستالین ئەچوو. لە سلێمانی و لەڕۆژگاری خۆیدا قۆزترین کوڕی سلەیمانی "شێخ نووری شێخ ساڵح"ی شاعیر و ڕووناکبیر بووەو ژنان ئەوەندە تامەزرۆی بینینی بوون، لەکونی دەرگاوە تەماشایان کردووە. لەکۆڕو کۆبوونەوەی خۆبەخۆو تایبەتیدا و لەناو هاوڕێکانیدا کەس ئەوەندەی "عەلادین سوجادی" نوکتەی سێکسی نەگێڕاوەتەوە. بێخودی شاعیر؛ گاڵتەی بەشیعری تازەی گۆران کردووەو وتویەتی ئەمە لەهەللووربلور تەکامە ئەچێ!. تەنیا شەوێک، کە بێکەس تیایدا نەیخواردەوە ئەو شەوە بوو کە بۆ بەیانی کۆچی دوایی‌کرد .

ماوەیەک نێوانی بێکەس و پیرەمێرد خراپ بووەو بێکەس بەشیعرێک هەجوویکردووە. "گیو موکریانی" لە هەولێرەوە بەخۆی و کامێراکەیەوە بەتایبەتی دێت بۆ سلەیمانی تا بە بەرگی کوردی و سەروپێوە وێنەی شاعیرەکانی ئەوکاتەی سلەیمانی بگرێت. جلە کوردییەکانیش جلی "گیو موکریانی" خۆی ئەبێت و لەبەرئەوەی بێکەسیش قەڵەوو زۆر بەخۆتر بووە لە

گیو موکریانی؛ وەختێ ئەیکاتە بەری شیرەیەک لەستارخانی دێت و هەڵئەتەقێ!. ئەو دوو وێنەیەی پیرەمێردو بێکەس بەجلی کوردییەوە گرتوویانەو تائێستەیش بڵاوئەکرێنەوە، یادگاری ئەو سەفەرەی گیو موکریانییە بۆ سلەیمانی .

محەمەد ئەمین زەکی بەگی؛ مێژوونووسی بەناوبانگ لەڕۆژەکانی دوایی ژیانیا زۆر نەخۆش ئەبێ و دکتۆر بەتەواوی هەموو خواردنێکی چەوری لێقەدەغە ئەکات، بەڵام ئەو بەپێچەوانەوە حەز لە کەباب ئەکات و ئەنێرێ بۆیدێ و ئەیخوات و دوایئەوە بەماوەیەکی کەم کۆچی دوایی ئەکات. چیرۆک نووس "موحەڕەم محەمەد ئەمین" گوێگران بوو، لەدواییشدا "سەماعەی" پزیشکی بەکارئەهێنا. هونەرمەندی بەناوبانگ "ڕەفیق چالاک" وەختێ ئەینووسی هیچ ڕەشنووسێکی نەبوو، قەڵەمی لەسەرکاغەز هەڵنەئەگرت تانووسین و وتارەکەی تەواو نەکردایە .

دایکم ئەیگێڕێتەوە ئەڵێت: (هەموو جارێ بێکەس پێی ئەوتم: بۆ نایەی بۆ خۆمان بە جووتە بچین بۆ نادی، تۆ ناخۆیتەوە، مەخۆرەوە، ئەتوانی شەربەتی مێووژ بخۆیتەوە، یان سۆدەو سیفۆن یان ماستاو، یان گۆشتی برژاو بخۆی، ئیتر بۆخۆت لەماڵەوە قەتیس ئەکەیت!). ئەم قسەیەی بێکەس لەنێوانی سالانی (١٩٣٩-١٩٤٠)داو بەر لەدایکبوونی من کردوێتی. "عەبدولڕەحمان زەبیحی" ڕووناکبیری بەناوبانگ، ئەو وەختەی سەفەری کردبێ و لەشارەکان دوورکەوتبێتەوە بەکارتۆن جگەرەی لەگەڵ خۆیدا بردووە!. "هێمن موکریانی" شاعیر، لەنێوان سالانی (١٩٧٦-١٩٧٨)دا لەبەغدا زوو زوو یەکمان ئەبینی و پێکەوە دائەنیشتین. ئەم پیاوە لیترێک بادەی ئەخواردەوە، جگەرەیشی بەجگەرە دائەگیرسان، بەڵام تادوایی نۆکاوە کەمەکەی بەردەمی تەواو نەئەکردو دەستی بۆ هیچ شتێکی تریش نەئەبرد! کەخواردنیش دائەنرا دووجار دەستی ئەبردو نەیئەکرد بە سێیەم .!

"هەژار موکریانی" شاعیر-یش بەدەیان جار لەگەڵیدا دانیشتووم، سالانی (١٩٦٥-١٩٦٦)و هەروەها گەلێجاری تریش لەسالی (١٩٧٤) دا، لە ئازادی ئەو کاتەی ڕاگەیاندنی شۆڕشی ئەیلول لەوێبوو، ڕۆژانە لەنزیکەوە ئەمبینی. من زۆرجار دەربارەی شاعیرانی ترو سەرکردە سیاسییەکانی کوردو زۆر مەسەلەی تر، پرسیارم لێئەکرد، بەڵام خۆی لێ لائەدان. بەتایبەتی ئەو پرسیارانەی پەیوەندییان بەشیعری تازەو یان ڕۆڵی "ئیبراهیم ئەحمەد"ەوە هەبوو، لەسەردەمی گۆڤاری گەلاوێژو یان ڕۆڵی ئەو لە کۆمەڵەی "ژ. ک" و یان

کەسایەتی "قازی محەمەد"ەوە. ئەوەی من لای خۆمەوە تێبینم کردبوو لێمنەئەبیست باسی کەسانێک بکات ئەو خۆشیبوێن. لەو ساڵانەی دوایشدا وەختێ بیرەوەرییەکانی دوای کۆچی دوایی خۆی، بەناوی "چێشتی مجێور"ەوە چاپکرا. ڕاستی ئەو بیروبۆچوونەی خۆم بۆ دەرکەوت. چونکە جگە لەخۆی و "مەلا مستەفای بارزان"، (کەلەمەیشدا ئەو ئازادەو هیچ خەوشێکی تێدا نییە) ئێتر کەسێکی تری نموونەیی لەو بیرەوەرییانەدا نابینی!. لەولاپەڕانەیشدا، کە باسی بێکەس ئەکات، قسەی سەیرو خەیاڵاوی ئەکات! بۆ نموونە ئەڵێت "فایەق و خێزانەکەی‌و منداڵەکانی بەهەموویان لێفەیەکیان هەبوو، ڕاکێش ڕاکێش ئەیاندا بەخۆیاندا!" لەڕاستیدا شتی وانەبووە، بەڵێ ئێمە خێزانێکی هەژار بووین، بەڵام بێکەس مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بوو. ئەوەندەمان هەبوو پێی بژین و سێ چوار لێفەیشمان هەبێت.!

شەمەندۆفێر؛ ئەڕواو ئەفیشکێنێ و منیش لەپەنجەرەکەوە تەماشام ئەبێتە تەیرێکی پەڕاگەندەو باڵ لێکئەداو بەسەر هەموو شوێنەکاندا ئەفڕێ، ماندووە، بەڵام هەر ئەفڕێ! تەماشام تەڕەو فڕینم تەڕو دوا ڕۆژیش نادیار .

هەندێجار؛ فرمێسکێ دێ و بەلام لەپڕێکدا لەناو کالانەی چاودا قەتیس ئەبێ و ئەبێ بەنیشانەی پرسیار. هەندێجاریتریش شنەبای زەردەخەنەیەک دێت و داڵانی یادگار فێنک ئەکاتەوەو کزەی ئەوینو خۆزگە، لەلای یارانەوە بۆن و بەرامەی گوێژەو مامەیارەو گڵەزەردە دێنێ. ئەم ئاوارەبوونە چ حەسرەتێکی هەڵقرژاوی لەم دەروونەدا کردووە بە هێڵنەی سوتاوی خۆی و بەکڵووکۆی دامرکاوەوە تیا هەڵئەکورمێ. چار نییە گەڕانەوە نەبێ بۆلای ئاوێنە درزبردووەکانی ڕابوردوو. گەڕانەوە بۆ ژێر سێبەری دارتووە بەپژوپۆکانی یادگار. گەڕانەوە بۆلای ئەو مرۆڤە سادانەی، بیرچوونەوە "سڕینییەوەو کردنی بەسەراب ".

من ئێستا ئەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ ناو ئەو پێچ و پەنا و قوژبن و گۆشانەی باسنەکراون و وەک نسێیەکی هەتاو نەدیوو وشە نەیدۆزیونەتەوە. بۆلای ئەو مرۆڤانەی، کە ڕۆژێ لەڕۆژان لەڕۆژژمێری شارەکەمدا دەنگوڕەنگ و جووڵەی خۆیان هەبوو. ناویان هەبوو. خۆشەویستییان هەبوو. قسەی خۆشیان هەبوو. هەندێکیان بووبوون بەپێناسەی شارەکەم. لە نزیکەوە ئەمناسین و ڕۆژانە

ئەمدین و یان دوور بەدوور ئەمزانی کێن و چ کارەن. ئەمەوێ لێرەوە زەمان بگێڕمەوەو لاپەڕەی ئەلبوومەکانی شارەکەم هەڵبدەمەوە! بەلام ئەلبوومێ کە لەزۆر بیرەوەریدا نین و بزرن. هەموو کەسەکان، هەموو دیمەنەکان، کوڵان و چوخم و قەیسەرییەکان. دەرفەتە ئەگەر لەم غوربەتەدا ئەوان نەدۆزمەوە ئیتر نادۆزرێنەوە. نیو سەدە زیاتر لەمەوبەر کچێکی نازدارو جوان، لەخانەوادەیەکی دیار، بووە سەردەقشکێنی بەلاوەنان و تووڕدانی عەباو پەچەو بەو دیمەنە تازەیە سلەیمانی داچڵەکان .

ئەویش "ساحیبەی نوری بەگ"بوو. ئەوە سەرەتای سفور بوون و هاواری ئازادی ژن بوو. زۆرجار بەتاقی تەنیا هەر خۆی لەنێو ئاپۆرەیەک ژنانی عەبابەسەردا دەرئەکەوت. نیو سەدە زیاتر لەمەوبەر ژنە مامۆستایەک، بووە پێشەنگی ئەو پەیامەی، کە ئازادی ژن و مافی ژن بەسنگی خۆیەوە هەڵواسێ و بەئاشکرا جاڕی بۆ بداو سڵ لەمێردەزمەکانی کۆمەڵ نەکاتەوە ئەویش (بەهیە مەعروف) بوو. ناکرێ ئەم سومبولانە لەیاد بکەین. هەموو کاروانە گەورەکانی پاشەڕۆژ لەپێشدا لەپێشەنگێکی بوێری ڕابوردوەوە دەستیانپێکردووە.

"محەمەد عەلی مەدهۆش"ی شاعیرو بەرگدرووی ژنان و پیاوان. پێنج شەش شاگردو دوکانێکی فراوان و هەمیشەیش باس هەر باسی سیاسەت و شیعر و، "عەلی کەمال باپیر"ی شاعیریش وەک دەوام، دەوامی ڕۆژانەی لەوێ ئەکرد .

مەدهۆش؛ پیاوێکی بالا مام ناوەند، چاوێکی تیل و بەردەوام قژ بژو بێ ئارام و قەرزار. بەدەم قوماش برین و مقەستکاری و سەرمێزەکەیەوە لەبەرخۆیەوە شیعری ئەخوێندەوە. خۆیشی شیعری غەزەل و دلداری ئەنووسی و لەهەفتەنامەی "ژین"دا بلاوی ئەکردنەوە. ئەگەر لەدەرەوەی دوکانیش و لەناو بازاڕدا بتبینییایە هەمیشە تالە دەزووی درێژ درێژی ڕەش یان سپی بەکراس و پانتۆڵەکەیەوە نووسابوون. پێموایە لەپەنجاکاندا بوو، یەکێک لە شاگردەکانی کەناوی "بەکر" بوو لەخۆپیشاندانێکدا شەهیدکرا.

"قالەی حاجی حسەین"ی گۆرانیبێژو سروودخوێن. یەکێک لەئەندامە دێرینەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە سلەیمانی. پیاوێکی تۆزێ قەڵەو، جلی کوردی، شەرواڵ و ستارخانی لەبەرئەکردو مشکی ئەبەست. کاسبکار بوو. لە هەموو بۆنە نیشتمانی و ئاهەنگە گەورەکاندا یەکەمجار ئەو گۆرانی ئەوت، وەختێ سەرئەکەوتە سەر شانۆ، گوڵەباخێکی سووری بەدەستەوە بوو. بەوتنی

مەقامەکەی "گوڵی سەربەستی" ناوبانگی دەرکردبوو کە لەشیعری "بەختیار زێوەر"بوو .

"گوڵی سەربەستی.. گوڵی سەربەستی؛ مەردە ئەو گەلەی بگاتە دەستی" ئێمە منداڵ بووین و لە خوارەوە هاوارمان ئەکرد بیڵێرەوە!. ئاخر ئەم کەسانە بوون، کە بۆ یەکەمجار ئێمەی منداڵ لەڕێی گۆرانییەوە، گوێمان لێئەگرتن و ئیتر ئەو وشەو دەستەواژانەی وەکوو "سەربەستی" و "گەل" و "خەبات" و "خاک"یان لەمێشکماندا ئەچەسپان .

"عەبدوڵلا میدیا"، لە سەرەتای پەنجاکاندا بوو، (١٩٥١-١٩٥٢) لەسەر شانۆی ناوەندی سلەیمانی، کە تاقە هۆڵ و شانۆی ئەو سەردەمە بوو. رۆڵی خەلیفەی لەشانۆنامەیەکدا ئەبینی، بەناوی "بوونە خەلیفە بە خەیاڵ"ەوە. من تەمەنم دوانزە ساڵان بوو. ڕیتمی شانۆ نامەکە، رۆڵی خەلیفە خۆی، ئەو جێ و ڕێ و تەختەی بۆ خەلیفە دانرابوو، سێبەر و ڕووناکیی. ئەمانە هەمووی کارێکی سیحراوییان لە دەروونمکردبوو. ئەتوت خەوێکی خۆش ئەبینم. ئەوە یەکەمجار بوو بکەومە ژێر کاریگەری شانۆو نواندنەوە. یەکەمجار بوو هونەر چاوو هەستو نەستم بقۆزێتەوەو بەتەواوی هەموو هۆش و گۆشێکم بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. بۆمنی منداڵ وابوو. من هەتا ئێستەیش ئەو دیمەنانەی "بوونە خەلیفە بەخەیاڵ"م بیرنەچۆتەوە .

"شەوکەت ئاغای قادر ئاغا"ی خزمی باوکم، پیاوێکی ئەفەندی سپیکەلەی پاک و خاوێنی دەمو چاو بریسکەدار. فەرمانبەری میری بوو. هەر جارێ منی بدیبایە، بانگی ئەکردم. دەستی بەسەردا ئەهێنامو قسەی خۆشی بۆ ئەکردمو بەزۆریش بوایە شتێکی ئەخستە گیرفانمەوە. ئەمە لە کاتێکدا، کەمامی خۆم ئاوڕی لێنەئەدامەوە. چۆنم بیر بچێتەوە!

کەسەکان و ناوەکان یەک لەدوای یەک و زۆر بەڕوونی، لەشێوەی ڕیز گرتەی فیلمێکی خێرادا، بە بەرچاومدا تێئەپەڕن. هەندێ وێنەیان لەوانی تر زیاتر ئەوەستێ و هەندێکی تریشیان تەنها بۆ چرکەساتێک و ئیتر لەچاوان ون ئەبن، بەلام گرنگ ئەوەیە من جارێکی تر ئەیانبینمەوە، وەک خۆیان چۆن بوون بەوجۆرە. شوێنەکان و ڕووداوەکان، پرسەو شایی، جەژنەکان، کەسایەتییە میلییەکان. هەژارانی شارەکەم...

ئەوە ژنە قەزوان فرۆشەکەی؛ بەردەمی سینەمای ڕەشیدە، تۆپەڵێ پەڕۆیە و بەزستان و بەهاوین لەو شوێنەی خۆیدا کزۆڵەی کردووەو بەپیاڵە قەزوانی سوێر یان شین ئەفرۆشێ و دەنگی لێوە نایەت. ئەوە "محێدینی تەنەکەچییە" بەرامبەر قوتابخانەی گۆیژەی کوڕان. برای شێخ ڕەزای شارەوانی. ئەی ئێوە ئەزانن ئەم پیاوە چ بەهرەیەکی تێدا بوو؟! ڕەنگە کەم کەس ئەوە بزانێ کاک محێدین، تۆمارێ بوو بۆ خۆی. یەک بە یەکی بنەماڵەکانی سلەیمانی لەڕەگ و ڕیشەوە تانەوەی تازەیانی بۆ هەڵئەدای. لەکوێوە هاتوون و چی بوون و چیانکردووە؟ پێناچێ هیچی لەو زانیارییانە دوای خۆی بەجێهێشتبێ. "کاک نوری غەربی"، کە یەکێک بوو لەمۆدێرنەو پیاوە خوێندەوارەکانی شاری سلەیمانی و ئەویش ئەم خوێندنەوەی ڕەچەڵەک و شەجەرەی بنەماڵانە مەراقی بوو. بۆ ڕاستی و دروستی بۆ چوونەکانی یان بۆ ئەوەی دڵنیابێ لەنووسینەکانی، ئەچوو بۆلای کاک محێدین و پرسیاری لێئەکردو ئینجا ئەیوت وایە!

ئەوەیش مامۆستا "فوئاد ڕەشید"ە، یەکێک لە پێشەنگەکانی پەروەردەو وەرزش و یەکەمین کەسێک کە لەم شارەدا بیری لەدروستکردنی شانۆ کردۆتەوەو خەریکی فەرهەنگ نووسیش بووە. ئەوەیش "جەمشید"ی کوڕیەتی کە لەهەڕەتی لاویدا تووشی شیر پەنجە بوو. ئەوەیش "مەجیدە فەندی" برای، پیاوی قسە خۆش و لێوان لێو لەنوکتەو گاڵتەوگەپ، پێموایە لەساڵی (١٩٥٤)دا بوو، ئەوکاتە تەمەنم چواردە ساڵان بوو. "عومەر عەلی" موتەسەریفی سلێمانی بوو، بۆ یەکەمجار بوو پێشانگەیەکی بازرگانی بۆ فرۆشتنی کۆمەڵێ ئامێری تازە لەسانەوی سلەیمانی بکرێتەوە. لاموایە بەناوی کۆمەڵەی هەرەوەزی فەرمانبەرانەوە ڕێکخرابوو. ئەمە بۆ سلەیمانی ئەو سەردەمە هەواڵێکی تازەبوو. مەجیدە فەندی؛ سەردانی پێشانگەکە ئەکات و ئەچێتە بەردەمی ئامێرێ ئەڵێ: (ئەمە چییە؟). چاودێرەکانیش پێی ئەڵێن: (ئەمە مەکینەی جل شتنە). مەجیدە فەندی ئەڵێ: (نرخی چەندە؟!) ئەوانیش ئەڵێن: (پەنجا دینار!) هەڵبەت پەنجا دیناری ئەوکاتە ڕەنگە مووچەی سێ چوار مانگی فەرمانبەرێکی وەک ئەو بووبێ. قەیرێ بێدەنگ ئەبێ و ئەڵێ: (ئینجا من ئەگەر پەنجا دینارم هەبێ ژنێکی تری پێ ئەهێنم و هەم جلیشم بۆ ئەشواو هەم لەگەڵیشیدا ئەنووم!).

ئەوەیش پیاوی لفکەو لیرەکەیە! کە بەکۆڵاناندا ئەگەڕاو دووسێ لفکەی بە دەستەوەو هاواری ئەکرد "ئەوە لفکە و ئەوە لیرە"، دوو شت، کە هیچ شتێ

کۆیانناکاتەوە. بەلاَم ئەوەی بەلای منەوە لێرەدا گرنگە، ئەو ئەمن و ئۆمان و ئاسایشەیە، کە لەو کاتانەدا هەبووە. پیاوێکی پیر گیرفانی پڕ لە لیرە بێ و بەتاقی تەنیا بەو کۆلاَنانەی سلەیمانیدا بسووڕێتەوەو کەسیش پەنجەی بۆ نەبات. ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر ئەم پیاوە لەسەردەمێکی دواتردا ئەمکارەی بکردایە. هەر یەکەم ڕۆژو نەئەگەیشتە سێیەم کۆلاَن پێستیان ئەبرد بۆ دەباخخانە!

ئەوەیش "کوڵە"و ئەوەیش "عەبەی حاجی حەملان" لەسەرەتای پەنجاکاندا، ئەوکاتەی ئێمەی کوڕوکاڵ تازە سەرمان لەسیاسەت ئەخورا. بەحساب سیخوڕەکانی حکومەت لەناو کورددا ئەم دووانە بوون! بە پەنجە ئاماژەیان بۆ ئەکرا. بە تەنیا ئەسووڕانەوە، لەسلکی پۆلیسی نەهێنیدا بوون. زۆرجار هەر ئەم دووانە بەرلەوەی نیشتمانپەروەرێ لەلایەن حکومەتەوە بگیرێ، ئەچوون موختارەکانیان ئاگادار ئەکرد. نەمانئەزانی ڕۆژگاری وا ئەبینین‌و کوردی وا خائین و دڕندە هەڵئەکەوێ پیاو لەدواییدا هەزار ڕەحمەت بۆ کوڵەو عەبەی حاجی حەملان بنێرێ !

ئەگێڕنەوە ئەڵێن: (هەر لەو سەردەمەدا عەلی بۆسکانی گەنج و خوێن گەرم ئەبێ و لەگەڵ کۆمۆنیستەکاندا کار ئەکات، ڕۆژێک، لەبەرچاوی عەبەی حاجی حەملان بەیانێکی حزبی شیوعیی دابەش ئەکات و ئەمسەرو ئەوسەر ئەکات و خۆی ئەکات بەو کۆلاَنەداو لەو سەرەوە لەگەڵ دووانی تردا دێتە دەرەوە. دیارە پێیخۆشبووە بگیرێ!). عەبەی حاجی حەملان-یش ئەچێتە بەردەمی و پێی ئەڵێ: (چی ئەکەی بیکە، شەقیش بەری ناتگرین!) .

ئەوە "نوری ئەحمەدی تەها"یە.. برا گەورەی "کامەران موکری" شاعیر. لەبەردەمی دوکانێکدا لەشەقامی کاوە دانیشتووە. ئەم کەڵە پیاوە، هەر لەهەرزەکارییەوە چۆتە ناو بزووتنەوەی کوردایەتییەوەو دەردی سەری و زیندان و نەهامەتی دنیای دیوە. ئەفسەری سوپای عێراق بووەو وازی هێناوەو چۆتە پاڵ شۆڕشی شێخ مەحمودو لەدوایشدا گەیشتۆتە مەهاباد و لەکۆماری مەهاباددا لەگەڵ چوار ئەفسەرە شەهیدەکە "قودسی و عیززەت و خەیروڵلا و خۆشناو"دا لە ناو لەشکری کورددا دەستبەکاربووە. دواتریش یەکێک بووە لەپێشەنگەکانی شۆڕشی ئەیلول و تامردیش پیاوانەو سەربەرزانە ژیا!

دیمەنەکان هەمەجۆرو تێکەڵن. کۆن و تازە، ڕەش و سپی و ڕەنگاوڕەنگ.. ڕۆژگاری منداڵی و هەرزەکاری و بەرەو ژوورتر. یادگارەکان ناهێڵن چاوبکەمەوە. ناهێڵن بەهۆش خۆ بێمەوەو لەگەڵ خۆیاندا ئەمبەن و ئەمبەن. لەم

ئاقارەوە دەستم ئەگرن بۆ ئەو ئاقارو، لەم ساڵەوە بۆ ئەو ساڵ و لەم ڕووداوەوە بۆ ئەو ڕووداو. خەیاڵیشم چاوێکی کردووە بەچوارچاوو، ورد ئەبێتەوەو پرسیار ئەکاو کوناوکون بەشوێن کەسەکان و ناوەکاندا ئەگەڕێ. لەشێتەکانەوە بۆ سەرخۆشەکان و لەسەرخۆشەکانەوە بۆ ئیماندارەکان و لە ئیماندارەکانەوە بۆ مولحیدەکان و بەهەموویان وێنەی شارەکەم تەواو ئەکەن.

ئەوە "میرزا مارفی" شاعیرە.. مونەوەرێک تا ئاستی ئەوەی بڕوای بەهیچ پەیامێکی ئاسمانی و هیچ پێغەمبەرێ و هیچ ئەسحابەو شێخ و مەلاو سۆفی و تەریقەتێک نەبووە. پێموایە شیعرەکانی ئەگەر مابن، تادوارۆژێکی دوور ڕووناکیی نابینن! چەند جارێک لە دوکانەی "کەریم ئاغای خەیات" کە خاڵی باوکم بوو، دیومە.

ئەوەیش "ڕەمزی ئیسحاق"ی مەسیحی هاوڕێی منداڵیمە. ئاگری قورەتێ بوو بۆ خۆی. ڕەمەزانێک ئەوەندە نزیکی تۆپەکان کەوتبۆوە. لە قشڵەوە هەڵیدابووە خوارەوە، بریندار بووبوو، نیشانەی ئەو بریندار بوونەی بەسکییەوە دیاربوو.
ئای ئەوەیش "سەلاح جەمیل"ە، هاوڕێی یەکەم ساڵی ناوەندی و بەشی ناوخۆ، کوڕێکی قۆز. زەمان هات و ڕۆیشت و دوای تەمموز یەکێک بوو لەو ئەفسەرانەی لەناو حزبی شیوعیدا کاری ئەکرد. وەختێ فاسیستەکانی بەعس لە (١٩٦٣)دا هاتنە سەر حوکم و سەلاح جەمیل و دەستەیەک لە ئەفسەرانی تر حوکمی مردنیان بەسەردا دراو گوللە باران کران .!

سەلاح جەمیل لەیەکەم نمایشی شانۆنامەی "پیسکەی تەرپیر"داو لەساڵی (١٩٥٦)دا رۆڵی ئەو کچە جوانەی ئەبینی، کە پیسکەی تەرپیر "ڕەفیق چالاک" ئەیویست بیخوازێ!. زەمانە. زەمان.!

ئەوە "دایە خان"ە، لە هەیوانەکەدا دانیشتووەو پیاز ئەجنێ و چاوی ئاو ئەکاو منیش نۆ ساڵو بەدیارییەوە دانیشتووم و ئەیەوێ بمکا بەجاسوسی خۆی، بۆ ئەوەی بچم بزانم کاک کەریم چی ئەکا لەماڵە خزمەکەی دراوسێمان. دایە خانم؛ بەرامبەر کاک کەریمی باوە پیارەمان دڵی پیس بوو. هەر لە خۆیەوە بەخەیاڵ ناوی ژنێکی نادیاری ئەهێناو ئەیوت: (ئەوە کەریم ئێستا لەوێیەو هەموو جارێکیش لەزەخیرەی ماڵەوەی بۆ ئەبا!). ئەم وەهمە گەورە خوتو خۆڕاییە تاسالانێکی دوورودرێژیش هەر لەگەڵیدا بوو.

ئەوە سەیرانەکەی ئەحمەد ئاوایەو بەخاووخێزانەوە چووینو من تەمەنم نۆزدە ساڵەو پڕم لەئارەزووی ئەو تەمەنەو پوریکیشم دەستەخوشکێکی خۆی هێناوەو کەوتوومەتە چاوبازی لەگەڵیداو هەموو خەیاڵ و هۆش و گۆشێکم لای چاوی ئەوو لای بەژن و باڵای و لای سینەو مەمکێتی و لەبەرخۆمەوە شیعری گۆران ئەخوێنمەوەو خواخوامە فرسەتێ دروستبێ و دەستێکم بگاتە دەستی! بەڵام پوورم بەبست لێی دوورناکەوێتەوەو منیش لەداخاندا لەژێر سێبەری پیرە دارگوێزێکدا خەوم لێئەکەوێ!

ئای ئەوەیش "مەولەوی مەرسەمە" دراوسێی گەڕەکی سەرکارێزو فەرمانبەر لەدایرەی مەعاریف. مریەمی دایکی بەبێوەژن کۆشی و نانکردن و جل شتنی ماڵان پێیگەیاند. پیاوێکی بێدەنگو هێمن. گەیشتۆتە تەمەنێکی هەڵکشاوو بەڵام هێشتا هەر بێ ژنە. شەوانە تا درەنگ لەیانەی فەرمانبەران و دوایی بەتەنها بەرەو ماڵ و لای دایکی ئەبۆوە: (ئەگێڕنەوە ئەڵێن شەوێک ئەکەوێتە چاڵێکەوەو دووسێ ڕێبوار دەریئەهێننەوە)و لێیان ئەپرسێ: (ئەم چاڵانە بۆچی هەڵکەنراون؟). ئەوانیش ئەڵێن: (ئەوە بۆ خەتی تەلەفۆنە). ئەمیش تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: (سەگبابینە سلەیمانیەکی بچووک، ڕۆژی دەجار هەموومان یەکتری ئەبینین! ئیتر تەلەفۆنی چی!).

زنجیرەی وێنەکان درێژئەبنەوە. دووەم ساڵی خوێندنم لەناوەندی پیشەسازی، هاوڕێیەکی قسەخۆشمان هەبوو، چەند جارێک لەوەختی ڕیز بووندا ژمارە دوانزەی بەرئەکەوت. مامۆستایەکمان خەڵکی نەجەف بوو، ناوی لێنا: (جمال پنعش) و ئیتر ئەوەی بەسەردا دابڕا. بۆیەکەمجار لەگەڵ ئەودا پێکەوە بادەمان خواردەوە. بەڵام چۆن؟! لەبیرمە چوومە لای جەرجیس و چارەکێ عەرەقم کڕی. ئەم چارەکەمان لێبوو بەبەلا!. چۆنی بخۆینەوەو لەکوێ؟! ڕۆیشتین، خۆمانکرد بەمزگەوتی هەمزاغادا، تۆزێکمان لە چارەکەکە ڕشت و لە گونجی حەوزەکەیش ئاومان تێکرد. ڕۆیشتین بەدەوری سلەیمانیدا سوڕاینەوە. گەیشتینە ئەولای گەڕەکی کانێسکان، چووینە ناو پەڵە گەنم و جۆیەکەوە دانیشتین و وەختێ زانیمان کەسمان لێدیارنییە. قوم قوم دەستمان کرد بەخواردنەوە، وەختێکم زانی سەرم سووڕاو ئاسمان لەبەرچاوم سەرەو ژێر ئەبوو. "جەمال"یش هەروا. لەناو پەڵە گەنم و جۆکەدا خەومان لێکەوت. ئەوە یەکەمجار بوو دەم لەبادەوە بدەم.

کامێرای خەیاڵم بەناو شاری سلەیمانی جاراندا ئەگەڕێ منداڵم و گەرمایەو نیوەڕۆیەو ناردویانم بۆ بەفرکڕین. دوکانەکەی "مام عەلی" سی چل مەترێ

لەئێمەوە دووربوو، تاشە بەفر لەگۆیژەوە هاتووە. هێشتا کایەکەی پێوەیە، دەفلسییەک ئەدەم بە مام عەلی و ئەویش مشارەکەی دەرئەهێنێ و خەریکی بڕینەوەیەتی، منیش بەری دەستم ئەخەمە بەر ئەو وردە بەفرانەی لەتاشە بەفرەکە ئەبنەوە، وردە وردە لە لەپی کراوەی دەستما کۆئەبنەوەو منیش هەڵیئەدەمە ناو دەمەوە! چەند خۆش بوو خودایە!

ئەی چەند ناخۆش بوو؛ وەختێ پێڵاوی تازە لەجەژندا پاژنەی پێی ئەگرتم و شەلە شەل ئەڕۆیشتم، دوایی لەماڵەوە دایکم لۆکەی بۆ ئەخستمە ناو پێڵاوەکەوە. دواتر لەوە، ئەگەر دووسێ جار لەخەودا دابچڵەکیمایە. بۆ ئێوارەی دوایی دایکم قورقوشمی ئەهێناو بەگەرمی ئەیخستە ناو ئەو جامە ئاوەوە، کە لە ژوور سەرم ڕایگرتبوو. دیارە قورقوشمەکەیش شێوەیەکی دروستئەکرد و ئەمەیی. تەماشایان ئەکرد بزانن چییە؟ ..!

ئەمە ترس دەرکردن بوو. ترسیان دەرئەکردم! سندووقی دنیایش هەبوو ئەیانگێڕا، تۆیش چاوت ئەنا بەکونێکەوەو ئیتر لەودیوەوە کۆمەڵێ لەو پارچە کاغەزە ڕەنگاوڕەنگانەی تێیدا بوو، کە شێوەی هەمە جۆریان درستئەکرد. ئای کە دڵیان خۆش ئەکرد .

لەناو بازاڕ "عەلی مار" کوبەی بڕوێشی دروستئەکردو هەر لەوێدا لەتاوەیەکی گەورەدا سووری ئەکردنەوە. بۆئەوەی مشتەریش پەیداکات، ئەیوت بەختیشی تێدایەو لەبەینی چەند کوبەیەکدا فلسێکی سووری خستبووە ناو یەکێکیانەوە ئێمەیش ئەوەندە گەوج بووین، سێ چوار کوبەمان ئەخوارد، بۆ ئەوەی ئەو یەکە بدۆزینەوە کە فلسەکەی تێدایە! هەندێ عەرەبی فێڵبازیش لەبەغداوە ئەهاتن ئەم یاری سێ کاغەزەیان ئەکرد. بۆ نموونە هەشتو لۆیەکیان نیشان ئەدایتو ئیتر لەجوڵانەوەی خێرای نێو دەستیا هەرسێ کاغەزەکەی تێکەڵ ئەکردو ئەیهێنان و ئەیبردن و تۆیش پارەت دائەناو پەنجەت ئەخستە سەر ئەوەی کە ئەمیان هەشت لۆکەیە! بەڵام قەت وا دەرنەئەچوو. کە لات ئەبووم، شلو شێواو بەرەو ماڵەوە ئەڕۆیشتم لەپڕێکدا یەکێک پێی ئەوتم (کاکە پشتێنەکەت خەریکە بکەوێ بیبەستەرەوە!).

فلیمەکانی خەیاڵ درێژئەبنەوە.. خۆم ئەکەم بە قەیسەرییەکاندا، بۆنی زەردەچەوەو دارچینی و ئاڵەت دێنە لوتم. بەهاوین فێنکییەک لە قەیسەریەکاندا هەبوو، پیاو حەزینەکرد درەنگ لێیان بچێتە دەرەوە. ئەی دۆندرمەکەی "عەبە کونج" کە لە عەرەبانەیەکی دەستگێڕداو چواردەوری بەفرو ئەویش خێراخێرا

ئیستیوانەکەی بانەدا بۆ ئەوەی دۆندرمەکە نەتویتەوە، لە دواییدا بەکەوچکە مسینەکەی دەستی سێ هێلکەی خڕی بچووکی بۆ ئەخستیتە ناو ژێر پیاڵەیەکەوەو ئەگەر لەسەرخۆ نەتخواردایە ساردی دۆندرمەکە کەللەتی ئەتەزاندو ناچار بووی تاچەند چرکەیەک چاوێکت بنوقێنی. ئەی خەیات و درۆی تەواو نەکردنی جلەکانت .

ئەی ئەو هەموو لوقمەقازییەی ئەمانخوارد و نیوەڕۆ لەماڵەوە هیچمان پێنە ئەخورا .

ئەوەیش "قالەی کولە شینە" بەجادەی مەولەویدا سەربەرەو ژوور ئەبێتەوە. شەڕواڵ و ستارخانی تازەو جووتێ پێڵاوی چەرمی بریقەدارو، کڵاوو جامانەکەی خستۆتە بن هەنگڵی و بەحاڵیش ئەلەنگێ. من ئەمناسی و مەرحەبایشمان هەبوو. بابڵێین لەشەقاوە مۆدێرنەکانی ئەو سەردەمەبوو. خەڵکی سڵیان لێئەکردەوە. جەربەزەبوو. پێموایە لەڕووداوێکدا ژنێکی کوشتبوو. کوڕی ئەو ژنە کە ئەوکاتە چوار پێنج ساڵان بووە ڕۆژگاردێ و ئەڕواو گەورە ئەبێ‌و تۆڵەی دایکی ئەکاتەوە، "قالەی کولە شین" ئەکوژێتەوە .

هەر لە شەستەکاندا؛ محەلەکەی "بلەی حەمە خورشە"یش لەسەر شەقامی مەولەوی و نزیکی باخچەی گشتی بوو، من چەند جارێک چووم بۆلای. پیاوێکی دەم و دوو خۆش و دەست و دڵ ڕەنگین بوو. لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولدا لە "پ. م"ەکانی ناو شاربوو. لەڕۆژگارێکی ئاڵۆزو ناخۆشدا بەناهەق تیرۆرکرا.

ئەوەیش "حەمە قڕیلە" لاڵ موو ئەکاو خۆی بەدیوارەکانی قەراغ جادەی مەولەوی ئەگرێتەوە. نەدەمی گوێەکاو نەقاچی ماوەو هێشتا ئێوارەیشە. بەرەو ژوور ئەبمەوە، لەمدیو جامخانەی دوکانەکەیەوە تەماشای پیرە پیاوێکی بچکۆلەی کەشی بەسەر ئەکەم، سەری داخستوەو خەریکی سەعات چاککردنەوەیە، ئەویش "حاجی مەلا شەریف"ە.

بەرەو ژوور ئەبمەوە بۆلای سەراو ئەو کۆلانەی بەرەو حاجی خان ئەمباتەوە. لەو سوچەدا، ئەویش "سەعە کەڕ"ی شەربەت فرۆشە. شەربەتی مێوژو بەفری شاخ کەڕی کردووەو بەپەرداخێک ماندوێتیت دەرئەکا.

هاوینان دایکم بۆ شاگردی ئەیناردمە لای "کەریم ئاغا"ی خەیات، خاڵی باوکم. ئەکرەم-یش لەوێ بوو، ئەکرەمی خەیات "ڕووخۆش"، بەڵام ئەو چەند ساڵێ لەمن گەورەتربوو. بۆ کاروباری ناو دوکان و ئەم لاوئەولایش ئەو ئەمری

بەسەر مندا ئەكردو منیش نەمئەوێرا بەقسەی نەكەم. ئەكرەم فێڵبازبوو. من ئەو فێلانەی ئەوم نەئەزانی. ئەوانەی حەڵواو لەبزینەیان ئەفرۆشت بانگی ئەكردن. ئەوانیش تەبەقەكانیان لەسەر لێواری بەردەمی دوكانەكە دائەنا. ئەكرەم بەمنی ئەوت: (تۆ قسەیان لەگەڵدا بكەو مەشغوڵیان بكە). ئەویش ئەچوو لەودیوەوە، لەژێر بۆشایی جامخانەكەوە، بەتەلێكی درێژ، مەسكەت و لەبزینەی لێ ئەدزین. من پێمناخۆش بوو، بەڵام ئەو بۆ خۆی قاقا پێئەكەنی.

خەیاڵم؛ ئەگەڕێ و ئەگاتە كارێزی "وەستا شەریف" دامێنی "گردی مامە یارە". سەردەمێك ئەو ناوە جێ سەیران بوو. ئەگاتە كانی باو هلووبەو گوێ تانجەرۆو ئیتر لێرەدا قەرەجەكانم هاتنەوە بەرچاو. بیرمە ژنان ئەیانوت ئاگاتان لەمنداڵەكانتان بێ، نەبادا قەرەجەكان بیاندزن. قەرەجەكان بەڕەوی گەورەو وڵاخی زۆرو تولەو تانجی و سەگەلەوە ئەهاتن و لەخوار سلەیمانی هەڵیان ئەدا. موتوومورووی قاپ وقاچاغ و وردەواڵەیان ئەفرۆشت. خەیاڵم وردتر ئەگەڕێ. وابزانم لەیادی جەژنی سوپای عێراق و یان لەنمایشتە عەسكەریەكاندا بوو، چەند ڕیزی عەسكەر بەدەهۆڵ و بوقەوە بەجادەكاندا ئەگەڕان ئەوەی پێشی پێشەوەیان سەوڵەجانێكی درێژی پێبوو، سەرەكەی گویەكی زیوینی پێبوە بوو، بەپێی تەپڵ و مۆسیقاكە ئەمیش سەوڵەجانەكەی هەڵئەسووڕان هەڵیئەداو ئەیگرتەوە، هەموویشی بەدەم ڕۆیشتنەوە. ئێمە منداڵ بووین ئەیانوت: (ئەگەر ئەو دارەی لەدەست بكەوێتە خوارەوە یەكسەر ئیعدامی ئەكەن). ئێمە ئەچووین بۆ سەیركردنو لە هەموو هەڵدانێكدا بەتەمابووین دارەكەی لەدەست بەربێتەوە تابزانین چۆن ئیعدامی ئەكەن!

تەمەنم پێنج ساڵان بوو، ڕۆژێك كەس لەماڵەوە نەبوو. دایكم پێش ڕۆژێ نانی كردبوو. لەگەڵ هەندێ كولێرە بەچەورە. كولێرەكانم هێناو ناوەكەیم ئەخواردو ئەویترم فرێئەدایە سەربان، بێگومان پێیانزانی! باوكم هیچ قسەی نەكرد. بۆ ڕۆژی دوایی لەمەكتەب، كە من وەك گوێگر لەگەڵیدا ئەچووم، لەپۆل هێنامییە دەرەوەو وتی: (وەرە ئێرەوە ڕاوەستەو بۆ قوتابیەكانی گێڕایەوە كەمن دوێنێ كارێكی وامكردووە. لەبەرئەوە ئێمەیش لەماڵەوە بڕیارمانداوە ئەمجارە ئەگەر كولێرەمان كرد نابێ بیخواتو سزاكەی ئەوە ئەبێت).

خەیاڵ كەنەفتی كردم و شەمەندۆفێر هەر ئەڕواو خەوم لێكەوت.

لەخەوما؛ خۆم بینییەوە بووم بەباڵندەیەك و بەسەر پیرەمەگرونەوەم، بەرەوخوار بوومەوە. گەیشتمە سەر سلەیمانی و وەختێ تەماشای سەر

شەقامەکانم کرد، هەموو دار ئەلەکتریکێ مێردمندالێکی پێوە هەڵواسراوە، خەڵکەکەیش لەخوارەوە هاواریانەو ئەیانەوێ بەسەر دارئەلەکتریکەکاندا سەرکەون و منداڵەکانیان داگرن، بەلام سەگەلێکی زۆر پەلاماریان ئەدەن و ناهێڵن نزیکبکەونەوە. نزم ئەفڕیم. چاوم لێبوو پۆلیسێکی ڕەش تفەنگێکی پێبوو، خەریکبوو نیشانەی لێئەگرتمەوە. لەپڕێکدا داچڵەکیمو بەچاوێکی ئەبڵەقەوە تەماشای واگۆنەکەم کرد، خەڵکە خەریکی دابەزین بوون وتم: (لینینگراد؟!) پیاوێک وەلامی دامەوە (لینینگراد). جانتاکەم داگرتو دابەزیم و چوومە سەر سپۆرەکەو بەرەو ڕووی دەروازە گەورەکە ڕۆیشتم. چوار پێنج گەنج بەرەو ڕووم ئەهاتن. زانیم بۆلای من هاتوون.

هەموو شتێ لە قەیراندایە،
بەپاشەڕۆژی ئەدیبو نووسەرانیشەوە!..

کاک "مەغدید سەپان" کە خەڵکی هەولێرە، لە زانکۆی لینیگراد ئەیخوێند. جگە لەوەی شیعردۆست بوو، خۆیشی نابەناو وتاری ئەنووسی. کوڕێکی کراوەو قسەخۆش بوو. هەڵبەت یەکێکیش بوو لەئەندامی ڕێکخستنەکانی (ی. ن. ک)، ماڵی نەبوو، لەبەشی ناوخۆی زانکۆ ئەژیا، منیشی لەگەڵ خۆیدا بردەوە بۆ ئەوێ و هەر لە ژوورەکەی خۆیدا قەرەوێڵەیەکی بەتاڵی لێبوو، نازانم جێگەی خوێندکارێکی دیکەبوو، بۆ منی چۆڵکردبوو، یان ئەم خۆی بەتایبەتی دابینابوو. دیارە بۆ هیچ قوتابیەک نەبوو کەس بەرێتەوە بەشی ناوخۆوە، بەڵام وەک لەدواییدا زانیم. بە بەرتیل دەرگاوان و پرسگەکەیان قایل کردبوو. هەر ئەو کاتەی بەرەو بەشی ناوخۆ ئەچووین لەتاکسیەکدا بووین. بەرلەوەی بچینە سەر شەقامی گشتی، لقە شەقامەکان، ئەوەندە وێران و پڕلە تاسەو چاڵ و چۆڵی بوون. هەزار خۆزگەم بەجادەکانی سلەیمانی یان کەرکوک ئەخواست. ئەو بەشە ناوخۆییەیش کە کاک مەغدیدی لێبوو کۆن و ژوورەکانیش ناخۆش بوون، پاک و خاوێنی توالێت و گەرماوەکان گوێیان پێنەدرابوو. بۆرییەکان ژەنگاوی بوون. بەکورتی بەشە ناوخۆییەکانی خوێندکارانی زانکۆی سلەیمانی زۆر لەوێ ڕێک و پێکتر بوون. هەموو شتێ هی دەوڵەت و حکومەت بوو. بۆیە بەو جۆرە بوون. دیاریش بوو ئەوەی پێی بوترێ بەسەرکردنەوە و پاراستنی بیناو کەلوپەل و

دەرگاو پەنجەرە و کاشی ڕاڕەوەکان، یان بۆری ئاوو دەست شۆرەکان لە دەمێکەوە لەجێی نەبووان بوون. بۆ خواردنیش ئەچووینە چێشتخانەکەیان. خواردنەکان ئاسایی و بەشی زۆری پەتاتەو ماکەرۆنی بوون. بە پاسیش هات و چۆمان ئەکردو، پاسەکان بەشێکیان کۆن و هەمیشەیش سیخناخ بوون. یەکەم ڕۆژ سەرمان لەبازاڕێکی گەورەدا، دیارە بازاڕێکی حکومی بوو بۆ جلوبەرگ و پێڵاو، بەڵام لەدە ڕەفەدا، دوو ڕەفەی پڕمان نەدی. هەمووی چۆڵ و ئەو قاتی چاکەت و پانتۆڵانەی هەڵواسرابوون لەقوماشی خراپ و بێکەلک دروستکرابوون. شتێکی تێدانەبوو سەرنجت ڕابکێشێ .

وەک لەلاپەڕەکانی پێشوودا ئاماژەم پێدابوو. ئەو ڕۆژانەی من لەوێبووم، سەردەمی "گۆرباچۆف" بوو، خەڵکی شپرزەو چاوەڕوانی ڕووداوی گەورەیان ئەکرد! بەڵام نەیانئەزانی چارەنووسیان ڕوو لە کوێ ئەکات؟! لەسەر داوای من، کاک مەغدید و ئەو دۆستانەی تر، چاوپێکەوتنێکیان لەگەڵ نووسەرانی لینینگرادا بۆ ڕێکخستم، چووین بۆ شوێنەکەیان، خانوویەکی پەڕپووت بوو. دوای دانیشتن، کەوتینە قسەکردن، ئەوەی لەگەڵماندا قسەی ئەکرد سەرۆکی نووسەرانی ئەو شارەبوو. ناوەکەی لەبیرنەماوە. من باسی نووسەرانی کوردو بارودۆخی کوردستان و عێراقم کرد. ئەویش کەوتە قسەکردن، بەڵام بێتاقەت و پەشۆکاو دیاربوو، هەندێ لەو قسانەی کردی و من لەبیرم ماون ئەوە بوو "کە ئەوان ئێستا لەسەر لێواری ڕوداوێکی گەورەن و نازانن بەرەو کوێ ئەچن. هەموو شتێک لە قەیراندایە بەپاشەڕۆژی نووسەران و ئەدەبیشەوە، لەبەرئەوە ناتوانن شتێک بڵێن یان شتێک بکەن تا ئاسۆ ڕوون نەبێتەوە."

ڕۆژنامەی لیتراتیوری واتە "ئەدەب"ی لینینگرادیش دیدارێکی لەگەڵدا کردم. وەک وتیان ئەو ڕۆژنامەیە چەند ملیۆن دانەیەکی لێچاپ ئەکرێ. قەوارەی مام ناوەندی و کاغەزەکەیشی لەکاغەزە هەرە خراپەکان بوو. چاوپێکەوتنەکە بڵاوکرایەوە، بەڵام بەشێک لەو قسانەی من کردبووم بڵاویان نەکردبۆوە. بۆ ئەو ڕۆژگارە چاپکردنی دیداری لەگەڵ شاعیرێکی کوردی عێراقدا زۆربوو. چونکە تا ئەو کاتەیش ڕژێمی سەدام پەیوەندی تۆکمەی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا هەبوو. کاک مەغدید و ئەو برادەرە خۆشەویستانە کۆڕێکی بچووکی شیعر خوێندنەوەشیان بۆ ڕێکخستم. شوێنەکە هۆڵێکی مام ناوەندی بوو، ئامادەبووان نزیکەی چل کورد ئەبوون، بەشی زۆریان خوێندکاری کوردی سوریا بوون و ئەوانیتر کوردەکانی یەکێتی سۆڤیەت خۆی و چەند خوێندکارێکیش خەڵکی

باشووری کوردستان بوون. جگە لەخوێندنەوەی هەڵبژاردەیەک لەشیعرەکانم و لەسەر داوای چەند خوێندکارێک بەدوورو درێژیش باسی بارودۆخی سیاسی ئەوکاتەی شۆڕشم بۆ کردن. شەقامی "نیفسکی پرە سپێک" بەناوبانگترین و سەرەکیترین شەقامی شاری لینینگراد "پەترۆسبۆرگ"ە .

شەقامێکی جوان و تابلێی پان و پۆڕو لەهەمانکاتدا درێژو ڕازاوەیە، هەرچی کۆگاو موغازەی گەورەو بازاڕی باش و کتێبخانەی هەمە جۆرو ساختمانی دیارە، کەوتوونەتە سەر ئەم شەقامە. ئەو ڕۆژانەی لەم شارەبووم چەندینجار بۆ پیاسەکردن لەگەڵ خوێندکارەکاندا ڕوومان تێئەکرد. هەر لەیەکەم ڕۆژدا بوو. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام. لەدووسێ شوێندا خەڵکم ئەدی ئاپوورەیان بەستبوو وەک تەماشای شتێک بکەن وابوو. منیش چوومە ناویانەوە، کە وردبوومەوە ژنێک لەسەر مێزێک کۆمەڵێ وێنەی قەیسەری داناوەو خەریکی فرۆشتنیانەو بەریش ناکەوێ. لەولای تریشەوە بەهەمانشێوە یەکێک پۆستەرێکی ڕەنگاوڕەنگی ئەکتەرەکانی هۆلیودی داناوەو ئەیانفرۆشێ و خەڵکەکەیش پاڵە پەستۆیانە بۆ ئەوەی پۆستەرێکیان دەستبکەوێ! لەدڵی خۆمدا وتم: (خۆشەویستیی ئەم خەڵکە بۆ قەیسەرو هەڵپەیان بۆ کڕینی پۆستەری ئەکتەرێکی هۆلیۆد چی ئەگەیەنێ؟ لەوەزیاتر کەحوکمی کۆمۆنیستەکان بەزۆری شەق و پڕوپاگەندە بووەو ئەو خەڵکە هیچ ئازادییەکان نەبووەو دەمیان گرتوون و چاویان بەستوون و ئەوەتا لەکەمترین دەرفەتدا بەمجۆرە هەست و نەستی خۆیان دەرئەبڕن!). دوای حەفتا و سێ ساڵ، هێشتا قەیسەر لەدڵی خەڵکدایەو خۆشیان ئەوێ. ئەوکاتەی من لەوێبووم خەڵکەکە خۆیان ناوی شارەکەیان کردەوە بە "پەترۆسبۆرگ" و یەکەیەکەیش ناوی شەقامەکانیان ئەگۆڕی. ئەوەی بەلامەوە سەیر بوو دواتر لە مۆسکۆیش ناوی شەقامی "گۆرکی"یشیان گۆڕیبوو! ڕۆژگارەکە لەهەژیندابوو. کەبەسەر شەقامەکاندا ئەڕۆیشتی ئەتدی لەزۆر شوێندا بەکۆمەڵ ڕاوەستاون و گوێ لە ڕادیۆ ئەگرن. یان سێ کەس و چوار کەس و سەریان بەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەیەکدا شۆڕکردۆتەوەو ئەیخوێننەوە .

هەر لەیەکێک لەو پیاسانەی سەر شەقامی "نیشکی پرەسپێک"بوو، چاوم بەکتێبخانەی "دار التقدم" کەوت و چوومە ژوورەوەو دوو ڕۆمانی دستۆفسکی و بەشی زۆری بەرهەمە چاپکراوەکانی "چیخۆف"م کڕی، بەڵام زۆر بەهەرزان! لەلای خۆمەوە حسابێکی سەرپێیمکرد ئەم هەموو کتێبانەی من لێرە کڕیومن، هەرگیز لە لەندەن ناتوانم سێ کتێبی باشیان پێبکڕم!. مۆزەی هونەری

"ئارامنتاج" یەکێکە لەو شوێنە گرنگانەی، کە نابێت سەردانی نەکەیت ئەگەر یەک ڕۆژیش لەمشارەدا بمێنیتەوەو ناکرێ نەیبینی. بۆیە ڕۆژێکمان بۆ تەرخانکرد. گەنجینەی هونەری سەدان ساڵ لەم شوێنەندایە. سامانی هونەری زیندووی مرۆڤایەتی سەدەکان، لەنهۆمەکانی ئەم تەلارەدا هەڵگیراون. هەرچەندە ئەو برادەرە ئازیزانەی لەگەڵما بوون ئەوەندەی توانییان نووسینی ژێر تابلۆکانیان بۆ ئەکردم بەکوردی و ناوی هونەرمەندەکانیان پێ ئەوتم، بەلام نەیانئەتوانی فریا بکەون. بەهەر ڕاڕەوو دالانێکدا ئەڕۆیشتیت و ئەچوویتە هەر ژوورێکەوە لەئاست هونەری بەرزدا سەرسام ئەبوویت. باسی چەند تابلۆو پەیکەرو شاکاری ئارمنتاج بکەم؟! من هەر ئەوەندەم وت: (بەڵگەی شارستانی و پێشکەوتن و هونەری زیندوو لەم مۆزانەدایە). بیرمکردەوە: (ئەرێ بەڕاست ئێمە چیمان هەیە! ئەگەر ڕۆژێ لەڕۆژان ئازادبووین و خەڵکی دەرەوە ڕوویانکردە ولاتەکەمان و شارەکانمان، چییان نیشان بدەین؟ و بیانبەین بۆکام مۆزە؟!).

ڕاستە ئەوە هۆو هۆکاری خۆی هەیە، کە ئێمە واهەژاری عەقڵ و هونەرو زانستین، بەلام ئەی بۆچی مێژوونووسانی خۆمان بەردەوام و بەتەنها بەشان و شکۆی کورددا هەڵیانداوەو کردوویانین بەشێری زەمان و نموونەی فەزڵ و هونەری دنیا؟! بەچییەوە؟! کام شکۆ؟! شکۆی عەقڵ؟! شکۆی هونەرو موزیک؟! من بۆ خۆم لەم شوێنانەدا، تووشی جۆرێک لە نائومێدی ئەبم! چونکە تێئەگەم ئێمە چەند بچووکین و کەچی خۆیشمان چەند بەمەزن ئەزانین! لەبەرچی وا خۆمان تەفرە ئەدەین و بەخۆیشمانەوە سەر لەنەوەکانیشمان تێکئەدەین؟! ئێمە ئەگەر خاوەن ڕابوردووی مەزن بووینایە، ئەمڕۆ ئەوەندە نادیار نەئەبووین!. ئەی ڕاست و دروستتر نییە واز لەم عەقڵی مەتح و سەنا درۆیانە بهێنین و بڵێین: (با لە پاشەڕۆژەوە دروستبین) .

لینینگراد یان پەترۆسبۆرگ؛ شارێکی گەورەو خۆشە، بەلام دەستی جوانکردنی بەردەوامی لەسەر نییە. نازانم لە پەترۆسبۆرگ بوو یان لەمۆسکۆ لەدیداری ڕۆژنامەیەکدا لێیان پرسیم: (ئەم ولاتەت چۆن بینی؟!) لەوەلامدا وتم: (لەژنێکی زۆر جوان ئەچێت، بەلام نەخۆشەو لەسەر قەرەوێڵەیەکی پیس کەوتووە!). لەم شارانەدا بایەخی زۆر بەو شەقامە سەرەکییانە دراوە کە بینانییەکان زۆرتر ڕووی تێئەکەن. کەچی هەر لەپشت ئەو شەقامانەوە، کەلاوەو زبڵخانە ئەبینی. ئەو ماوەیەی من لەپەترۆسبۆرگ و مۆسکۆ بووم، ڕووسیا شڵەقابوو. هەروەکوو لای خۆمان، دیواری خانوو تەلارەکان و پایەو ستوونی سەر

شەقامەکان، هەر هەموویان ببوون بەجێی هەڵواسینی بەیاننامەو پۆستەری ڕۆژانەی دەیان حزب و گرووپی سیاسی جیاجیای ئەو وڵاتە. ڕۆژێکیان لەگەڵ خوێندکارە کوردەکاندا ئەسوڕاینەوە، کەوتین بەسەر دیمەنی خۆپیشاندانێکی زۆر سەیردا، بەتایبەتی بۆ من، نزیکەی حەوسەد هەشت سەد کەسێ لەخۆپیشاندانەدا بوون و بەدەیان دروشمیان بەرزکردبۆوەو لەپێشی پێشەوە وێنەیەکی گەورەی "سەدام حسەین"یان هەڵگرتبوو !

سەیرە لێرەیش سەدام؟! ئەمە چییەو ئەمانە کێن؟! من پرسیم و ئەوانیش وتیان: (ئەمانە حزبێکن دژ بەجوولەکەو ئەنتی سامین). دەوەرە دڵت نەگیرێ و دەهری مەبە!. دوای کارەساتی بۆمبابارانی هەڵەبجە و ئەنفال و ئەو هەموو کارەساتە، هێشتا لەم دنیایەدا، ئەو خەڵکانە هەن وێنەی دیکتاتۆرێکی وەک سەدام بکەن بەنیشانەی سەروەری بۆ خۆیان!. کێ ئاگای لەکێیە؟!. هەر لەوێدا من پێشنیازی ئەوەم بۆ خوێندکارەکان کرد، پێویستە ئێوەیش تاهەفتەیەکی تر لەم مەیدان و شەقامەدا پۆستەری قوربانییەکانی هەڵەبجە بکەنە پێشانگایەک بۆ ئەوەی خەڵکی ئەمەیش ببینن. پێموایە دوایئەوەی من چووم بۆ مۆسکۆ ئەو پێشانگەیەیان لەو شوێنەدا نیشاندابوو.

پەترۆسبۆرگ؛ شاری پردو ئاوە، وەک وتیان زیاتر لەشەست پرد لەمشارەدا هەیە. بەشێک لەو پردانە خۆیان بۆ خۆیان مێژووی دێرینی ئەم شارەت بۆ ئەگێڕنەوە. هەر لەو ڕۆژانەدابوو. بردیانم بۆ مەیدانی بەردەم کۆشکی زستانەو ئەو شوێنەی، کە یەکەم پریشکی شۆڕشی ئۆکتۆبەری لێوە دەرچووبوو، ئێمە نەچووینە ناو کۆشکەکەوە. هەر لە دەرەوە تەماشامانکرد. عەردی مەیدانەکە بە بەردی چوارگۆشەی بچووک بەرد ڕێژکرابوو. ئەوەی من لەم سەفەرەدا دەربارەی خەڵکی ئەو وڵاتە تێیگەیشتم :

یەکەم: خەڵکێکی کراوەو ڕووخۆش و بەزوویی ئەبنە هاوڕێت. سادەن و لووت بەرزنین. دووەم: خەڵکی ئەم وڵاتە زۆر ئەخوێننەوەو کتێب هاوڕێی هەرە نزیکیانە لەمیترۆدا، لەشەمەندۆفێرو پاسدا، لەکافتریاکاندا، ئەیانبینی یان کتێبیان بەدەستەوەیە یان ڕۆژنامە. فریشتەکانیان، کچەکان، نەک تاک و تەرا، بەپۆل جوانن!. هەر لەپەترۆسبۆرگ ڕۆژێکیان لەگەڵ کاک "ئۆردیخان"دا چووین بۆ سەردانی ئامۆژگەی ڕۆژهەلاتناسی "بەشی کوردی یان زمانی کوردی" وابزانم دوو ژوورێک بوو، "زارێ" لەوێبوو ماوەیەک بەیەکەوە دانیشتین، تەماشای

کتێبخانەکەیانم کردو ئیتر هەر ئەو سەردانە بوو. فریانەکەوتم جارێکی تر بچمەوە.

یەکێک لەو پیاوە ڕووخۆش و قسەخۆش و کارامانەی لەوێ ناسیم "ئۆردیخانی جەلیل" بوو، واتە برای "جەلیلی جەلیل" و "جەمیلەی جەلیل". بنەماڵەیەکی دیارو ناسراوی کورد پەروەر .

کاک ئۆردیخان؛ بەلەش بەخۆوەبوو، بەلام ڕۆح سووک و خوێن شیرین بوو. لە ماڵی خۆیان میوانداری کردم. لەگەڵمدا هاتە دەرەوەو هەندێ شوێنی گێڕام. لەوسەریش وەختێ گەڕامەوە بۆ سوید تابەندەری پاپۆڕەکەو تاچوونە ناوەوە هەر لەگەڵمدا بوو.

یەکێک لەو شوێنەوارو مۆزە گرنگانەی کە من ئاواتە خوازبووم لەژیانمدا ببینم،ماڵەکەی "پۆشکین" بوو. هەر لەزووەوە لەڕێی زمانی عەرەبییەوە بەپۆشکین ئاشنابیووم. ڕەنگە بەشی هەرە زۆری ئەو بەرهەمو شیعرانەی پوشکین، کە کراون بە عەرەبی خوێندبێتمەوە. ئەمە جگە لە ڕۆمانی "کچی ئەفسەرەکە"و هەموو ئەو وتارو باسانەیش، کە دەربارەی ژیانی و شیعرەکانی چاپکراون، دیومن و ئاگاداریانم. ئەمە جگە لەوەی، کە لەحەفتاکانی سەدەی ڕابوردوویشدا لە وەرگێڕانی عەرەبی شاعیر "حسن الشیخ جعفر"ەوە دوو سێ قەسیدەی پۆشکین-م کرد بەکوردی و بڵاوبوونەوە .

پۆشکین؛ یەکێکە لەگەورەترین شاعیرانی دنیا، ئەو شاعیرەی ماڵێ نییە لەسەرتاسەری ئەو وڵاتە بەرینەدا دیوانێکی ئەوی تێدا نەبێت. پیر یان گەنجێ نییە چەندین شیعری ئەوی لەبەرنەبێ! پەیکەرەکانی پۆشکین لەهەموو شارەکانی ڕووسیادا سەکۆکانی بەردەمیان بوو بەسەکۆی نوێژی عەشق و عاشقان و شەوانە تا درەنگ دڵداران دەست لەملان شیعری ئەوو ماچی خۆیان بۆ ژیان ئەکەن بە باران.

من؛ لەخەیاڵی خۆمدا وامئەزانی ماڵەکەی پۆشکین ڕەنگە هەرچەند ژوورێکی ئاسایی و هەندێ کەلوپەل بێ، بەڵام وەختێ دیمان، کۆشکێکی میرانە بوو!

چەندین باڵ خانووی تریشی لێبوو‌ە. چەند تەویلەی ئەسپ و شوێنی خزمەتچی و پشتیوان و هەیوان و دالان، هەر لەسەر ئەو تەرزەی، کە لەسەردەمی پۆشکین خۆیدا باوبووەو بەپێی ئەو ئەندازیارییەی، کە بەرزترین شێوەی جوانکاری بدا بەڕووکاری دەرەوەو ناوەوەیش فراوان و باشترین کەل و پەلی لە قەنەفەو کورسی و میز و تەختی نووستنی تێدا دانرابوو.

ژووری نووستنەکەی، ئەو چرپایەی لەسەری نوستووە، کتێبجانەکەی بەچوار دەوری ژوورێکی گەورەداو ڕەفەڕەفەو میزو کورسییەکەیشی کەلەسەری نووسیوە لەناوەڕاستدا دانرابوو، دوا کتێب کەخوێندویەتییەوە، هەروەکوو خۆی و دوا ڕەشنووسی و شووشەی مەرەکەب و پەڕەمووچ و ئەو پەڕە کاغەزانەی بەردەمی هەروەکوو خۆی دواجار چۆن بەجێهێشتوون بەو جۆرە پارێزراون. ئەو تەختە بەرگ چەرمە قاوەییەی کە دوای برینداربوونی لەماڵەوە لەسەری پاڵخراوە لەشوێنی خۆیدا ئەیبینی. سەعاتێکی گەورەیش بەدیوارەکەوە، ئەو سەعات و دەقیقەیە نیشان ئەدا کە پۆشکینی تێدا مردووەو لەو ساتەوە لەسەر ئەو ژمارانە ڕاگیراوە. ئەگێڕنەوە "تورجنیف"، کە لەو سەردەمەدا خوێندکاری زانکۆ ئەبێ لە پەترۆسبۆرگ، لەوەختی سەرەمەرگدا ئەگاتە لای پۆشکین و وەختێ ئەو گیان ئەداو تەواو ئەبێ.

تورجنێف؛ دەرفەت ئەهێنێ و هەندێ لەقژی پۆشکین ئەبڕێ و هەڵیئەگرێ. ئێستە ئەو تاڵە قژانە ماون و بوون بە بەشێکی یادگاری زیندووی لەشی پۆشکین و لەدنیاوە دێن بۆ ئەوەی چاویان پێبکەوێ.

خوێندکارەکان تاوێستگەی شەمەندۆفێری پەترۆسبورگ هاتن لەگەڵمداو لەکاتی خۆیشیدا شەمەندۆفێرەکە چەند فیشکەیەکی کردوو وردەوردە بەرەو ڕێگە دورودرێژەکەی مۆسکۆ جوڵاو لەبەر پەنجەرەکەوە دەستم بۆ بەڕێکەرانم هەڵبڕی تا لەچاو ونبوون و ئینجا لەجێگەکەی خۆمدا دانیشتم! لەولامەوە ئەفسەرێکی ڕووسی دانیشتبوو، ڕیزێ نیشان‌و میدالیا بەسنگییەوە بوون، "نوت شوجاعە"ی سەدام-یان بەبیرهێنامەوە !.

شەڕی ئێران و عێراق؛ ئەو جەنگەی میزاج و هەوەسی دیکتاتۆرێ بەرپایکردوو بۆ ماوەی هەشت ساڵیش هەشت ڕووبار خوێنی بەدوای خۆیدا هێنا. بە هەزاران هەزار گەنجی هەردوو وڵات لە دۆزەخەکەیدا بوون بەزوخاڵ و قەرەبرووت. شەڕێکی بێماناو بێ ئەنجام. هەزاران هەزار بێوەژن و منداڵی لانەوازو هەزاران هەزار گوندو مەزراو کێڵگەو خانووبەرەی خاپوورو وێران و ئاسمانێکی

دوکەلاوی و ڕەش، بەلام ئەوە یەکەمجاریش بوو لەشەڕێکی خوێناوی واگەورەی نێوان دوو دوژمنی خوێنە خوێی کورددا بەهۆی ئەو شاخ وداخەی کوردستان و هێزی پێشمەرگەوە ژمارەیەکی زۆری گەنجی کورد لەسوپای سەدام هەڵبێن‌و دەستی داگیرکەر نەیانگاتی‌و ئەگەر بەکولەمەرگیش بێ بژین و نەبنە سووتەمەنی ئەو جەنگە بێ ئامانە و لەناو ئەم سەربازە هەلاتوانەیشدا ژمارەیەکی لەبەرچاوی شاعیران و نووسەران و هونەرمەندانی کوردو غەیرە کوردیشیان تێدا بوو، کە شۆڕش دالّدەی دان و لەدوایشدا هەر بەهۆی هێزی پێشمەرگەوەو لەڕێی ئەوانەوە گەیشتنە ئێران و سوریاو لەو ولاتانەیشەوە خۆیان گەیاندە ولاتانی ئەورووپاو بوونە پەناهێندەو لە کیس میللەتەکەیان نەچوون.

خەیالّم ڕۆیشتەوە بۆلای هاوڕێکانم، بۆلای ئەو چایخانانەی ڕۆژانە لەسلەیمانی تیایاندا یەکترمان ئەبینی. بەتایبەتی چایخانەی (شەعب)ی بەردەرکی سەرا، چایخانە درێژینەکەی "وەستا شەریف" و ئینجا کوڕەکانی "کاک عومەر، کاک بەکر، کاک هیوا، کاک جەلال"، کە ببووە چایخانەی ئەدیبان و هونەرمەندان، بەلام مێژووی ئەم چایخانەیە بۆ کۆنترو سەردەمێکی زووتر ئەگەڕێتەوە. واتە ئەو کاتەی، کە بەتەنها وەستا شەریف ئەیبرد بەڕێوە. بەر لەکۆتایی پەنجاکان، کە قوتابی بووم و سەرەتای شەستەکانیش، کە تازە دەرچووبووم ناو بەناو لێی دائەنیشتم. ئەوسا هەر دالانەکە و سێ چوار قەنەفەی درێژو شەش حەوت کورسی نزمی تەختەی تێدا بوو. ژوورەکەی ئەولایشەوە چێشتخانەکەی "وەستا نەزەر" بوو. گەلێجار "عەبدوللا جەوهەر"م لەوێ ئەبینی. هەروەها کۆمەلێ لەئەدیبان و نووسەرانی ئەو کاتەیش جاربەجار ئەهاتن وەکوو "ئەخۆل، دیلان، ع. ع. شەونم، عەلی عارف ئاغا، ع. ح. ب"و چەندین پیاوی ناسراوی تری شاریش ڕوویان تێئەکرد. هەمیشەیش دوو سێیەک لەمشتەرییەکان خەریکی نێرگەلەکێشان بوون. یەکێک لەوانە "وەستا عەلی وەستا حەسەن"ی، خالّی دایکم بوو، ئەم پیاوە ڕۆژێ لەڕۆژان دوو قسەی لەگەلّدا نەکردم و منیش کە ئەمدی وا خوێن ساردە، بێدەنگ ئەبووم! جا ئیتر نازانم ئەیناسیمەوە یان نا؟!. خۆدیارە هەرچەند دوکانێک سەروو چایخانەکە، کتێبخانەی سلەیمانی کاک "عومەر عەبدولڕەحیم"ە. ئەویش بۆ ئێمە سەنتەرێکی گرنگ و پێویست بوو. کە لەمالّ بهاتینایەتە دەرەوە، چوون بۆلای کاک عومەر حەتمی بوو! چ بۆ کتێب و ڕۆژنامەکڕین و چ بۆ یەکگرتنەوە لەگەلّ برادەرەکاندا. ئیتر لەو شوێنە

تەنگەبەرەداو هەر بەپێوە دەوری کاک عومەرمان ئەدا. هەڵبژاردەیەک لەڕووناکبیرانی شار بەتایبەتی عەسران و دەمەو ئێواران لەوێ کۆئەبوونەوە. هەموو دەنگ و باسەکان لەوێ بوون. هەموو چاوپێکەوتن و بەڵێنەکان بۆ ئەوێ دائەنران و لەوێشەوە بۆ شوێنی تر. کاک عومەر؛ خۆیشی لەو پیاوە ڕووخۆش و قسەخۆش و بەوێڵ و کارامانەیە، کە تاقەتت لێیناچی و کتێبخانەکەیشی بۆ ئێمە بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵانە سەرچاوەی سەرەکیی ڕووناکبیری و ئەدەبیمان بووە. تا ئەم دەقیقەیەش، کاک عومەر و کتێبخانەکەی دوو نیشانەی جوانی شارن و لە بیرەوەری ئێمەیشدا ئەو شوێنە و ئەو پیاوە بەهای تایبەتی خۆیان هەیەو لە یادناچن .

لەسەرەتای هەشتاکاندا، نووسەران لەناو خۆیاندا، ئاڵۆزی و ناتەباییان زۆربوو. بەشی زۆری ئەم پشێوییەیش هۆو هۆکارەکانی شتی شەخسی بوون و جێی باسکردن نین. ئەوەی ڕاستیبێ نەک هەر ئەو وەختە بەڵکوو هەر لەحەفتاکانەوە ئێمەومانان دانوومان لەگەڵ تاقمێک لەو نووسەرانەدا نەئەکوڵاو ئەوانیش هەروەها! کارگەیشتبووە ڕادەیەک دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول و سەرهەڵدانەوەی موقاوەمەت لەشاخەکاندا، من چەندجار بەگوێی خۆم گوێم لێئەبوو هەندێک لەوانە ئەیانوت "هیچ نین بەجرتێک دێنەوە!" یان ئەوکاتەی کۆمەڵێک لەئێمە چووینە پاڵ شۆڕشی ئەیلول و شارمان بەجێهێشت ئەیانوت "شوێن قەرەباڵغییەکە کەوتوون". بە هەرحاڵ، لەسەرەتای هەشتاکانیشدا ئەو ئاڵۆزییە بەردەوامبوو. لەبەرئەوە وامان بەچاکزانی، چایخانەکە بگۆڕین‌و ئەمجارەیان چایخانەی "کاروخ"ی نزیک مزگەوتی گەورەمان دۆزییەوەو ئیتر ڕۆژانە ئەچووین لەوێ دائەنیشتین! هەر لەو سەرودەمەدا کۆمەڵێ کوڕی گەنج زۆر لەئێمە منداڵتر، ئەوانیش ناو بەناو ئەهاتنە "کاروخ"، لەولاوە دائەنیشتن و گەلێجاریش بێدەنگ گوێیان لێئەگرتین. یان بۆ خۆیان ئەیانخوێندەوە. لەنێو ئەم کۆمەڵەدا سێ گەنجیان لەساڵانی دواتردا لە نەوەدەکانەوە بۆ سەرو دوو هەزارو تائێستە، توانییان پشت بەستوو بە بەهرەو ڕووناکبیری خۆیان و ئەفراندنیان، ببنە سێ نیشانەی ڕۆشن و دیار لەئەدەب و لێکۆڵینەوەو ڕەخنەی عەقڵانی کورددا ئەو سێیانەیش "بەختیار عەلی" و "مەریوان وریا قانیع" و "ئاراس فەتاح" بوون!

هەر لەو سەردەمە بەژەنگو ژارەدا، لەبەر ئاڵۆزی باری دەروونی و نادڵنیایی لەوەی کەنەتئەزانی سبەی چی ڕووئەداو چیت بەسەردێ، حەزمئەکرد هەمیشە

لەناو خەڵکیدابم، تەنیایی ئەوەندەی تر ترس و بیم و دڵە ڕاوکێی بۆ زیاد ئەکردم، ئەگەر بەدەست خۆمبوایە، حەزمئەکرد شەوانیش تا ڕۆژ ئەبۆوە هەر لەناو کۆڕو کۆمەڵدا بم. ڕۆژێ نەبوو بڕوات و هەواڵی لەسێدارەدانی یەکێک یان چەند کەسێک نەبیستین. کە ئازادی نەبوو ژیانیش نییە. ڕۆژانە تانیوەڕوان لەبیری ئیرتوازیی و لەبەشی کارگێڕی کارمئەکرد. کارەکان ئەوەندە نەبوون بۆیە کە دەستم بەتاڵ ئەبوو، ئیتر یان ئەمخوێندەوە یان ئەمنووسی، هەندێجاریش کوڕو کچی تازە پێگەیشتووی شەیدای شیعرو ئەدەب سەردانیان ئەکردم و نووسینەکانی خۆیان نیشان ئەدام. بیرمە یەکێک لەو کچۆلە بەهرەدارانەی ئەوسا ئەهات بۆلام و تازە لەگرۆگاڵی شیعردا بوو "دڵسۆز حەمە" بوو. کە لەساڵانی دواتردا کۆمەڵێ شیعری جوان و سەرنجڕاکێشی بڵاوکردەوە. لەو ڕۆژگارانەدا هەموو فەرمانگەیەک ئەفسەرێکی ئاسایشی بۆ دانرابوو. ئەوەی بیری ئیرتوازی ناوی خەڵکی بەسرەبوو، ئەیزانی من کێم و کێ نیم! بەڵام ئەم پیاوە بێوەی بوو، ئازاری کەسی نەئەدا، هەمووجارێ بەهاوڕێ نزیکەکانی خۆم ئەوت: (ئاخر چۆن ئەبێ کەسێکی وا بەعسی بێ؟!). دوای نیوەڕوانیش چایخانەو پیاسەو ئێوارانیش بەرەو یانەی مامۆستایان ئەڕۆیشتین و "خاڵە شەمۆ" دەرئەکەوت .

خاڵە شەمۆ؛ خەڵکی بادینان و مەسیحی بوو، ئەو کاتە تەمەنی لەپەنجاکاندا ئەبوو، پیاوێکی لاوازو کراس و شەڕواڵێکی کوردی لەبەرئەکرد. یەکێک بوو لەخزمەتچییەکانی یانەی مامۆستایان و سەرپەرشتی هەموو شاگردەکانی تریشی ئەکرد. بەدرێژایی چەند ساڵ ئەم پیاوە شەوانە نزیکی ئێمە بوو، بۆیە ناکرێ لە یادیبکەم. دواتر نەمانزانی چی بەسەرهات!. هەر لەو ساڵانەدا ئەگەر بۆمان بلوایە و تاقەتمان بوایە سەفەری هەولێرو بەغدامان ڕێکئەخست. لە هەولێر لەپێشدا سەردانی دوکانەکەی کاک "عەبدولخالق مەعروف"مان ئەکردو دواتر ئەگەر "کاکە مەم"یش لەوێ بوایە، پێکەوە لەگەڵ "نوری نانەکەلی" و هاوڕێ نزیکەکانی تردا لەنادی "حقوقیین" یەکترمان ئەگرتەوە .

نەبەعس زەنگەنەی پێ ماڵیکرا؛
نەمەست بوون بێ زامدار تامی هەبوو..

لەبەغدایش هاوڕێ و ناسیاو زۆربوون. سەردانی بەغدایش بێ بینینی "مەحمود زامدار" و شەوانی مەستبوونیش بێ ئەو تامی تیا نەبوو! خۆ ئەگەر شیعرێکی تازەیشم پێبوایە "زامدار" بەدڵی بوایە، ئەبوو ئیتر خۆم بۆ شڵپەشڵپی ماچ و موچەکانی ئامادەبکەم و پێشمخۆشبوایە یان نا متەقم لەخۆم ببڕیایە. زامدار؛ لەحەفتاکانەوە زێوان و ئاپۆوکریی شیعری تازە بووە. ئاگای لەڕەوتی هەڵچوون و داچوونی بووە. مەلاشووی گەلێ شیعرو چیرۆکمان بەپەنجەی ئەو هەڵدراوەتەوە. شیعرێک یان چیرۆکێ نەبووە جوان بێ و ئەو یەکەم ماچی نەکردبێ. هەر لەبەغدا و لەسەرەتای حەفتاکانەوە و هەتا ئەمڕۆیش یەکێک لەو ئەدیبە دیارانەی بووە هاوڕێی گیانیم کاکە "محێدین زەنگەنە" بوو .

ئەگەرچی زەنگەنە؛ دوور لەویست و خواستی خۆی نەیتوانیوە بەکوردی بنووسێ و ئەمەیش هەر بۆ بارودۆخە نالەبارەکەی مەسەلەی کورد ئەگەڕێتەوە، بەڵام بەردەوام لەشانۆنامەو چیرۆک و ڕۆمان و نووسینەکانیدا کورد بوونی خۆی سەلماندووەو لەئەدەبێکیشدا کاری کردووە، کەئەدەبی ئینسانی بووە. دوور لەهەموو دەمارگیرییەکی ئایدۆلۆجی و سیاسی بەسەر خەم و مافی مرۆڤ و جوانیدا پەنجەرەیەکی ڕۆشن بووەو کراوەتەوە. هێندەی ئەمانەیش گرنگ، زەنگەنە سەربڵند بووە. ڕۆژێ لەڕۆژان نەخلیسکاوەتە ناو هیچ کام

لەزەلکاوەکانی ڕژێمەوە. بەعس نەیتوانیوە ماڵیی بکاو تەنانەت یەک وشەیشی پێبونووسێ!. گەورەیی ئەدەبی زەنگەنە، لەگەورەیی هەڵوێستی ئینسانییەوە هاتووە. لەسەردەمێکدا، کە کۆمۆنیستیش بووە ئەدەبەکەی نەداوەتە دەست دروشمبازی و گەمەی خۆڕایی سیاسەت و ئاگای لەوەبووە هونەرەکەی لەئاستی بەرزی داهێنان‌و ئەفراندندا بهێڵێتەوە. شێوازی ئەدەبی و شانۆیی زەنگەنە، ئاڵۆزو بەگرێ و گۆڵ نییە، چون ڕاستیی ئاسانەو قوڵیشە. وەک هاوڕێش زەنگەنە سادەو ساکارو بێ فیزەو بەبێ نوکتەو قسەی خۆشیش ناتوانێ بژی .

هەر لەسەرەتای هەشتاکانداو بەرەو ژووریش زنجیرەیەک نامیلکەی چاپکراو بە وتەو گوتارەکانی دیکتاتۆر سەدام حسەین بەزمانی کوردی کەوتنە بازاڕەوە. ئەم نامیلکانە بەشی هەرە زۆریان ناوی وەرگێڕەکانیان لەسەر نەنووسرابوون. ئەوەندەی من بزانم ئەو وەرگێڕانانە بەشی زۆریان لەلایەن ئەو نووسەرانەوە کرابوون کە لەدەزگا ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنەکانی ڕژێمداو لە بەغدا کاریان ئەکرد. نووسەری ناسراویش کەوتبوونە ناو ئەم گەمە دزێوەی ڕژێمەوە. بەڕاستی لەو ڕۆژگارەدا، کە کورد کەوتبووە بەر هێرشی قەلاچۆکردنی دیکتاتۆر، ئەو نووسەرە نەفس نزمانە پێیانزانیبێ یان نەیانزانیبێ بەو کارانەیان غەدریان لە گەلەکەی خۆیان ئەکردو لەهەمانکاتیشدا زمانی کوردییان ناشیرین ئەکرد .

هەر لەبەغداو لەو سەفەرانەدا هەندێجار لەچایخانەی پەرلەمان و لەیانەکاندا، هەندێ لەشاعیر و ئەدیبە عێراقییە عەرەبەکانم ئەبینی. بەلام بەڕاستی بەشی هەرە زۆریان چووبوونە سەر خوانی سوڵتان و لێبووبوونەوە. ئەوانی تر یان عێراقیان بەجێهێشتبوو، یان بێدەنگ بووبوون. ئەمە جگەلەوەی ئەو پەرۆشییەم تێدا نەمابوو بۆ ئەوەی مەبەستم بێ بیانبینم. چونکە بەڕاستی نەک هەر ئەو سەردەمە، بەڵکوو لەدروستبوونی دەوڵەتی عێراقەوە سیستەمی پەروەردەو مێژوو لەعێراقدا سیستەمێکی شۆڤێنیی‌و ڕەگەزپەرست بووە، وەک چۆن هاووڵاتی کورد بەپلە دوو سێ تەماشاکراون. زمان و ئەدەبی کوردی و شاعیرانی و هونەرمەندانیشی هەروا سەیرکراون. ئەدیبە عێراقییە عەرەبەکان قەت ئاگایان لەئەدەبی کوردی نەبووە، چونکە زمانی سەردەست هەمیشە هەر زمانی عەرەبی بووەو ئەوانیش چ کارێکیان بەزمانی کوردی نەبووە، شاعیر و نووسەری ئیسپانی و ڕووسی و ئەڵمانی لای ئەوان ناسراوبوو، بەلام شاعیرو

نووسەری کورد لای ئەوان هەمیشە لەجێی نەبووان بووە. قەتیش باسیان نەکردووە. ئێمە ڕۆژی لەڕۆژان وتارێکمان نەخوێندەوە، کەشاعیرە ناسراوەکانیان، یان چیرۆکنووسە دیارەکانیان، یان ڕەخنەگرە بەناوبانگەکانیان نووسیبێتیان و باس لەوە بکەن، کە ئەم دابڕانە گەورەیە لەنێواندا هەیە، ئەمە لەکاتێکدا، تۆ ئەبوو هەر عێراقی بی و ئەگەر بەجۆرێکی تر بیرتبکردبایەوە بەجیاوازی خواز لەقەڵەم ئەدرایت! تۆ بڕوانە ئەو لێکۆڵینەوە ئەدەبی و مێژووییانەی، ئەو نامەی ماستەرو دوکتۆرایانەی، لەبارەی شیعر و چیرۆک و هونەرەوە نووسیویانن، لە پەراوێزدا، یان بەئاماژەیش شتێک بێتە باس لەئەدەب و هونەری کوردی- کوردستانی عێراق بکات. بۆ نموونە ئەوکاتەی باس لە بزووتنەوەی شیعری تازە ئەکەن لەعێراقدا، مەبەستیان شیعری نوسراوە بەزمانی عەرەبی، هەروەها چیرۆک و یان هەر بابەتێکی دیکە. زمانی کوردی لەدەرەوەی ئەو بەرنامانەی ئەواندایە و بەمجۆرە ئەوان خۆیان ناڕاستەوخۆ وتوویانە ئێوە جیاوازن و عێراقی نین! باشە ئەگەر بۆ ئەدەب هۆکاری گەورە ئەوەبێ، کەزمان بۆتە هۆی ئەم لەیەک دابڕانە، ئەی باشە بۆ هونەری شێوەکاری ئەڵێن چی؟، کە بەهەمانشێوە چ لەباسکردنی مێژووی ئەم هونەرەداو چ لە دیاریکردنی ناوی هونەرمەندانی کورددا پەراوێزێکی بچووکیشیان پێڕەوا نەبینیوین!. برایەتی هەر وا ئەبێ!. بەهەرحاڵ من خۆم ڕۆژێ لەڕۆژان هەستمنەکردووە شتێک هەیە لەناو مندا پێی بوترێ عێراقی، شەراکەتی ڕاستەقینە. بەپێچەوانەوە ئەوەتەی سوپای عێراق دروستبووە، نەخشەی عێراق بۆ من هەر سێدارەو دارەمەیت بووە!. ئەوەتەی سیستەمی خوێندن و پەروەردەیان داڕشتووە بەرنامەی فاشیزمی عەرەبییان بەسەرمندا سەپاندووە. من هەرگیز خۆم بەهاووڵاتی عێراقی نەزانیوە. چونکە بەردەوام لەسەر کورد بوونم چەوسێنراومەتەوە، عەسکەرێکی عەرەبی خەڵکی سامەڕا لەشارێکی وەکوو سلەیمانیدا توانیوێتی سووکایەتی بەگەورەترین شاعیرو هونەرمەندی ئێمە بکات و مەسەلەکەیش زۆر ئاسایی بێت و هیچ لێپرسینەوەیەکیشی بەدوادا نەیەت .

ئێمە هاووڵاتی عێراق نەبووین، ئێمە کۆیلەی عێراقی بووین. من نازانم بۆ پاشەڕۆژ چۆن ئەبێ، بەڵام تەنها ڕێیەک، کەڕێی دیموکراسی و شارستانیی بێ، ئەوەیە: "پێویستە لەڕاپرسییەکی گشتی سەرتاسەریداو لەکوردستاندا و بە سەرپەرشتی چاودێرانی نێودەوڵەتی، چارەنووسی کورد بدرێتە دەست گەلی

کوردستان خۆی، بۆ ئەوەی پاشەڕۆژی سیاسی خۆی دیاریبکات!". بڕیاردان لەسەر هەر مافێک بۆ کورد ئەگەر لەڕێی ڕاپرسییەوە نەبێت بەلای منەوە نایاسایی و نادیموکراسی و لەهەمانکاتدا گوێنەدانە بەڕای گشتی گەلی کوردستان!. ئەدیب و ڕووناکبیرێکی خەڵکی نەجەف یان بەسرە لە هیچ قۆناغێکدا ترسی ئەوەی نەبووە زمان و مێژوو کەلتووری لەناوبچێت. ترسی ئەوەی نەبووە بتوێنرێتەوەو بکرێ بەقەومێکی تر، بەلام ئەو مەسەلەیە بۆ ئەدیب و ڕووناکبیری کورد لەهەموو قۆناغەکاندا لەپلەی یەکەمی مەترسییەکاندا بووە. هەڵبەت دیارە چ بەنیسبەت عێراق و چ ولاتانی عەرەبی و ڕژێمەکانییانەوە، گیروگرفتی هەرە گەورە، نەبوونی دیموکراسییە. نەبوونی ئازادی ڕادەربڕینە نەبوونی ئازادی ژن و مافی یەکسانی و بەرامبەرییە. کە دیموکراسیەت نەبوو باسکردن لەهەر مافێکی نەتەوەیی، مەزهەبی، کەلتووری و کۆمەلایەتی، ژیانی مەدەنی و شارستانی، ئەبێتە جۆرێک لەخۆتەفرەدان و ئاسنی سارد کوتان!

لەبەغدای دوای کۆتایی شەڕی ئێران و عێراق. جگە لەڕۆژنامەی هاوکاری و گۆڤاری ڕۆشنبیریو بەیان و بلاوکراوەکانی تری دەولەت. ئەمجارەیان ڕژێم هەفتەنامەیەکی تازەی بەناوی "ئاسۆ"ەوە دەرکرد. مەبەست لەدەرکردنی ئەم ڕۆژنامەیە ئەوەبوو، کە لەم کەناڵە تازەیەوە بەشێوازێکی جیا لەوەی لەهاوکاریدا بووە هێرش بکاتە سەر بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو هێزی پێشمەرگەی کوردستان. ئەگەر تەماشای ئەو سەروتارانە بکەین، کە بەشی زۆری سەرنووسەری ڕۆژنامەکە "عەبدولوەهاب تالەبانی" بەپێی ڕێنومایییەکانی ڕژێم نووسینی، ڕاستی ئەم قسەیەمان بۆ دەرئەکەوێ. ئاسۆ ڕۆژنامەی ئاسایشی بەغدا بوو. ڕاستەوخۆ لەلایەن ئەوانەوە چاودێری ئەکرا. هەندێ لاپەڕەیشی بۆ ئەدەب و کاری وەرگێڕان تەرخانکرابوو. ئەمە جگەلەوەی ڕژێم ئەیویست لەڕێی ئەم ڕۆژنامە زەردەوە. ئەدیب و هونەرمەندانی کورد بکڕێو دەستەمۆییانبکات، یان لایەنیکەم بێدەنگیان بکات. بەداخەوە چەند نووسەرو ئەدیبێ کە تا ئەوکاتە خۆیان لەهەموو پەڵەیەک پاراستبوو، بەخوایشتی خۆیان یان بەناچاری، لەو سەردەمە تاریک و سەختەدا و لەبەغدا کەوتنە هاوکاریکردنی ئەم ڕۆژنامەیە، کە نەئەبوو قەت بیکەن. دیارە من ئەوانە تۆمەتبار ناکەم بەوەی دەستیان لەگەڵ ڕژێمدا تێکەڵکردبێ، نا، بەلام هەڵوێستیان لاواز بوو، وایان ئەزانی ئیتر ئومێدێ نەماوەو سەری دنیا بەپووش گیراوەو سەدامیش تا سەر ئەمێنێ!

لەژێر پەیکەری مارکس و ئەنجلس‌و لینین-دا
ژن‌و منداڵی رووت‌و ڕەجاڵ

گەیشتمە مۆسکۆ، کاک "شۆڕشی دکتۆر خالید" و چەند برادەرێکی تر چاوەڕوانیان ئەکردم. شەقامە سەرەکییەکانی ناو مۆسکۆ جوان و پاک و خاوێن بوون. چاوم بەپەیکەرێکی بەرزو ئێجگار هەڵچووی بەرەو ئاسمان کەوت .

وتیان ئەمە: "پەیکەری گاگارینی یەکەم گەشتکەری ئاسمانە". کەڵێی وردبوومەوە "ڕاستە، کوتومت هەر لەخۆی ئەچوو". چوومەوە بۆلای کاک شۆڕش لەنێو ئەو برادەرانەدا، کە هاتبوون بەپیرمەوە گەنجێکیان تێدا بوو، ناوی "شێرزاد" بوو، لەدواییدا هەر تەواو بووین بەهاوڕێی یەکتر، قسەخۆش و کراوەو لەمیزاجی منیش تێگەیشتبوو. ئەوەی ڕاستیبێ هەر لەدوای گەیشتن بەکاک "شۆڕش"م وت: (حەزئەکەم شوقەیەکی ڕێکخراوی ئامادە، بەهەموو کەلوپەلێکەوە بەکرێ بگرم). ئەو وتی: (وا چاکە سەردانی پەیمانگەی ڕۆژهەلاتناسی بکەین، بۆ ئەوەی ئەوان نوسراوێکمان بۆ بکەن بۆ بەرپرسی ئەپارتمانەکانی زانکۆو شوقەیەکمان بدەنێ، هەم خۆشەو هەم هەرزانیشە). بۆ بەیانی چووین بۆ پەیمانگەی ڕۆژهەلاتناسی لەژوورێکی گەورەو بەرفراواندا چەند مێزێ دانرابوون، لەوێ پرۆفیسۆر "حەسرەتیان"مان بینی، هەڵبەت خۆی ئەرمەنییەو بەڵام لەمەیدانی کوردۆلۆجیشدا کاریکردووە. هەر لەوێ نووسراوەکەم وەرگرت و چووین بۆ شوێنی مەبەست. من لە دەرەوە چاوەڕێم ئەکرد، بەڵام ئەو برادەرەی نامەکەی

برده ژووری پێیوتم (هەندێ ڕۆبلی بدەمێ چونکە وەک بەرئەنجام هەر بەڕۆبڵ ڕازیئەکرێن و هەروایشبوو!). کلیلەکانی لەگەڵ خۆیدا هێنایە دەرەوەو بەرەو ناونیشانی ئەپارتمانەکە ڕۆیشتین. ئەپارتمانێکی تازەبوو. پێموایە شووقەکەی من لەنهۆمی چوارەم بوو. لەخواریشەوە پرسگەیەک هەبوو، دوو کارمەندی لێبوون. هاوڕێکانم پێیان وتم: (بۆ ئەوەی کار ئاسانیت بۆ بکەن‌و تووشی گێرمەوکێشە نەبی لە گەڵیانداو میوانەکانت ئاسایی بێن بۆلات، چاتر وایە دەستت پێیانەوە بێت، جا یان هەموو جارێ هەندێ ڕۆبڵیان بدەرێ یان کیسە چایان بۆ بکڕە). ئامۆژگارییەکانم لەگوێگرت و لەو بارەیەوە لەگەڵ پرسگەکەدا موومان بە بەیان نەئەچوو. شوقەکە دوو ژوورو هۆڵ و موبەقێک و گەرماوو توالێت و ئیتر هەموو پێداویستییەکانی تری ماڵێکی تەواوی تێدابوو. کاک "غازی" یەکێک بوو لەو هاوڕێیانەی بەردەوام لەگەڵمابوو. شەویش هەر لەلای من ئەمایەوە. کوڕێکی قسەخۆش و لەش سووک و گورجوگۆڵ بوو. خەڵکی بادینان بوو. تا لە "مۆسکۆ" بووم هەر لەو شوقەیەدا بووم .

ئەو شڵەژان و بەیەکدا هاتن و شپرزەییەی بارودۆخەکە دروستی کردبوو، لە "مۆسکۆ"، زۆر زیاتر بوو وەک لە لینینگراد. بەردەوام و هەموو ڕۆژێ جۆرێک لەخۆپیشاندان هەبوو. باری ئابووری و بژێوی خەڵک خراپ و داڕزیو بوو. دوکانەکان چۆڵ و هیچی وایان تێدا نەبوو. ئەو بازاڕانەی کەدەوڵەت ئەیبردن بەڕێوە نرخی شت و مەک و خۆراکییان تێدا هەرزان بوو، بەڵام زۆر زوو ئەفرۆشران و نەئەمان. هەرچی بازاڕی تریش بوو، خەڵکەکەی خۆیان، نەیانئەتوانی ڕووی تێبکەن و هیچیان لێبکڕن. ئێمە ڕۆژێکیان ڕوومانکردە بازاڕی سەوزە فرۆشی جوتیارەکانی خۆیان، هەموو شتێکی تێدا بوو، بەڵام کڕیاریان نەبوو. لە بەردەمی ئەم بازاڕەدا، دیمەنێکم بینی، هەرگیز لەبیرمناچێتەوە .

"پیاوێکی سەروڕیش هاتووی هەژار، چەند ماسییەکی وشکەوە بووی لەسەر ڕۆژنامەیەکی دڕاو ولەسەر ئەرزەکە دانابوو بۆ فرۆشتن". ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ناوبەناو ئەم پیاوە لەپارچە کاغەزی ڕۆژنامەکەی ئەکردوەو دەستی ئەکرد بەگیرفانیا و تۆزێ تووتنی لێدەرئەهێناو ئەیکردە ناو کاغەزەکەوەو ئەیپێچایەوەو ئەیکرد بەجگەرەو ئەیکێشا! جا ئیتر تۆ لەم دیمەنەوە تەماشای هەموو شتەکانی تر بکە! ئەمە ئەو وڵاتە ئیشتراکییە بوو، کە بەدرێژایی (٧٣) ساڵ دەهۆڵی بۆ لێئەدراو دەرویشە مارکسییەکانی لای ئێمەیش دووراودوور

حاڵ ئەیگرتن. لە لینینگرادو لە مۆسکۆیش، لەژێر پەیکەرە گەورەکانی مارکس و ئەنجلس و لینیندا ژن و منداڵی دەرۆزەکەری ڕووت و ڕەجاڵ و برسیی تێت ئەئالان. ئەم دیمەنانە ڕۆژ نەبوو بەچاوی خۆم نەیانبینم. کاک "شێرزاد"ی هاوڕێمان، لەماڵەکەی خۆیدا چەند جارێک بانگهێشتی کردین و لەم کۆڕانەیشدا کیژو کوڕی ڕووسیان تێدا بوو. شەوێکیان لەکچێکیانم پرسیی: (ئەو چۆن لە ئیشتراکییەت گەیشتووە؟!) لەوەڵامدا پێکەنی و وتی: (ئەوەی ئێمە لێرە تێیگەیشتووین و تیا ژیاوین، ئیشتراکیەتی برسێتی بووە). وتم: (ئەی بەلای تووە بەختیاری و مافی مرۆڤ چییە؟!) لەوەڵامدا وتی: (گرنگ نییە ناوی چییە! من لەگەڵ هەر ڕژێمێکدابم شوقەیەک و ژیانێکی مام ناوەندیم بۆ دابینبکات و وەک مرۆڤ بژیم و ئازادبم. جا ئیتر مارکسییە، سەرمایەدارییە یان بۆرژوازییە. ئێمە ژیانمان ئەوێ، کتێب و دروشمەکان تێرمان ناکەن. ئەی نابینی ژیان لێرە چۆنە؟! بەڵام ئێستە ئومێدێکمان بە گۆڕانێک هەیە نازانین چی ئەبێ).

لەو سەرودەمەدا دەزگاکانی دەوڵەت وەک لەبەریەک هەڵوەشابن وابوو. ئەچوویتە هەر شوێنێ باس باسی باندی مافیاکان بوو، کە وەک ئەختەبووت پەلوپۆیان بە هەموو لایەکدا بڵاوکردبۆوە. مافیاکان دەستیان بەسەر هەموو شوێنێکی گرنگدا گرتبوو، لەڕێی ئەوانەوە نەبوایە، بازرگانی نەبوو، بەهۆی ئەوانەوە نەبوایە یان لەژێر چاودێری ئەواندا هیچ دەوڵەمەندێک نەیئەتوانی بەرژەوەندییەکانی خۆی بپارێزێت، لەبەر ئەوە ببوون بە شەریک لەهەموو دانوسان و کارێکی بازرگانیدا. بۆ نموونە: ئەوەی دوکانێک یان چێشتخانەیەکی دابنایە، یان کۆمپانیایەکی بکردیاتەوە، ئەگەر بەشێکی مافیاکانی تێنەخستایە نەیان ئەتوانی هیچ بکەن. جارێک لەگەڵ چەند ڕووسییەک دانیشتبووین، باسی مافیاکان کرا، یەکێکیان وتی: (ئەم مافیایانە پارەیان بدەرێ، دەبابەت بۆ ئەهێنن، چیت ئەوێ بۆت پەیدا ئەکەن. ئەگەر لەژێر ئەرزیشدا بووە. چونکە لە هەموو شوێنێکدا و لەسەر هەموو ئاستێ خەڵکی خۆیان هەیە، لەلیژنەی مەرکەزی حزبی کۆمۆنیستەوە تا ئەگاتە ناو دۆمای پەرلەمان و تا وەزارەتی بەرگری و هەموو وەزارەتەکانی تر!). دە ڕۆژێک ئەبوو لە مۆسکۆ بووم، کاک شۆڕش و کاک شێرزاد وتیان: (کاک حەمە جەزای هونەرمەند و گۆرانیبێژ لێرەیە!). ئەم هەواڵە بۆ من زۆر خۆشبوو. چونکە دواجارو لە (١٩٨٦)ەوە لەبەرگەڵوەوە یەکترمان نەدیبوو. هەر ئەو ئێوارەیە یەکترمان بینی، پێموایە یەکێک لەکوڕەکانیشی لەگەڵدا بوو. لێمپرسی ئەوە چۆنە گەیشتویتە ئێرە؟ تێیگەیاندم

ئەیەوێ لێرەوە بەخاوو خێزانەوە بڕۆن بۆ ئەوروپا، وابزانم بۆ کاروباری ڕۆیشتن و ڤیزە کاک شۆڕش و ئەو برادەرانە بۆیان خەریکبوون. ئێمە لەبەرئەوەی لەئەوروپاوە هاتبووین و دۆلارمان پێبوو، ئەمانتوانی دانیشتنی خۆش و تێروتەسەل ڕێکبخەین. ئەو شەوە لەگەڵ کاک حەمە جەزاو شۆڕش و شێرزاد و کۆمەڵێ کچ و کوڕی ڕووسیدا، لەخۆشترین بارو چێشتخانەی مۆسکۆدا دانیشتین. نزیکەی دەکەسێک ئەبووین. لەوەختی قسەکردندا لەڕووسییەکم پرسیی ئەم داوەتە بۆ ئێوە چەندی تێئەچێ؟! لەوەلامدا سەری باداو وتی: (جاری بەر لە هەموو شتێ ئێمە ناتوانین هەرگیز لەچێشتخانەیەکی وادا نان بخۆین، یان بخۆینەوە، دوایئەوەیش بۆ وەلامی پرسیارەکەت، داوەتێکی وەک ئەم سەرمێزەی ئەمشەو مووچەی چەند مانگێکی ئێمەی ئەوێ! ئەو شەوە کاک حەمە جەزا کوڕەکەی گەرمکردین لەپێشدا بەقسەی خۆش و دواتریش بەگۆرانیی.

ئەو برادەرانەی لەگەڵمدا بوون، هەر ڕۆژەو ئەیانبردم بۆ شوێنێ. بۆ یەکەمجار "مەیدانی سوور"م بینی. مەیدانێکی ئێجگار فراوانو جوان، وابزانم "مۆزەی لینین" ئەوەندە لەوێوە دوور نەبوو، بلیتمان بڕی و چووینە ژووری. ئیتر لەمنداڵییەوە هەر شتێ پەیوەندی بەلینینەوە هەبووبێت لەم مۆزەیەدا بوو، بەلام سەیر ئەوەبوو بەئێمەوە دە کەسیتری تێدا نەبوو! لاموایە ڕۆژگارەکەی وابوو خەڵکی خۆیان تاقەتیان لەوە چووبوو بێن بۆ بینینی ئەم جۆرە مۆزانە!. هەر لەمەیدانی سوور بوو، یەکێک لەخوێندکارەکان، کە گەنجێکی کوردی سوریا بوو، بۆیگێڕامەوە کەدوابەدوای کارەساتی هەڵەبجە، لەم مەیدانەدا کۆمەڵێ لەگەنجە کوردەکان خۆپیشاندانیانکردبوو، بەلام پۆلیسی ڕووسی زۆر بەتوندی لێیدابوون و بڵاوەی پێکردبوون !.

شایانی باسە لەو سەردەمەدا ڕۆژنامەکانی ئەو وڵاتەو ڕاگەیاندنی ڕەسمیی یەکێتی سۆڤییەت، نەک هەر بەوشەیەکیش ئاماژەیەکیان بەکیمیابارانی هەڵەبجە و ئەو تاوانە گەورەیە نەکردبوو، بەڵکوو دوای چەند ڕۆژێ سەروتاری زۆربەی زۆری ڕۆژنامە جلەوکراوەکانی ڕووسیا، بەشان و باهووی سەدام حسەینی دیکتاتۆردا هەڵیاندابوو. لە مەیدانی سووردا، هەندێ وێنەکێش خەریکی وێنەکێشان بوون. بەدیار یەکێکیانەوە ڕاوەستام، شێوازی کارەکانی لەوێنەکێشی ناسراوی کورد (ئیسماعیل خەیات)ەوە نزیکبوو. سەیرە لەم دنیایەدا شتێ لەیەکچوو ئەبینینەوە .

کاک ئیسماعیل؛ لەکوێ و ئەم وێنەکێشە لەکوێ!. ئەم ڕێکەوتە منی گێڕایەوە بۆ ناوەڕاست و کۆتایی حەفتاکان، لەوکاتەوە من و کاک ئیسماعیل هاوڕێین و پەیوەندیمان هەتا ئەم ڕۆژانەیش هەر بەردەوامە. شێوازی خەیات، شێوازی وردبوونەوەو قوڵبوونەوەیە لەو وردەکارییانەدا، کە تەنها چاوی هونەرمەندێکی گەورە ئەیبینێ. بۆ ئەو سەردەمە کارەکانی خەیات، کاری گۆڕان و تازەبوونەوەیەکی هونەری لەبەرچاو بوون. لەساڵی (١٩٧٨)یشدا وەختێ دیوانی "کازیوە"م چاپکرد، چ پۆرتەریتی سەر بەرگەکەو چ وێنەکانی ناوە ئەو کێشابوونی، خەت و نووسینی شیعرەکانیش کاک "شەهاب عوسمان" ئەنجامیدابوون .

ئەمە جگەلەوەی ساڵێ دواتر، وائەزانم لە (١٩٧٩)دا بوو، هەر لەسلەیمانی لە پێشانگەیەکی گەورەداو لەموزەخانەی سلێمانی شیعرو وێنە ئاوێتەی یەکتربوون. بەدەیان هونەرمەندی شێوەکاری ئەو کاتە بەشداری ئەم پێشانگەیەیان کردبوو. شیعری شاعیرەکان لەتابلۆی ئەواندا ببوون بەئاسۆو فەزایەکی تر بۆ بینین و خەیاڵی ئەو هونەرمەندانە. ئەمە جگەلەوەی ئەوە یەکەمجاربوو، کە شیعرو وێنە پێکەوە پێشانگەیەکیان هەبێت. دیارە یەکێک لەو وێنە کێشە دیارانەی ئەو کاتە هونەرمەند خەیات بوو. هەروەها چەندین هونەرمەندی تری شاری سلێمانی وەکوو کاکە "عەلی جۆلا"و زۆری تر لەم پێشانگەیەدا بەشدارییان کردبوو. لەجێی خۆیدایەتی لەڕێگەی کاک "ئیسماعیل"ەوە هاوسەرە خۆشەویستەکەی هونەرمەندی دیارو یەکێک لەئەکتەرو دەرهێنەرە بەتواناکانی شانۆی کوردی خاتوو "گەزیزە عومەر عەلی ئەمین"م بیربکەوێتەوە .

خاتوو گەزیزە؛ گوڵە گەزیزەی شانۆی کوردییە. کچی نووسەرو هونەرمەندی ناسراو کاکە "عومەر عەلی ئەمینە"، کە دەرکەوتن و پێشکەوتنی هەر لەمنداڵییەوە بۆ کۆشش و پەروەردەی باوکێکی عاشق بەشانۆو نواندن ئەگەڕێتەوە.

ڕۆژانە بەناو مۆسکۆدا ئەگەڕاین، هەموو شەقام و مەیدانە بەناوبانگەکان. پەیکەرە بەهەیبەتو سنگو ناوشان پان و دەم و چاو کەڵە بەرانەکەی "مایکۆفسکی" لە دوورەوە چاوت ئەقوزێتەوە .

مایکۆفسکی؛ ئەو شاعیرەی لەکاتی خۆیدا گەردەلوولێکی زمان و داهێنان بوو. گەنجێکی بەخۆو کەڵەگەت، قژی خاوی داکەوتووی بۆ سەر تەوێڵ. ئێمە هەر لەزووەوە، لە ڕێی زمانی عەرەبییەوە مایکۆفسکی و شیعری "مایکۆفسکی"مان خوێندبۆوە. لەدیوانی "من تینوێتیم بەگڕ ئەشکێ"دا، من بۆ خۆم شیعرێکم هەر بە ناوی "مایکۆفسکی"یەوە نووسیوە. شاعیری گەورەی تورک "نازم حیکمەت" لە مایکۆفسکی-یەوە هونەرەکانی نووسینی شیعری تازەو فۆرمی تازە فێربووە. پیاو کە پەیکەری بەشکۆی مایکۆفسکی ئەبینی، ناتوانێ سڵاوێکی لێنەکات و ماچێکیشی لەڕێی پەنجەکانەوە بۆ نەنێرێ. خۆشترین و جوانترین و بەئاپوورەترین مەیدان، ئەو گۆڕەپانە بەرفراوانە بوو، کە پەیکەرەی پۆشکینی لێبوو. من زۆر شەو ئەچووم و لەسەر سەکۆو کورسییەکانی ئەو باخچەیەی ئەوێ دائەنیشتم. مەیدانی عاشقان بوو، بەسەدان کیژو کوڕی گەنجی دڵدار لەبەردەمی پەیکەرەکەی "پۆشکین"دا دەست لەملان بوون. لەولایشەوە، بەدەیان پەیکەری مارکس و ئەنجلس و لینین بە تەنیا و گۆشەگیرو هەر خۆیان بوون!

ئاخر ناكرێ نەپرسین بۆچی؟! ڕەنگە وەڵامی هەرە سادە ئەوە بێت. ژیان گەورەترەو پیرۆزترە لەهەموو تیۆرەکان و شیعر و هونەریش پاکتر لەهەموو ئایدۆلۆجییەکانو بەردەوامیش شاعیرانو هونەرمەندان، دنیایان جوانکردووە، بەڵام خاوەن ئایدۆلۆجییە شمولییەکان ناشرینیان کردووە .

ئەو ڕۆژانەی لەمۆسکۆ بووم هەستمئەکرد خەڵکی سەرەڕای نەبوونی و هەژاری زەردەخەنەیەک لەچاویاندا ئەبریسکێتەوەو بەگەرمی ئەچن بەپیر ئەو ئازادییەوە، کە بۆ یەکەمجارە دوای حەفتاو سێ ساڵ ڕوویان تێئەکا. بۆ یەکەمجارە ئەتوانن بەدەنگی بەرز ڕەخنە لەڕژێمی تۆلیتاری سۆڤیەتی بگرن و بەدەنگ و ڕەنگ و بیروڕای جیاوازەوە سەرەتای سیستەمێکی نوێی دیموکراسی پیادە بکەن. برادەرەکانم ڕۆژانە سەردێڕی ڕۆژنامەکان و هەندێ هەواڵی گرنگیان بۆ ئەکردم بەکوردی. ڕۆژێکیان باسی ئەوەیان بۆ کردم، بەردەوام لێکۆڵینەوەی تازە بڵاو ئەبێتەوە دەربارەی ئەو ساڵانەی لینین حوکمی کردووە. گەڕاونەتەوە سەر بەکۆمەڵ کوشتنی خانەوادەی قەیسەر بەگەورەو بچووکەوە، بەژن و پیاوو منداڵەوە، ئەپرسن ئایا کوشتنی منداڵی قەیسەر بۆ؟! ئەی ئەوە لینین نەبووە کە فەرمانیداوە؟ !

تەنانەت هەندێ وتار بڵاوکرابوونەوە گومانی زۆریان لە دەوری "مەکسیم گۆرکی" کۆکردبۆوە، بەوەی، کە لەنزیکەوە ئاگای لەگرتنی کۆمەڵێ لاوبووە، کە لەکانی خۆیدا گیراون و بەڵام دوایی بێ سەرو شوێن کراون و ئەمیش بێدەنگ بووە!. هەموو شتێ لەهەژیندا بوو. هەموو ڕووداوێکی ڕابوردوو سەرلەنوێ کەوتبۆوە بەر لێپرسینەوە. بەرلەوەی سەفەری مۆسکۆ بکەم باسی ئەوەیان بۆ کردبووم کە "ئەندەر گراوند" یان میترۆی مۆسکۆ لە لەتونێل بانە هەرە جوانەکانی جیهانە. وەختێ چووینە خوارەوەو بینیم هەر وابوو. فەرشی عەردەکەی هەمووی هەر بەردی مەڕمەڕو دیوارەکانی بەهەمانشێوەو جگەلەوەیش لە هەر وێستگەیەک چاوت بەچەندین پەیکەری جۆراوجۆر ئەکەوت، هەر تەواو وەک ئەوەی لەموزەخانەیەکدا بیت وابوو. بەڵام ئەوەی تێبینم کرد قوڵایی تونێل بانی مۆسکۆ لەهەندێ شوێندا سێ ئەوەندەو چوار ئەوەندەی قوڵاییەکانی تونێل بانی ستۆکهۆڵمە. جاری وا هەیە لەدەدەقیقە زیاتر و تاچارەک هەر بەرەو خوار یان بەرەو ژوور ئەبیتەوە و ئینجا ئەگەیت. هەڵبەت بەدوو ئاڕاستە بۆ سەرەوەو بۆ خوارەوە پلیکانە کارەباییەکان دێن و ئەچن. من لە خوارەوە لەنێوان هەردوو ڕیزەکەدا، تەماشامکرد، ژنێک مێزێکی لەبەردەمدایە و

دانیشتووەو وەک لەئامادەباشایدا بێت وابوو، پرسیم ئەمە چییە؟ چونکە نە لەسوید و نە لە ئەوروپایش لە تونێل باندا دیمەنی وامنەدیبوو. وتیان (ئەمە کارەکەی ئەوەیە، ئەگەر ڕێکەوتی کرد کارەبا کوژایەوە یەکسەرو خێرا پەنجە ئەنێ بەدووگمەی ڕاگرتنی پلیکانەکاندا، کە ڕەنگە ڕێکەوتی وا لە دووساڵ سێ ساڵ جارێکیشدا ڕوونەدات، چونکە لەو حاڵەتەدا و لەو چەند چرکەیەدا ئەشێ لەئەنجامی کەوتن بەسەر یەک و خلبوونەوەدا ژمارەیەکی زۆر خەڵکی تیا بچن. هەروەها وتیان بەر لەدانانی ئەم چاودێرانە. جارێک ئەو کارەساتە ڕوویداوەو چەندین کەسی تێدا مردووە!).

هەر لەمۆسکۆ کاک "لەتیف"م ناسی، کە بە "باقی نازێ" ناسراوەو لەکۆلێجی ئادابی زانکۆی مۆسکۆ دەرچووەو کوردی کوردستانە گچکەکەی سوریایەو شاعیرەو ئەیشنووسێت و دووسێ چاپکراویشی هەبوو. ڕۆژێک بەیەکەوە چووینەوە بۆ شوقەکەیی و میوانداریەکی باشیکردم. باقی نازێ؛ هەندێ پرۆژەی ئەدەبی خۆیشی بۆ باسکردم، بەڵام ئیتر نازانم دواتر جێبەجێیکردوون یان نا؟!

لەدرێژەی گەڕان و گەشتەکەی "مۆسکۆ"دا ڕۆژێکیان بردمیان بۆ ئەو مۆزەیەی کە بەوێنەکێشان جەنگی (١٨١٢)ی نێوان ڕووسیاو فەرەنسای تێدا ئەبینی. هەمان ئەو جەنگەی، کە تۆلستۆی کردوێتی بەتەوەری سەرەکیی ڕۆمانی بەناوبانگی "جەنگ و ئاشتی". شوێنەکە ژێر قوببەیەکی گەورەیە. دیوارەکان بوونەتە تابلۆکان، وەختێ تەماشایان ئەکەیت هەست ئەکەیت بەوەی چوویتەوە یان گەڕاویتەوە بۆ ئەو زەمانەی وەختی هەڵگیرسانی جەنگەکە. سەرکردەکانی سوپا لەمەیدانی شەڕدا، تۆپخانەو جبەخانەی ئەوکاتە. سەربازەکان و بریندارەکانیان و کوژراوەکان. سروشتی دەوروبەر. ڕەوە ئەسپ و وڵاخی بەرزە. ئەو چەکانەی بەدەست جەنگاوەرانەوەن. قەمەکان. تۆپەکان لەوەختی تەقیندا. عەرەبانەکانی ناو مەیدانی جەنگ. پەڵە خوێنی ڕژاو. تێکڕژان و بەیەکدا چوونی کاتی شەڕی دەستەویەخە. ناپلیۆن لەبەرەی جەنگی خۆیدا، بەڵام چۆن کێشراون؟ !

تۆ؛ پێتوایە لەگەڵیاندایت و هەر ئەوە نییە بۆنی هەموو ئەو دیمەنانە نەکەیت، بۆنی دووکەڵی تۆپەکان. بۆنی خوێنی تازە ڕژاو. بەڕاستی لەم تابلۆیانەدا هونەر لەبەرزترین ئاستی بەرجەستەبووی خۆیدایەتی. ئەو توانا هونەرییانە هەر تەواو ئەبڵەق و سەرسامی بەردەمی ڕەنگ و هێڵ و سیمای خۆیانت ئەکەن. نازانی

چی بڵێیت! نازانی بە چ زمانێ ئەو سەرسامبوون و خۆشەویستییەی خۆت بۆ ئەم پانۆرامایە دەربڕیت. لە دڵی خۆمدا ئەموت: (تۆ بڵێی ڕۆژێ بێت، ئێمەیش لەکوردستاندا، هونەرمەندەکانمان، پانۆرامای هونەری لەم چەشنە بۆ داستانەکانی کۆن و نوێمان بکێشن و ئەو موزەخانانە بکەنە جێنزرگەی تەماشای هەزاران هەزار کەس لەم دنیایەدا، وەکوو چۆن لێرە کردوویانە؟!) .

بەڕاستی هونەر ئەتوانێ مێژووی ڕابوردوو وەک خۆی زیندوو بکاتەوە. ئەتوانێ جارێکی دی زەمان بگەڕێنێتەوە. کۆتایی بە "بیرچوونەوە" بێنێ. لەنێو هەموو هونەرەکاندا، هونەری شێوەکارییە ئەتوانێ لەڕێی وێناکردنەوە بمانخاتەوە هەر زەمانێ، چەندیشی بەسەردا تێپەڕیبێ بۆ ئەوەی دیسانەوە ئەو چاوانەمان پێبداتەوە، کە زمان لەگەڵ خۆیدا بردبوونی، بەڵام ئەم جارێکی تر پێمان ئەبەخشێتەوە. وێنە بەبێ بینین بوونی نییە! بەڵام لەگەڵ بینیندا ئەبێت هەست و نەستیش بزوێت. ئەم هونەرە یەکەم دوژمنی "کوێرێتیە". چونکە کە ئەو هات ئەم بزر ئەبێ. ئەو ئاین و ئاینزاو نەریتانەی وێنەیان قەدەغەکردووە ترساون لەوەی وێنەکان زەفەر بەنهێنییەکانیان بەرێ و بیانخاتە بەرچاوو لەو مەسەلە تەقدیسکراوانە کەمبکاتەوە، کە بەردوام لەو دیوو پەردەی نەبینینەوە خۆیان حەشارداوە.

بیرمانکردەوە لەوەی لە مۆسکۆ کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە بۆ کوردەکان بگێڕین. ئەگەرچی کوردی باشوور لەوێ کەمبوون و بە پەنجەی دەست ئەژمێردران، بەڵام هەر چۆنێکم لێکدایەوە گرتنەکەی باشتر بوو لە نەگرتنی. کاک شۆڕش و برادەرەکان تێکەوتن و هۆڵێکیان لە زانکۆی "لۆمۆمبا"گرت. ڕۆژی کۆڕەکە من پێشوەخت چووم. هەندێ لەو خوێندکارانەی لەوێ ئەیانخوێند منیان بینی و داوایان لێکردم تا ئەو کاتەی کۆبوونەوەکە ئەبێت لای ئەوان دانیشم. دیاربوو ئەوان لەبەشی ناوخۆی زانکۆکە ئەژیان. ئێمە لە دەمێکەوە لە ڕێی ڕادیۆی "مۆسکۆ"وە ناوی زانکۆی لۆمۆمبامان بیستبوو .

بەهەرحاڵ چووم، بۆ ژووری یەکێک لەو خوێندکارانە. دوو ڕیز ژووربوون و داڵانێکی درێژ لەنێوانیاندا بوو، بەڵام نە لەسلێمانی و نە لەبەغدا و نە لەهیچ شوێنێ بەشی ناوخۆی وایەڕپووت و پیس و پۆخڵم نەدیبوو! سێ قەرەوێڵە لەژوورێکدا بوو. ژوورەکە کۆن و پەڵەی شێداری بەدیوارەکانەوەو ئەمانیش پەنجەرەکەیان بە بەتانی و کارتۆن گرتبوو، دەرکی ژوورەکە شەق و شڕ، پێموتن: (ئەمەیە زانکۆی لۆمۆمبا و ئەو هەموو پڕوپاگەندەیەی بۆیەکرا؟!).

لەسەر لێواری یەکێک لە قەرەوێڵەکان دانیشتبووم، بیرمئەکردەوە: (ئەم وڵاتە دزو درۆزن بردویتی بەڕێوە، ئەگینا ئەمە چ ژیانێکەو ئەم خوێندکارانە چۆن ئەتوانن لێرەدا بژین. وەختێکیش هەستام و چووم بۆ توالێتەکەیان بەسەر پیساییدا هەنگاوم هەڵئەهێناو ئەبوو بزانی چۆن ئەچیتە ناوەوەو دێیتە دەرەوە بۆ ئەوەی پیس نەبیت. بەلاێ من لەو بەشە ناوخۆییەی زانکۆی لۆمۆمبا ئەو دیمەنە قێزەونانەم بەرچاو کەوت. سەرکردایەتی سیاسی حزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بەتەنها بۆ خۆیان ژیاون، کۆمەڵێ مافیا بوون بەجۆرێکی تر، ڕژێمی پڕوپاگەندەو دروشمی زەق زەق بوون و هیچی تر. لەگەورەترین زانکۆیاندا بەتانی بەپەنجەرەدا داکوترابێ و بەکارتۆن کون و کەلەبەر گیرابێ و دیواری ژوور پەڵەی شێداری لێیدابێ و توالێتیشیان بترشێنیتەوە! ئەبێ ئیتر ئەمە چ سیستەمێ بێت بۆ ئەوەی مرۆڤ تێیدا بەختیار و ئاسوودەبێ! هەروەکوو دواییش پێیانوتم حکومەتی ئیشتراکی سۆڤیەتی هەرکاتێ شاندی وڵاتانی تر ڕوویاتێکردبێ، ڕەسمی و نارەسمی، خۆیان بەرنامەیان بۆ داناون بۆ کوێیان بەرن یان نەیانبەن. بۆ ئەم مەبەستەو بۆ پڕوپاگەندە هەمیشە ئەو میوانداری کردووە. ئێمەیش ڕۆژێ سەردانی ئەو ئوتێل و بازاڕەمانکرد. بەڕاستی هەر لەوێ هەستت ئەکرد بەوەی لەئەوروپادایت. چیت بویستایە، هەموو شتێک، جگە لە پاک و خاوێنی و خزمەتی باش و خواردن و خواردنەوەی باش .

هۆڵەکە بەرامبەر ئەو بەشەناوخۆییە بوو کە باسمکرد. لەکاتی خۆیدا لەگەڵ ئەو چەند خوێندکارەدا هەستاین و چووین. هۆڵێکی مام ناوەندی بوو. هەر ئەوەندەی سێ سەد کەسێ بگرێ یان نەیگرێ، نزیکەی حەفتا هەشتا کوردێک هاتبوون، بەشی زۆریان کوردەکانی ئەرمینیا و جۆرجیا بوون، کە لە مۆسکۆ ئەژیان. هەروەها بەشێکی لەبەر چاوی تر ئەو خوێندکارە کوردانە بوون کە لەسوریاوە هاتبوون بۆ خوێندن، لەم زانکۆیە یان لە زانکۆکانی تر. کۆڕەکەم سەعاتێک زیاتری خایاند. بەڵام لەدواییدا بەشێک لەو قوتابیانە داوایانکرد کە هەندێ لەو شیعرانە بەعەرەبی بخوێنمەوە. دوو ساڵ ئەبوو "دار الاهالی" لەشام دیوانی "مرایا صغیرە"ی دەرکردبوو، هەر لەو کورتە شیعرانەش دە دوانزە شیعرێکم بە عەرەبی بۆ خوێندنەوەو کۆڕەکەمان کۆتایی پێهات.!

کاکە "عەبدوڵڵا پەشێو"ی شاعیر و هاوڕێم، ئەویش لەوکاتەدا لەمۆسکۆ بوو. حەڤدە ساڵ زیاتر بوو یەکترمان نەدیبوو. دوایئەوەی پەیوەندیم پێوەکرد، ڕۆژێکمان دانا بۆ ئەوەی چاومان بەیەکتر بکەوێ. بیرمە بەردەمی تونێل

بانێکماندانا بۆ ئەم بەیەکگەیشتنەوەیە. برادەرەکانم تائەو شوێنە بردمیان و لەکاتی خۆیدا پەشێو دەرکەوت و باوەشمان بەیەکتردا کرد. بە دوو قۆڵی ڕۆیشتین، پەشێو نامەی دکتۆراکەی لەسەر "پیرەمێرد"ی شاعیر نووسیوە. پێشتریش پێیان وتبووم، کە زمانە ڕووسییەکەی زۆر باشە. هەر لەو دیدارەدا خۆیشی باسی ئەوەیکرد کە بەشێکی زۆری شیعرەکانی "پۆشکین"ی کردووە بە کوردی. ئەوەی بەلامەوە سەیرە بۆچی تا ئێستا ئەو شیعرانەی چاپنەکردووە؟!. پەشێویش هەندێ شوێنی تازەی نیشاندام. بەیەکیشەوە چووینەوە بۆ ماڵەکەی. وەک بێتەوە بیرم لە مۆسکۆوە دووربوو. ئەو کاتە خۆی بەتەنیا ئەژیا، ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم، پێموایە ئەو ڕۆژانە هاوسەرەکەی سەفەریکردبوو. بە هەرحاڵ پەشێو خۆی خواردنێکی ڕووسیانەی ئامادەکرد. هەواڵی بەرهەمی تازەیم لێپرسی و وتی: (شتێ کۆبۆتەوەو بەنیازە بیکا بەدیوانێکی تازە). جارێکیتر گەڕاینەوە بۆ ناو مۆسکۆو پیاسەکردن. لە شوێنێکدا ڕیزێکی دوورودرێژمان بینی و ئێمەیش چووین ڕیزبووین. پرسیم ئەمە چییە؟! وتی: (کاکە ئەم ڕیزە دوورودرێژەی تۆ ئەیبینی بۆ دۆندرمە خواردنە، وا ئێمەیش ڕاوەستاوین بۆ ئەوەی بزانین کەی بەرمان ئەکەوێ!). ماوەیەکی درێژی خایاند تاچووینە ناو دوکانێکەوەو سەرکەوتینە قاتی سەرەوە. هەر چوار پێنج مێزێک بوو. چووین دانیشتین و دۆندرمە هات و لەڕاستیدا ئەوەیش نەبوو یان نەی ئەهێنا بۆی بچیتە ئەم ڕیزە دوورودرێژەوە. پەشێو وتی: (ئەمە حاڵی ئەم خەڵکەی ئێرەیە!) بۆ ئێوارەیش پەشێو وتی ئەچینە شوێنێکی خۆش .

ساختمانێکی گەورەبوو. چێشتخانەو لەهەمانکاتیشدا بەرنامەی سەماو گۆرانی و نمایشی هەمە ڕەنگیان هەبوو. پەشێو وتی: (ئێستە ئەچین ئەڵێن بلیت نەماوە، دوایی ئەبێ لەژێرەوە شتێکیان بدەمێ بۆ ئەوەی بلیتمان بدەنێ). هەروایش بوو هەتا بەرتیلەکەی نەدا، دەرگایان بۆ نەکردینەوە. هەر لێرەدابوو پەشێو گێڕایەوە وتی: (ماوەیەک لەوەوبەر کاک "ئەحمەد دڵزار"ی شاعیر هاتبوو بۆ ئێرەو ئەویشم هێنا بۆ ئەم شوێنە و بەهەمانشێوە چووینە ژوورەوە. سەیر ئەوەبوو، کە بەکاک دڵزارم وت: ئەوە ئەبێ بەرتیل بدەم ئینجا ئەمانکەنە ژوورەوە، بڕوای نەئەکردو ئەیوت کاکە توخوا قسەی وامەکە، چۆن بەرتیلخۆر لە مۆسکۆدا هەیە! وتم کاکە فەرموو ئەوەتا لەبەرچاوی خۆت بەرتیلەکەم دانێ، کەچی کاک ئەحمەد دڵزار هەر ئەیوت: (نا، نا، بەرتیل وەرگرتن چۆن لێرە هەیە!)

چووینه قاتی سەرەوە. شوێنێکی فراوان و دڵگیربوو. لەوێش بەرتیلێکی بچووکی دیکەیدا، تامێزێکی تۆزێ باشیان داینێ. بە پەشێوم وت: (لەوانەیە بۆ هەوا وەرگرتنیش باجێکیان دانابێ!). بەرنامەکە ناخۆش نەبوو وەک وتم: (نمایشی هەمەڕەنگ بوو). لە دواییشدا کە داوای نانمان کرد. خزمەتچییەکە وتی: (وەڵلا هەموو خواردنەکان لەلایەن ئەندامانی پەرلەمانەوە حیجزکراون). باوکتان چاک دایکتان چاک!. بەهەرحاڵ پەشێو دیسانەوە بەرتیلێکی تریشدا تاخواردنیان بۆ هێنایین! باشە ئەم سیستەمە لەماوەی حەفتا و سێ ساڵدا چیکردووە؟! چۆن خەڵکی پەروەردە کردووە؟! ئەی باشە ئەم ئایدیۆلۆجییایە؟! ئەم مارکسییە لینینیەتە چ بەرنامەیەکی هەبووە بۆ فێرکردن و جیاوازی ئەوو سیستەمی قەیسەری چی بووە؟! ئەی ئەو هەمو هەراو زەنایەی "خرۆشۆف" لەکۆنگرەی بیستدا کردی بۆ گۆڕان چی بەسەرهات؟! ئەم برسێتییە چییە؟! پێئەچێ ئیشتراکییەت دابەشکردنی هەژاری و کڵۆلی بێ بەشێوەیەکی یەکسان بەسەر ئەو خەڵکەدا، نە ئازادی و دیموکراتی و نەنانیش، ئەی باشە ئیتر ژیان چی تیا ئەمێنێتەوە؟! بەڵێ هەر دروشم بەبریق و باق و پروپاگەندەی تیا ئەمێنێتەوە!. لەدڵی خۆمدا ئەموت: (سۆڤیەت یەکێک بوو لە دوو زلهێزەکەی دنیا، ئەوان بوون یەکەم مرۆڤیان نارده دەرەوەی گۆی زەوی. بەڵام ئەم پێشکەوتنە زانیاریانە چین، ئەگەر تۆ میللەتەکەت تێر بەسکی خۆی نەیبێ نان بخوات؟!. جارێکیان "د. مۆفەق دەرگەڵەیی"، کە لەوێ خوێندنی باڵای تەواوکردووەو ژنەکەیشی خەڵکی ئەو وڵاتەیە، بۆیگێڕامەوە وتی: (خەزورم هەموو بەیانییەک کە چووە بۆ کار یان گەڕاوەتەوە بە بەردەمی کۆگایەکدا تێپەڕیوەو لەودیو جامخانەکەوە قاپێ بادەی جوانی بینیوە، وەک ئەوەی بە مەبەستی ڕیکلامێ بۆ ئەو بادەیە لەوێدا دانرابێ. ئەیوت: خەزورم وتویەتی: یەکێک لە ئاواتەکانم لەژیاندا ئەوەبووە ڕۆژێ لەڕۆژان ئەوەندەم هەبێ و بتوانم ئەو قاپە بادەیە بکڕم.!

لەلاپەڕەکانی پێشووتردا پرسیبووم: باشە ئەو دەستە نووسەرو ئەدیبانەی کە لەوێ خوێندنیان تەواوکردو نامەی دکتۆرایان لەبوارە جیاجیاکانی مێژوو و زانست و ئەدەبدا وەرگرت. چەندین ساڵ لەو وڵاتەدا ژیاون. تێکەڵی خەڵک بوون. بەچاوی خۆیان شتی جوان و ناشیرینیان بینیوە. ئاگایان لە خەون و ئاوات و خۆزگەی خەڵکی ئەوێ بووە. ئاگایان لەوە بووە، کە لەسایەی ئەو حوکمەدا شتێک نەبووە پێی بوترێ دیموکراسی و فرە لایەنی و فرە دەنگی. حوکمی موتڵەقی یەک حزبیان بینیوە. بێگومان ئاگایان لە هەموو گەندەڵییەکی

ئەو ژیانە بووە. زانیویانە ئەو پروپاگەندانە چەند درۆی گەورە بوون. ئەی باشە بۆچی ئەو ڕاستییانەیان لەنەوەی ئێمە ئەشاردەوەو باسیان نەئەکرد؟. تەنانەت دوای هەرەسی یەکێتی سۆڤیەتیش هیچیان نەوت.

ئەو برادەرانەی لەمۆسکۆ لەگەڵ مندابوون، سەروساختیان ئەوەندە لەگەڵ شیعرو ئەدەبدا نەبوو. من ئەمویست بزانم ئەدەبی ڕووسی لەم قۆناغەیدا شاعیرو ڕۆماننووس و هونەرمەندی گەورەی کێن؟! چونکە بەڕاستی زانیاری ئێمە هەر ئەوەبوو کە لەڕێی زمانی عەرەبییەوە پێمان ئەگەیشتن. لەشیعردا بۆ نموونە لەدوای "ئیفتۆشینکۆ"و لە ڕۆماندا لەدوای "ئیتماتوف"ەوە ئیتر کەسیترمان نەئەناسی. لە دانیشتنێکدا دووسێ ڕووسمان لەگەڵدا بوون. ئەوان باسی ڕۆماننوسێکی گەورەی ئەو سەردەمەیان ئەکرد کە ناوی "ڕاسپۆتین"ە. باسی چەندین شاعیری هەڵکەوتووی تریان ئەکرد، کە من بۆ خۆم ناویانم نەبیستبوو. دیارە ئەو ناوانە بەرهەمی لەبەرچاویشیان نەکراون بە عەرەبی، ئەگینا شتێکمان هەر بەرچاو ئەکەوت، یان ناویانمان بەرگوێ ئەکەوت. گومان لەوەدا نییە کە ڕووسیا بەردەوام وڵاتی ئەفراندنی ئەدەبی و کانزایەکی داهێنان بووەو ناکرێ کەمتازۆر نەوەی تازەی هەڵکەوتووی شیعر و ڕۆمان و چیرۆکی لێبڕێ!. ئەوەی ئێمەومانان ئەیزانین هەر ئەو زانیارییە سنووردارانەیە، کە لە وەرگێڕانی عەرەبییەوە گەیشتۆتە لامان و ئەمەیش نەک هەر بەس نییە بۆ ئەوەی ئاگات لەبزووتنەوەی ئەدەبی وڵاتێکی وا گەورە بێت بەڵکوو ئەیشمانخاتە ناو بازنەی نەزانین و "جەهل"یشەوەو ناتوانین هیچ قسەیەکی ڕاست و دروستی دەربارە بکەین !.

لە مۆسکۆیش؛ گۆڤاری چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا کردم. وابزانم کاک شۆڕشم لەگەڵدا بوو. لەدوای کۆتاییهێنان بە شەڕی ئێران – عێراق. دوایئەوەی نزیکەی یەک ملیۆن ئینسان لەهەردوو وڵاتەکەدا بوون بەسوتماکی جەنگێکی بێماناو جێی گەمەی پیرەمێردێکی زۆردارو خەڵەفاو و دیکتاتۆرێکی ملهووڕو بنەمای ئابووری بەتایبەتی لەعێراقدا، تووشی داتەپین و داڕزین هات و شیرازەکانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و ژیان بەگشتی لەبەریەک هەڵوەشان و برسێتی و نەبوونی ڕوویانکردە خەڵکی. من بۆ خۆم وامئەزانی ئەبێ ئیتر دیکتاتۆر پەندێکی گەورە لەو جەنگە وەرگرێ و بەخۆیدا بچێتەوە. بەڵام بەپێچەوانەوە لەخۆبایی بوونی دیکتاتۆر زیاتر بوو. ئەو خۆی بەسەرکەوتوو ئەزانی، ئەمە لەکاتێکدا، کەسیان سەرکەوتوو نەبوون، ئەویان ڕاگرتنی جەنگی بەژەهرخواردنەوەو

ئەمیشیان خۆی بەپاڵەوانی براوە لەقەڵەم ئەدا. پشیلە گوربەکەی عێراق مرخی لەگۆشتی کویت خۆشکردبوو. کەوتە خولخواردن بەدەوریا. کەم کەس هەبوون پێشبینی ئەوە بکەن سەدام پەلاماری کویت بدات. چونکە دوای شەڕێکی هەشت ساڵەیماڵوێرانکەر، ئەمە نەئەچۆوە عەقڵەوە. ئەوەی ڕاستیبێ مام جەلال ڕەنگە تەنها سیاسەتمەدار بووبێ کە ئەم پێشبینییەی کردوو هەروایش دەرچوو. لە(١٩٩٠/٨/٢)دا سەدام پەلاماری کویتی داو داگیریکرد. تا ئەوکاتە کویتییەکان، هەر پشت و پەناو خەزنەیەک بوون بۆ سەدام. هەندێ لەشاعیر و نووسەرەکانیان لەمیهرەجانەکانی مەدرید و بەردەم سەدام خۆیدا بوو، کە سەماکەرە بوون، ڕەنگە باشترین نموونەیان ژنە شاعیرە کویتییەکە بووبێ. بەڵام وا ئێستە سەدام وەک دوژمنێکی خوێنە خۆی (ئەمی عەرەبی برا)، لمۆزی ژەنیوەتە خوێنی ئەوان و هەڵیانئەدڕێ.

سوپاکەی سەدام ماڵ بەماڵ و بانق بەبانق و گەنجینە لەدوای گەنجیە تاڵانیان ئەکات و نامووسیان ئەتک ئەکات و هەموویشی بۆ ئەلوێ. کویتییەکان لەخەوی غەفڵەتا بوون و وەختێ خەبەریان بۆوە سەدام بەسەر سەریانەوە وەستاوەو پێیان ئەڵێ: (ڕووت بنەوە!). ئینجا ئیتر کویتیەکان تێگەیشتن چەند گەوج و نەفام بوون. تێگەیشتن چەند بێئاگابوون لەنییەتی سەدام و چەند خۆشباوەڕی بەردەمی گورگێکی برسی بوون. لەگەڵ ئەم داگیرکردنەیشدا دنیایش هەژا. سەدام لەپۆپەی لەخۆبایی بووندا بوو. نەگوێی بەدنیا ئەداو نە بەکۆمەڵی نەتەوە یەککگرتووەکان و نە بەیاسای نێودەوڵەتی و نە بەهیچ. داڵەکە بەسەر لاکەکەوە نیشتبۆوە. داڵ خەریکی لەت و پەتکردنی نێچیرە قەڵەوەکەی خۆی بوو، لەبەرئەوە هیچی نەئەبیست.

**شاعیره گەنجەکان؛**

**تەنها خاوەنی ناوی خۆیان‌و شیعرەکانیانن!**

لەو ڕۆژانەدا من لەستۆکهۆڵم بووم. ئەوەندە نەبوو، سەرەتایەکی کەمم لە "دەربەندی پەپوولە" نووسیبوو، بەڵام هێشتا نەچووبوومە ناو نێرینەی ڕووبارەکەوەو هەر لەتەنکە بواردا بووم. یان هێشتا سەری داوە شیعرییەکانم نەدۆزیبۆوە. لەبەرە ژانەکاندا بووم. "دایکم و ژیان" دەمێک بوو حەزیان ئەکرد سەردانێکی ئەمریکا بکەم و ماوەیەک لایان بمێنمەوە. بۆ خۆیشم سەفەری وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکام بەلاوە گرنگ بوو، بۆیە لەدواییدا بڕیارمدا ئەو سەفەرە بکەم .

کاک "کامەران جەلال"ی خزمی دایکم، لە دەمێکەوە هاتبۆوە وڵاتی سوید، جگە لەزمانی سویدی، زمانی ئینگلیزیشی زۆر باش بوو. کامەران لەدەرچووانی کۆلێجی ئەندازیاری بوو. بەڵام لەوکاتەوە هاتبووە سوید کاری شۆفێری تاکسی لەناو ستۆکهۆڵمدا ئەکرد. دەستکەوت و باری ژیانی ئابووری باشبوو. ڕێککەوتین پێکەوە ئەو سەفەرە بکەین. لەو سەردەمەدا جگە لە"ژیان و دایکم". "کاوەو کامەران"ی برایشم هەر لە ئەمریکا بوون و ئیشی خۆیان هەبوو. هەروەها کاک "عومەر هەڵمەت"ی باوکیشیان هەر لەوێ بوو. دەرفەتێکی باش بوو، بۆ ئەوەی هەر هەموویان ببینم. ئەمە جگە لەچەندین هاوڕێ و دۆست و ناسیاوی تر کە پەڕیبوونە ئەو وڵاتەو لەوێ گیرسابوونەوە، بەدیداریان

شادببمەوە، هەروەها دووسێ کۆڕی شیعر خوێندنەوەیش لەویلایەتە جیاجیاکان بۆ کوردە ئاوارەکان بگرم، بەتایبەتی، کە لەو کاتەدا ژمارەیان لەئەمریکا ڕوو لەزیاد بوون بوو. خۆمان ئامادەکردوو لەخەتی هەوایی ئیسلەندی بلیتەکانمان بڕی و لەوەختی دیاریکراودا چووین بۆ فڕۆکەخانەی ئارلەندە و سواربووین و لەماوەی چەند دەقیقەیەکدا خۆمان لەقولایی ئاسماندا بینییەوە.

بەر لەوەی سەفەر بکەم، دووسێ مانگێک بوو بەیارمەتی دەزگای کەلتووری سویدی، بەرگی یەکەمی سەرجەمی شیعرەکانم "دیوانی شێرکۆ بێکەس" چاپکرابوو. کاری تایپیستی دیوانەکە هەر لەسوید کاک "ئەحمەد سەعید" کردبووی، بەلام لەبەرئەوەی چاپکردنی لەستۆکهۆڵم پارەیەکی ئێجگار زۆری ئەویست، بۆیە لەڕێی هەندێ هاوڕێ و دۆستەوە دیوانەکەمان نارد بۆ پۆڵۆنیا، چونکە نیوەی ئەوەی تێئەچوو کە لەسوید پێیانوتبووین. دۆستێکمان زۆر دڵسۆزانە سەرپەرشتی چاپکردنەکەی کردبوو، بەدەستییەوە ماندوو بووبوو. دیوانەکە نزیکەی هەزار لاپەڕەیەکی قەوارە مامناوەندی دەرچووبوو. دوای ماوەیەک چاوەڕوانی، هەزار دانەی بەجزوبەندکراوی گەیشتنەوە سویدو لەڕێی پۆستەوە وەرمانگرتن. بەرگی یەکەمی سەرجەمی ئەم شیعرانە بریتیبوون لەم بەشانە "١- دەفتەری گەشت و خۆشەویستیی، ٢- دەفتەری گۆرانییە غەمگینەکان، ٣- دەفتەری سۆزو سووتانی گیان، ئەم بەشانە پێشتر نەبووبوون بەدیوان، ٤-داستانی هەڵۆی سوور، ٥- کەشکۆڵی پێشمەرگە، ٦- ئاوێنە بچکۆلەکان، ٧- شایی شەهید، ٨- تەمتوومان". ئەم بەشانەی دواییش پێشتر هەندێ قەسیدەیان لەشاخ بووبوون بەدیوان و دواتر ئاڵوگۆڕیان بەسەردا هاتبوو، لێیان زیادکرابوو. بەتایبەتی دیوانی ئاوێنە بچکۆلەکان. بۆ سەفەری ئەمریکایش بیست دانەم لەگەڵ خۆمدا برد بوو، هەم بۆ دیاری و هەم بۆ فرۆشتن.

ڕێگەی ئاسمانیی نێوان سوید و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بالاتیمۆر ڕێگەیەکی دووردرێژە، نزیکەی نۆ سەعاتێک ئەخایەنێ، ئەو ماوەیە ئەگەر بۆ کەسانی تر ئاسایی بن، بۆ من وانییە، ئەویش لەبەرئەوەی جگەرەکێشان قەدەغەیە .

من؛ تا دوو سەعات و سێ سەعات ئەگەر بێتاقەتیش بم خۆم ئەگرم، بەلام لەوە بترازێ هەر تەواو بێتاقەت ئەبم. بەڵام چاریش نییە. جارانی زووتر وانەبوو، لەناو هەموو فڕۆکەیەکدا دە دوانزە کورسییەک لەدواوە بۆ ئەوانەی

جگەرەکێشبوون تەرخانکرابوون. کە ئەچوویت بلیەتەکەت ببڕیت لێی ئەپرسیت: (جگەرە کێشی؟!) وەختێ ئەتوت: (بەڵێ). ئیتر ئەو لەشوێنی جگەرەکێشاندا دایئەنایت. ئەوانەی ئەم دێڕانە ئەخوێننەوەو خۆیان جگەرە ناکێشن، ئەشێ ئەم قسانەی منیان بەلاوە سەیر بێ! بەلام ئەم بڕیاری بەتەواوی قەدەغەکردنەی جگەرەکێشان لەفڕۆکەدا، یان لە هەر شوێنێکی تردا، غەدرەو لەجگەرەکێش ئەکرێ! من دڵنیام ئەوانەی ئەم بڕیارانە دەرئەکەن کەسیان جگەرەکێش نین. پێویستیش ناکات باس لەزیانەکانی جگەرە بکەین، ئێوە بچن لەو دکتۆرانە بپرسن کە ئەو زیانانە لە هەموومان باشتر ئەزانن و بەلام تیایاندایە لەمنیش زیاتر جگەرە ئەکێشێ! بەهەرحاڵ لەم سەفەرە دووروودرێژانەدا ئەوە یەکێکە لەو گیروگرفتانەی تووشی ئەبم. بەلام وەک وتم جاریش نییە، ئیتر بەبنێشت جوون بێ یان بادە خواردنەوە ئەیبەمە سەر .

نوکتەیەک هەیە ئەڵێت یەکێک وتوویەتی: (ئینجا تەرککردنی جگەرە چییە، من تائێستا هەزار جار تەرکم کردووە!، پێموایە ئەو یەکەیش منم!).

دوای سێ سەعات فڕین گەیشتینە فڕۆکەخانەی ئیسلەندەو نیشتینەوە. فڕۆکەکە یەک سەعات ئەمێنێتەوە، چ بۆ ئەوانەی لێرە دائەبەزن و چ بۆ ئەوانەی لێرە سەرئەکەون. هەروەها بۆ ئەوەی بەنزین بۆ درێژەی گەشتەکە تا بالاتیمۆر وەربگرێ. فریای دوو سێ قاوەو چەند جگەرەیەک ئەکەوین. خولیای تەواوکردنی 'دەربەندی پەپوولە'یش تا ئەهات شپرزەتری ئەکردم، ئەوەی تا ئەوکاتە لێم نووسیبوو، بیست لاپەڕەیەک ئەبوو، هێشتا لەسەرەتای ڕێگایەکی دوورودرێژدا بووم، هەر تەواو وەک ئەم سەفەرەم .

هەموو شەو لەگەڵ (نالی)دا قسەم ئەکردو پێکەوە دائەنیشتین باس هەر باسی ئاوارەیی و دەربەدەری بوو. ئەو کاتەی لەناو فڕۆکەکەیشدا 'کامەران' بێدەنگ بوایە، یان بەنیازی سەرخەوشکاندنێ چاوی بنوقاندایە. من ئەچوومەوە ناو دەربەندەکەی خۆم و بە پەپوولەکان خۆم دائەپۆشی و لەگەڵ ئەو وێنانەدا، کە هێشتا نەچووبوونە سەر کاغەزو لەدایک نەبووبوون لەپشت توێژاڵێ لەتەم و مژو زمانی نادیارەوە، سەرە تاتێکمان لەتەک یەکتردا ئەکرد. ئەهاتن و لەپڕیش لێم بزر ئەبوون. نزیک ئەکەوتنەوە بەئەندازەیەک نزیک ئەکەوتنەوە هەر ئەوە نەبوو بەدەست نەیانگرم. کەچی وەک تیشکێکی خێرا دەرباز ئەبوون. شیعر: دۆزینەوەی دنیا نادیارەکانی ناو زمانە، ڕۆچوو بەناو وشەدا. هەوێنگرتنی

خەیاڵە. عەشقێکە لەسووتاندا و تۆیش وەک باڵندەیەک بەرەو رووی ئەچی. رەنگە هەر لەیەکەم دیداردا بسووتێت!. چەندین جار پەروباڵت هەڵوەرێن.. شیعرنووسین ژان نووسینە. یان ئەو مەراقەیە بەردەوام هێلانەو پەناگەیی ئارام و داسەکنین تێکئەدات و کاری بەیەقین نییە و هاورێی گومانە. چۆن ئازار خەو لەچاوت ئەتەزێنی و ناهێڵی بنویت، شیعریش وەختێ دەستئەکات بەخۆهەڵپێچان و دروستکردنی قۆزاخەکانی، ئیتر بەرت ناداو ناهێڵی بسرەویت. شیعر و شپرزەیی، کە تێکەڵی یەکتری بوون ئینجا خەیاڵ لرفە ئەکات. شیعر ئەبێ داگیرت بکات ئینجا ئازادی .

"دەربەندی پەپوولە"، هەڵگەڕانەودو یاخیی بوونێ بوو لەمنی ڕابووردو. لەزمان و بینینم. کۆدەتایەک بوو، هەر خۆم دژی خۆم بەرپامکرد. شیعر هەڵکەندنی بەردەوامە لەناو زماندا. یان هەندێجار هەڵزنانی سیزیفانەیە. شیعرنووسین کارکردنە لەناو جوگرافیا نەبینراوەکانی وێنەو تێڕامانە لەناو دڵی گێژەنەکاندا. من بە ئەزموونی خۆم لەوە گەیشتووم ئەو شیعرەی مەراقی گەورەی لەپشتەوەیە، هەمیشە داهێنانی گەورەیشی لەپێشەوەیە. شیعر هەیە خۆشییەکەی هەر ئەوەندەی خۆشی تامی چوکلێتێکە و بەسەر ئەچێ. بەڵام شیعری سنەوبەر ئاسایش هەیە، کە لەهەموو وەرزەکاندا هەر سەوز ئەکاتەوە. من؛ ئەو شیعرەی لەکاتی نووسینیدا گریاندوومی و فرمێسکەکانم تێکەڵی وشەکانی بوون، لەدواییدا وەختێ بڵاوبۆتەوە بووە بەگوڵی زەردەخەنەی ئەو خوێنەرەی، کە لەگەڵ خۆیدا سەرسامی و خۆشەویستیی بۆ هێناوم!

لەئایسلەندەوە بۆ فڕۆکەخانەی باڵتیمۆر، شەش سەعات فڕینەو هەموویشی هەر بەسەر ئۆقیانوسی ئەتڵەسیدا، سەردوەت ئاسمانێکی بێکۆتایی و خوارەوەت ئۆقیانووسێکی ترسناک. لەگەڵ "کامەران"دا لەدەرگای گەلێ باس و خواسمانداو بەڵام ڕێگە هەر نەئەبڕایەوە. سواربوونی فڕۆکەیش بەتایبەتی لەسەفەری وا دورودرێژدا سەرچڵی ئەوێت. ئەو کاتەی سواری فڕۆکە ئەبیت، فڕۆکەوان داوا ئەکات خۆت بیبەستیتەوە، ئەوکاتەی دائەبەزیت و فڕۆکە ئەنیشیتەوە خۆت ئەکەیتەوە، بەڵام ئەوە یەکەمجار بوو لەبەرزی هەزاران پێیەوە گوێم لەفڕۆکەوان بێت داوای خۆبەستنەوە بکات!. ئەمە چییە؟! ترس دایگرتین، کامەران ناچاربوو لەکەیبانوویەکی ناو فڕۆکەکە بپرسی: (ئەمە چییە؟!) ئەویش بەدەم زەردەخەنەیەکەوە وتی: (ئێستە تووشی هەندێ تاسەی هەوایی ئەبین، بەڵام زۆر ناخایەنێ). کامەران لێی پرسییەوە: (ئاساییە؟!) ئەویش وەڵامی دایەوە:

(ئاساییەو ئێمە لە هەموو گەشتێکدا بۆ ئەمریکا تووشی ئەم هەڵچوون و داچوونانە ئەبین، بەتایبەتی ئەو ڕۆژانەی وەرزێک بەسەر ئەچێ و وەرزێکی تر دێت و ئاووهەوا ئەگۆڕدرێت زیاتر ئەبن). باش بوو، ئاهێکمان بەبەردا هاتەوە، هەر ئێمە نەترساین، چاومان لێبوو بەشێکی زۆری سەرنشینانی ناو فڕۆکەکەیش هەروا شپرزەو بێ ئارام بووبوون.

لەحەفتاکاندا دایکم بەبانگهێشتی کاوەو کامەران دووجار سەفەری ئەمریکای کردبوو. هەرجارەی لەدووسێ مانگ کەمتر نەمابۆوە، وا ئێستەیش بە ئێجگاری ساڵ زیاترە لەوێیە. دایکم هەر جارێ باسی ئەمریکای بکردایە، خۆزگەی بەوە ئەخواست جارێکی ترش بچێتەوە. بەهەموو شتێکی ئەمریکا سەرسام بوو، لەشەقام و بازاڕەوە بۆ خەستەخانەو بۆ دکتۆرەکانی و بۆ ماڵ و کەرەستەی ناو ماڵ و هەموو شتێ. گاڵتەی بەوڵاتەکانی تر ئەکرد و ئەیوت: (ئەو وڵاتانە هەق نییە بین بەکارەکەری ئەمریکایش) یان خۆی وتەنی: (عەمرم نەمێنێ، ئەمریکایش وڵاتەو ئەمانەیش هەر وڵاتیان پێ ئەوترێ!) .

هەر جارێکیش کارەبا بکوژایەتەوە یەکسەر ئەیوت: (ئەی! چەند مانگ لەئەمریکا بووم، نەمدی بۆ یەک دەقیقەیش کارەبا بکوژێتەوە) منیش پێم ئەوت: (دایەگیان! ئەوێ ئەمریکایەو ئێرە جیایە و چیبکەین ئێمەیش حەزمان ئەکرد وابوایە بەڵام چار چییە؟!).

سەدام حسەین: لەکەلی شەیتان نە ئەهاتەخوارەوە! لەماوەی ئەو پێنج شەش مانگەدا کە کوەیتی داگیرکردبوو، دنیا بوو بەتکاکاری دەست هەڵبگرێ و بەڵام ئەو هەر سوور بوو لەسەر درێژەدان بەداگیرکارییەکەی، لەنوێنەری کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بۆ سەرۆک دەوڵەتانی دنیاو بۆ دەیان و سەدان شاندی ئاشتی و نوێنەری کۆمیسیۆنەکانی مافی مرۆڤ و نامەی سەرەک کۆمارو پادشاکانی وڵاتانی عەرەبی و تائەگاتە سەر "محەمەد عەلی کلایش"، هەموویان، کورد واتەنی دەستەو دامانی بوون و بەڵام ئەو هەر وتی "نا"!. ئەو کەلەی ئەوچووبووە سەری لەکەلی شەیتانیش بەرزترو سەختتر بوو، تەنانەت دواجار وتی: (ئەگەر بەدەنگی خۆیشم گوێتان لەوەبوو داوای کشانەوە بکەم بڕوامەکەن!). ئەوەی کورد ئاواتی بۆ ئەخواست سەدامیش هەر ئەوەی ئەوت! لەو ماوەیەدا هەموومان دەستمان لەسەر دڵمان بوو، سەدام هەروا ئازاو پاڵەوان بێ و پەشیمان نەبێتەوە!. ئەو ڕۆژەی هەواڵێک بەپێچەوانەوە

ڕایگەیاندایە خاوبوونەوەیەک هەیەو ئەگەرێک هەیە بۆ ئەوەی سەدام پاشەکشە بکات! ئێمەیش لەلای خۆمانەوە، دڵمان خاوئەبۆوەو لەوەستان نزیک ئەکەوتەوە !.

لەکۆتایی ئەنفالەکاندا، کوردستان ببووە چۆڵستان. لەچەند دەستەیەک (پ. م)ی موعجیزە ئاسا بەولاوە لەوێنەی "حەمە ڕەش" و "غەریب هەڵەدنی" ئیتر شتێک نەمابوو پێی بوترێ "بەرەنگاری". ئەوانیش لەکونە گورگ و ژێر عەردا ئەژیان و ئەو "مێرولانە بوون بەڕاستی ئەچوون بەگژ قوللەی قافدا". هەموو جارێ، کە بیر لەو ڕۆژگارانە ئەکەمەوە لەدڵی خۆمدا ئەڵێم: (باشە ئەگەر سەدام پاشەکشەی لەکوەیت بکردایە! چیمانبکردایە؟! بەڕاستی ئێستا زەمان ئەم زەمانە نەئەبوو). بەلام بەوەی باشە هەموو دیکتاتۆرێ لەشوێنێکدا تێئەکەوێ، کە هەموو دنیا ئەیزانێ بەتەنها خۆی نەبێ!. ئەی هەر بەو جۆرەیش هیتلەرو مۆسۆلۆنی و تەنانەت بەر لەوانیش ناپلیۆن هەروا تێنەکەوتن!. لەخۆبایی بوونی هەموو دیکتاتۆرێکی وەک سەدام لەپۆپەی دەسەلاتدا دەرئەکەوێ، بەلام ئەوە ئیتر سەرەتای هەڵدێرانێکی گەورەیە، چونکە ئیتر نەچاوی ئەبینێ و نە ئەبیستێ و نە عەقڵیش میوانی ئەبێ. بەڕاستی لەو ڕۆژەوە کە سەدام بڕیاری نەکشانەوەی ئێجگاریدا. لەو ساتەوەختەوە بۆ یەکەمجار بەخت و ڕێکەوتێکی باش ڕووی لەکورد کرد!

هێشتا سێ سەعاتی ترمان ماوە بۆ ئەوەی بگەینە بالتیمور، واتە لەنیوەی ڕێگای نێوان ئایسلەندەو ئەمریکادایین، بیرمئەکردەوە: ئەو چەند لاپەڕەیەی سەرەتای "دەربەندی پەپوولە" تەنها بریتییە لەکلیلێک بۆ کردنەوەی دەرگایەکی بەردەم. من ناتوانم پلان بۆ خەیاڵ بکێشم. من ناتوانم سنوور بۆ گێژەڵووکەکانی زمان دابنێم، بەلام لە هەمانکاتیشدا شیعر "ئاژاوەگێڕی" نییە و هونەرە و هەموو هونەرێکیش کۆمەڵێ یاساو بنەمای خۆی هەیە، نەک بەمانای ئەوەی تەقدیس بکرێن، بەڵکوو بەو مانایەی بەردەوام گۆڕانیان تێدا دروستبکەین. یەکێک لەو مشتومڕانەی هەمیشە لەئارادایە، مەسەلەی وەزن و ئاهەنگ یان ڕیتم و کێشی شیعرە. من بۆ خۆم حەز بەو شیعرانە ئەکەم لەنجەولارو سەمایان تێدایە، زمانی بێ سەمای ناو شیعر لەباخچەیەک ئەچێ هەوا نەیگرێتەوەو لق و پۆپ و بالای درەختەکان لەجووڵە کەوتبێ! ئەشێ باخچەکە زۆر جوان و بە بۆن و وبەرامەیش بێ، بەلام ژنی جوان بەلەنجەو لارەوە جوانترەو بەسەماکردنەوە قوڵتر تێی ئەڕوانی و گیرۆدەی ئەبی. شیعرێکی بێ ئاهەنگ ڕەنگە کارت تێبکات، بەلام زووتر لەبیر ئەچێتەوە، چونکە بیستنت ناکا بەهاوبەشی تێگەیشتنت.

پەخشانی وا هەیە ئەوەندە جوانە لەگۆمێک ئەچێت تێرناخۆی لەتەماشاکردنی، بەڵام شەپۆل و هاژەو هەڵچوون و داچوونی لەبەرچاو نییە، شیعر ڕووبارە، چونکە شەپۆلدارە، چونکە بەردەوام لەبزووتندایە. بەر لەکێشی عورووزی عەرەبی و یاساکانی ئەحمەدی فەراهیری کورد؛ کێشەکانی ئاهەنگی گۆرانیی فۆلکلۆری خۆی هەبووە. ئەم کێشی عروزە لای شاعیرە کوردەکان هەمان ئەو کێشە نییە کە لای شاعیرە عەرەبەکان بووە، هەروەها لای شاعیرانی فارسیش هەر جیایە. بەڵکوو چ زمانی فارسی و چ زمانی کوردی لەڕێی "زەحف"ەوە کەمتازۆر گۆڕانیان تێدا دروستکردووە، چونکە زۆرجار ئەگەر بەهەمان پێوانەی عروزی عەرەبی شیعرێکی بۆ نموونە (نالی) بپێویت هەست ئەکەین نایەتەوە. ئەوەی ڕاستی بێ شاعیرانی کورد سوودیان لەدوو چاوگی گەورەی گۆرانیی کوردی وەرنەگرتووە، واتە لاوک و حەیران، سوود وەرگرتن لەڕووی ئەو ئاهەنگ و کێشانەوە، کە لەو دوو دنیایەدا کۆبوونەتەوە. لێکۆڵینەوەی جیدی لەم بارەیەوە نەکراوە. من پێموایە لاوک و حەیران پەخشانە شیعرن یان ئەو نەفەسانەیان تێدایە کە زۆر نزیک ئەکەونەوە لەپەخشان و لەشیعریش بەسەریەکەوە یان جیابەجیا. دیارە بەکارهێنانی وەزنی پەنجە بەبڕگە، بۆ شاعیری کوردو زمانی کوردی لە بارترو گونجاوترو ئاسانتریشە، وەک لەوەزنەکانی عروزی عەرەبی. ئەگەرچی لەئێستادا شاعیری تازە خۆی بەهیچ کام لەو وەزنانەوە نابەستێتەوەو جێی بایەخ پێدانیان نین. بەڵام گرفتەکە لەڕووی ئاهەنگی شیعرەوە لەوەدایە لای زۆربەی هەرە زۆری شاعیرە گەنجەکانی ئەمڕۆ، شتێک نییە پێی بوترێ ئاهەنگ و موزیکی شیعر. جا ئیتر هەر جۆرە ئاهەنگ و موزیکێک بن. ئەمە جگەلەوەی لەزۆربەی زۆری ئەو بەرهەمانەدا، ئەگەر بەهرەیش ببینی، بەڵام "بەهرەکە" کاڵو کرچە و جوانییەکانیان لە "عەفەویەتێک"دایە، لە یەکەم خوێندنەوەدا ڕەنگە سەرنجت ڕابکێشن، وەک ژنی دوورکوژ، بەڵام وەختێ لێیان وردبویتەوەو لەنزیکەوە سەرنجت لێدان ئیتر خەوشەکان یەک لەدوای یەک دەرئەکەون: نە سەرسامبوونێ بەمانایەکی قوڵ، نە زمانێکی کوردی ڕەوان و ڕوون، نە جەستەی شیعرێکی پتەوو یەکگرتووی بێ دەڵقەو کەلێن، نە بەکارهێنانی هێما و ئاماژەکان لەشوێنی خۆیاندا، نەڕەهەندی بینینی فرە لایەن، نەگوێدانە پوختی زمان لەڕووی وشەو دەستەواژەوە، هەروەها نەبوونی هیچ جۆرە ڕیتم و ئاهەنگو موزیکێک. تۆ بڕوانە بەشی هەرە زۆری ئەو "شیعرانە" هەموو لەیەک

ئەچن، یان ئەڵێی لەزمانێکی ترەوەوەرگێڕدراون. ئەزموونی لەیەک جیا هەر زۆر کەمە. وەک ئەوەی بیست شاعیر لەناویەکدا هەمان وشەو دەستەواژەو وێنەیان بەسەر خۆیاندا دابەشکردبێ و بڕیاریان دابێ بەیەک جۆر کەرەستەی لەیەک چوو شیعرەکانیان دروستبکەن. لەبەرئەوە، وەک سەرئەنجام لەشیعری هەر یەکێکیاندا هەر یەک ڕەهەند ئەبینی و هەر یەک هەستی دیارو هەر یەک تام و چێژیشیان لێئەکەیت! هەر شاعیرێ نەگەیشتە ئەزموونێکی جیا لەداهێنانداماڵی خۆی نابێت، ڕەنگ و دەنگ و ڕووی خۆی نابێت، ون ئەبێت!. لەباشترین حاڵەتدا ڕەنگە ببێتە لاسایی کەرەوەیەکی باش. بەڵام پیاو شاعیرێکی پلە دوو سێ بێ باشترە لەوەی لاسایی کەرەوەیەکی باش بێ.

لەو ساڵانەی دواییدا سێبەرێکی تۆخی لەگومان دووری شاعیرانی ئێرانی بەتایبەتی "فروغ فرخزاد و سهرابی سوپهەری" باڵی بەسەر دنیای شیعری شاعیرە گەنجەکانی ئێمەدا کێشاوە. سەری ئەوان بەجەستەی ئەمانەوە نووساوە. ژێی دەنگ ئەوان و هەناسە هی ئەوان و گریان و پێکەنین هی ئەوان و تەنانەت کۆمەڵێ لە دەستەواژەو وشەی تێکەڵی عەرەبی و فارسی هی ئەوان و ئەوەی بۆ ئەمانیش ماوەتەوە هەندێ وشەی کوردی و ناونیشانی شیعرەکان و ناوی خۆیانە!

ئێستە خۆمان بەستووەو پاش دە دەقیقەی تر لەفڕۆکەخانەی باڵتیمۆر ئەنیشینەوە. مرۆڤ لەکۆتایی سەفەری وادرێژدا هەست بەناسوودەییەکی دەروونی ئەکات، وەک ئەوەی بارێکی قورست لەکۆڵ بووبێتەوە. هەناسەیەک ئەدەیت و گورج ئەبیتەوەو خواخواتە بەزووترین کات فڕۆکەکە بەجێبهێڵی. ئێمەیش لەگەڵ ئەوانی تردا ڕیز بووین و چووینە بەردەمی دەستەی کۆنترۆڵ. داوای پەساپۆرتەکانیانکردین، خەممان نەبوو چونکە هەموو شتێکمان تەواو و ڕێکوپێک بوو، کامەران ئینگلیزییەکەی باش بوو، بەڵام ئیتر ئەو نوسااندنەی نووسان بەمنەوە بەریاننەدام، تەنانەت ئەو جانتایانەی کە بارمکردبوون و تۆ ئەبێ دواتر وەریانبگریتەوە ئەوانەیشیان هێناو کەوتنە پشکنینێکی ورد و سەیر، هەرچی پەڕەکاغەزو دەفتەرو کتێبێکم پێبوو دەریانهێناو چەندیشیان توانی هەر لەوێدا کۆپییان لەبەرگرتنەوە، بەکورتی کەس لەفڕۆکەخانەکەدا نەما، من و کامەران نەبین! بەڵام هەر بەردەوام خەریکی پشکنین بوون. ئەو سەردەمە سەفەرکردنی "عێراقی" بۆ ئەمریکا بەهۆی بارودۆخی عێراق و داگیرکردنی کوەیتەوە کێشەو گیروگازی زۆر بوو، من هەر ئەوەم شک ئەبردو هیچی تر. قسەیشیان نەئەکرد لەبەرچی وائەکەن، من زۆر بێتاقەت ببووم، هەرچەندە پێمان وتن: (ئێمە کوردین و هەڵاتووی دەستی سەدامین)، بەڵام بێسوودبوو. تا ئەهات

بێتاقەتتر ئەبووم، ئەمە جگەلەوەی خەمی دایکم و ئەو کەسانەیشم بوو، کە هاتبوون بەپیرمانەوەو چاوەڕوانیان ئەکردین و بەهۆی ئێمەوە ئەوانیش گیریانخواردبوو. قسەم زۆر کردو کامەرانیش قسەکانمی ئەکرد بەئینگلیزی. قسەکانم زۆر توندو تیژبوون، بەڵام هەر گوێشیان نەئەدایە. لەدواییدا وەک نیمچە دادگاییکردنێ دووسێ ئیستمارەیان هێناو پێیان پڕکردمەوەو بەڵێنی ئەوەیان لێوەرگرتم کە لەئەمریکا نەمێنمەوەو دوای تەواوبوونی سەفەرەکەم بگەڕێمەوە بۆ سوید .

ئەم گێرمەو کێشەو ڕاگرتنە ناخۆشە زیاد لەسێ سەعات و نیوی زیاتر خایاند، وەختێ وازیان لێهێنایین بەرەبەیان بوو، کرێکارەکانیش لەفڕۆکەخانەدا نەمابوون. چۆڵ و هۆڵ. کاتێ چووینە دەرەوە "دایکم و کامەرانی برام و ژیانی خوشکم و کاکە عومەرو یەکدوانیکی تر"، هەروەها هاوڕێی دێرینم کاکە "جەلالی میرزا کەریم" بەخۆیی و گۆچانەکەیەوە ڕاوەستابوو، دیاربوو ئەوانیش بێتاقەت ببوون. نێوان بالتیمۆرو واشنتۆن و ئەو گەڕەکەی دایکم و ژیانی لێ ئەژیان بەئۆتۆمبیل سەعات و نیو زیاتر بوو. وەختێ گەیشتینە ماڵەوە دنیا تەواو ڕووناک ببۆوە، منیش ماندووبووم بۆیە یەکسەر نوستم .

ئەو وەختەی چاومکردەوەو تەماشای سەعاتم کرد. دوو سەعاتێک ئەبوو نووستبووم. هاتمەوە هۆڵەکە لای دایکم. نیو سەعاتی نەبرد، گوێم لەگرمەگرمی هەورو لێزمەی شەستەباران بوو. چوومە سەر تارمەکە، زریانێکی ئەوەندە بەهێزبوو هەر ئەوە نەبوو ئەو درەختانە لەڕەگەوە هەڵنەکەنێ. تۆف و زریانەکە تا ئەهات توندوتیژتر و بەگوڕتر ئەبوو. هەورە تریشقەو لێزمەی باران و شەوقدانەوەی ساتەوەختی برووسکەکان سامیان ئەخستە دڵەوەو ئەوەندەمان نەزانی کارەبا کوژایەوە! بوو بەچارەک و نیو سەعات زیاترو کارەبا هەرنەهاتەوە. لەژێرەوە تەماشای دایکم ئەکرد. بوو بەسەعات و هەر هیچ. دایکم چوو هەندێ مۆمی هێناو دامانگیرساند. بۆ گاڵتەو بۆ ئەوەی تۆزێ دایکم تووڕە بکەم پێموت "هەزار خۆزگەمان بەسلەیمانی!، ئەمە ئەمریکاکەتە هاتینو نەهاتین بوو بە تاریکستان، نەمانزانی ئەگینا چرایەکمان لەگەڵ خۆماندا ئەهێنا!" دایکم نەیئەزانی چیبڵێ!. ئەم کوژانەوەی کارەبایە سێ سەعات زیاتری خایاند.!

لەناوەڕاستی ساڵی "١٩٧٤"ەوە کاک جەلالی میرزا کەریمی هاوڕێم نەدیبوو. پاش هەرەس ئەو کەوتە ئێرانەوەو دواتر بەرەو ئەمریکاو لەویلایەتی تەکساس گیرسابۆوەو لەم ساڵانەی دواییشدا هاتبووە واشنتۆن. بەرلەوەی خۆی ببینم و

پێمبڵێ لەدایکم پرسی ئەی ئەو گۆچانە چییە بە کاک جەلال؟! وتی: (ئەوە پێش ساڵێک ئۆتۆمبیلێک پاشەوپاش ئەگەڕێتەوەو ئەمیش ئاگای لەخۆی نابێت و ئەیکات بەژێرەوە، تائێستە دووجار نەشتەرگەری بۆ کراوە!). بینینەوەی کاک جەلال بۆ من مایەی دڵخۆشی بوو، چونکە ئەو یەکێک بوو لەهاوڕێ هەرە نزیکەکانی ساڵانێکی دورودرێژی عومرم. تەمەنم پانزە ساڵ بوو کە ئەوم ناسیوە. ئەمە جگە لەساڵانی بەغداو سەردەمی ڕوانگەو ساڵێکی ناو شۆڕشی ئەیلولیش. لەماوەی ئەو دوو مانگەی لەئەمریکا مامەوە، زوو زوو یەکترمان ئەبینی. هەندێ شیعری تازەی خۆیشی نیشاندام، بەلام هەر بەهەمان هەناسەی شیعری حەفتاکانی نووسرابوون .

کاک جەلال؛ پیاوێکی هێمنو لەسەرخۆبوو. ڕقاوی و بوغز لەسک نەبوو. هەر کارێکی بکردایە بەجیدی و زۆر بە پەرۆشەوە ئەیکرد، یان هەر نەیئەکرد. دوایئەو هەموو ساڵانەی لەئەمریکایش ژیابوون، بەلام هەر جەلالە سادەو ساکارەکەی جاران بوو. ئاواتی ئەوەبوو ڕۆژێ لەڕۆژان و لەڕۆژگارێکی ئازاددا بگەڕێتەوە بۆ کوردستان و لەبواری ڕۆژنامەوانی و یان ڕاگەیاندندا کار بکات. ئاواتەکەی هاتەدی و دوای ڕاپەڕین و دروستبوونی یەکەمین کابینەی حکومەتی هەرێمی کوردستان، لەوەختێکدا کەم کەس بیری لەوە ئەکردەوە یان ئامادەبێ بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە، کاک جەلال گەڕایەوە کوردستان. ئەوکاتە من یەکەمین وەزیری ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان بووم. کاک جەلال؛ بوو بە یەکەمین بەڕێوەبەری ڕادیۆی هەرێم لەهەولێر. ئەمە لەوەختێکدا بوو، کە ئێمە چووبووینە سەر کەلاوەیەک و پارەوپوول و دارایی لەجێی نەبووان بوو. بەلام کاک جەلال جگەرسۆزانە کاریئەکرد، بەر لە هەمووان ئەچووە سەر کارەکەی‌و دوای هەمووانیش ئەچووە دەرەوە. بەلام بەداخەوە مەرگ بواری نەداو ڕۆژێک جەڵتەیەک لێیئەداو بەپەلە ئەیگەیەننە نەخۆشخانە. وەختێ گەیشتمە لای کەوتبوو، لەژێر چاودێری دوکتۆری دڵدا بوو. بەلام لەو جەڵتەیە ڕزگاری ببوو. ماچم کردو بیرمە وتی: "بۆچی هاتوویت؟! هیچی وانەبوو ڕەنگە سبەینێ بچمە دەرەوە!" بەلام سەد داخ و مەخابن هەر دوای من، جەڵتەیەکی تر لێی ئەداتەوەو دڵە گەورەو پاکەکەی لەلێدان ئەخات.!

ژیان و هاتوچۆی ڕۆژانەو بینینی دۆست و ناسیاو لە ئەمریکادا گرانترەو وەکوو ئەورووپا نییە، ئەوەی خاوەنی ئۆتۆمبیلی خۆی نەبێ، قاچیشی نییە، وێستگەی پاسەکان دوروو بازاڕو کافتریا لەزۆر ناوچەدا نییەو نزیکترینیان

بەئۆتۆمبیل چارەک و بیست دەقیقەی ئەوێت. ئەمە بەپێچەوانەی زۆر لەولاتەکانی ئەورووپاوە، کە ئەو شوێنانە بازاڕ، کافتریا، چێشتخانە، پۆست، لەهەموو گەڕەکەکاندا هەن و بەئاسانی ئەیانگەیتێ. ئەمە جگە لەوەی ئەو خزم و ناسیاوو هاوڕێیانەیش، کە ئەبوو چاوەڕییانبم بۆ ئەوەی بمبەنە دەرەوە یان بمگەیەننە شوێنێک، هەموویان بەڕۆژ تا عەسرێکی درەنگ لەسەر کاری خۆیان بوون. ئێ خۆیشم بەتەنیا چۆن بچمە دەرەوە. لەبەر ئەوە زۆربەی کات ئەبوو هەر لەماڵەوەبم و چاوەڕوانی ئێواران بکەم و بەشی زۆری ئەو ئەرکی بردنە دەرەوەو گەڕاندن و گەیاندنانەیش کەوتبووە سەر شانی ژیانی خوشکم. هەوڵمدا چایخانەیەکی نزیک لەم گەڕەکە بدۆزمەوە، بێسوودبوو. لەبەر ئەوە چەند سەعاتێکی بەر لەنیوڕۆم هەر لەماڵەوە تەرخانکردبوو بۆ خوێندنەوەو نووسین. لەسویدیشەوە شەش حەوت کتێبێکم لەگەڵ خۆمدا هێنابوو. چوومەوە سەر "دەربەندی پەپوولە"و هەرچییەکم نووسیبوو سەر لەنوێ پێیاندا چوومەوە. سەر لەنوێ کەوتنەوەبەر مۆنتاژکردنێکی تازە، چوارپێنج لاپەڕەم لێفرێدان. ئیتر دوایئەوە وەک بڵێی بکەومەوە ناو هەوای خۆم یان "لەنگەر و ئیقاعی" خۆم دۆزیبێتەوە. لەگەڵ قەسیدەکەدا ڕۆیشتم. من بەرلەوەی هەر قەسیدەیەکی درێژ بنووسم، ئەبێ ئەوەم لەڵ ڕوونبێ، چی ئەنووسم و بۆ ئەنووسم؟! ئەمە بەمانای پلاندانان نا، بەڵکو بەمانای دۆزینەوەی فەزایەک، کە بەگشتیی قەسیدەکەی تێدا بخەملێت. یان بەجۆرێکی تر بڵێم کتومت وەک سەفەرکردنێ، ئەبێ ئاڕاستەو شوێنێک هەبێ ڕووی تێبکەم، بەڵام دوایئەوەی ئەڕۆم ڕێگا بۆ کوێی ترم ئەباو چی ڕووئەداو چی ڕوونادا و وردە کارییەکان چۆن ئەبن‌و تووشی چی ئەبم و نابم و ئەوەی من چاوەڕوانم نەکردووە، دێت و چۆن ئەبن.. ئەمانە شەپۆلەکانی ناو قەسیدەکە لەساتەوەختی خۆیاندا، لەساتەوەختی نووسینیاندا دەرئەکەون و مەحاڵە پێشتر بڕیاریان بۆ بدرێ. هەموو بیرۆکەو خولیا و بەرە ژانەکانی بەر لە نووسینی "دەربەندی پەپوولە" چەند پەڵە هەورێکی بەر لەدابارین بوون :

"چڕبوونەوەی حەسرەت و نامۆیی خۆم و میللەتەکەم. دووکەڵی ئەم غوربەتە لەکۆنەوە بۆ ئەمڕۆ، سەرانی غوربەتی گەورە لەشیعری کوردیداو لەمێژووی دورونزیکدا، مەولانا خالید، نالیی، حاجی قادری کۆیی، بەدرخانییەکان، شەریف پاشا و هتد، هەستکردن بەونبوون لەدنیای ئەمڕۆدا" ئەتوانم بڵێم ئەمە هەموو ئەو پەڵە هەورانەبوون کەپێش نووسینی ئەو قەسیدە درێژە لەسەرمدا کۆبووبوونەوە! بەئەزموونی خۆیشم من ئەتوانم وەک نووسین لەکارێک دابڕێم،

جا لەبەر هەر هۆیەک بێ و بەڵام لەدواییدا بچمەوە سەری و تەواوی بکەم. بەڵام وەک نووسین، ئەگینا وەک خولیا و مەراق، وەک خەیاڵ و وەسوەسەی بەردەوام، ناتوانم لەو کارە دابڕێم. ئەمە جگەلەوەی قەسیدەی درێژ مەحاڵە بەدانیشتن و چەند دانیشتنێ تەواو بکرێ، چونکە سروشتی کارەکە خۆی وایە، تەواو هەروەکوو ئەوەی ئەشێ لەیەک دانیشتندا چیرۆکێکی کورت بنووسرێ، بەڵام ئەمە مەحاڵە بۆ نووسینی ڕۆمانێ. هەروەها لەنووسینی قەسیدەی درێژدا وێستگەکان زۆر ئەبێ. فرە دەنگی دێتە ئاراوە. لەبری یەک حاڵەت، چەندین حاڵەت و ددیمەن، چەندین جیاوازی پەیدا ئەبێ و بەرەنگاری یەکتر ئەبنەوە. ئەمە سروشتی درامای شیعرە. مەنتیقی عەقڵی و عاتیفی، لیریکی و درامی، سوریالی و واقیعی. باری سایکۆلۆجی و مێژوویی حیکمەت و پەندو بێ هودەیی و ئومێدو، گریان و پێکەنین و هەرهەموویان وەک ژیان خۆی دێنە ناوەوەو لەزۆراندان، یان پێکەوە هەڵئەکەن‌و ئەگونجێن، یا ناگونجێن. لەبەرئەوە بۆ نووسینی قەسیدەی درێژ پێویستە وەک سەفەری درێژ باشتر خۆتی بۆ ئامادەبکەیت. ئەبێ پێداویستییەکانت هەمە جۆربن. پێویستە خاوەن زەخیرەیەکی باشی زمان بیت. بێگومان ئەگەر ئەزموونیشت لەدنیا دیدەیی شیعردا بەتەمەنتر بێت کارەکەت کۆکتر ئەبێت.

وا ڕێکەوت لەوکاتەدا، کە من لەئەمریکا بووم کۆنگرەی (K. N. C) هەبوو، بانگهێشتیان کردم‌و چەند شیعرێکی خۆیشم خوێندەوە. ئەمە جگەلەوەی بەو بۆنەیەوە چاوم بەو کوردە ڕووناکبیرانە کەوت، کە لەهەرێمە جیاجیاکانی ئەمریکاوە هاتبوون بۆ ئەم کۆنگرەیە. بەر لەبەستنی کۆنگرەکەیش "د. نەجمەدین کەریم"، کە یەکێکە لە ئەندامە دیارەکانی (K. N. C) و پزیشکی نەشتەرگەری دەماغەو لەدەمێکەوە لەئەمریکا ئەژی. بۆ بەخێرهاتنم سەردانی ماڵەوەی کردو دوای چەند ڕۆژێکیش لەتەلارە دلگیرەکەی ماڵی خۆیاندا، کە کەوتبووە نێو دارستانێکەوە، میوانداریکردم .

د. نەجمەدین؛ لەو کوردە ڕووناکبیرە چالاکانەیە چ لەڕێی (K. N. C) و چ بەهۆی پەیوەندییە تایبەتییەکانی خۆیەوە، توانیوێتی لەنێوەندە گرنگەکانی بڕیاری سیاسی ئەمریکی نزیکبێتەوەو چەندین دۆست‌و لایەنگر بۆ مەسەلەی کورد پەیدا بکات.

چەند جارێکیش باوکی کاوەو کامەران و ژیانی خوشکم. کاک "عومەر هەڵمەت"م بینی و داوەتی ماڵەوەی کردین. کاک عومەر؛ بەکۆشش و ڕەنج و زیرەکی خۆی

توانیبووی ببێتە سەرپەرشتیکەری بەشێکی گەورە لەوەزارەتی بازرگانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. باری دەرامەت و گوزەرانی باش بوو. خانۆکەی خۆش و گەورەو دلگیربوو. هەڵبەت کاک عومەر؛ زووتر دوای جیابوونەوەی لەدایکم، خاتوو "پەیمان شێخ نووری" خوشکی شەهید "ئاگری و کاک ئاسۆی شێخ نووری" هێنابوو. لەپەیمان خانیش کچ و کوڕێکی هەبوو. پەیمان خان؛ لەژنە چالاکەکانی نێو ڕێکخستنەکانی (ی. ن. ک) بوو لەئەمریکا و تائێستەیش هەر لەوێن.

کاوە-ی برام، ئەو کاتە خۆیی و خاوو خێزانی لەکالیفۆرنیا ئەژیان و کارەکەی لەوێ بوو. کامەرانی برام نزیکی ماڵی دایکم بوو. لەبەر ئەوە یەکەمجار بۆ بینینی گەلێ شوێنی گرنگ لەواشنتۆندا ئەو ئەهات بەشوێنما و ئەیگەڕانم. بەتایبەتی موزەخانەو سەیرانگە بەناوبانگەکان و بورجە بەرزەکەی واشنتۆن، کە کوردەکان ناوی "قەڵەم"یان لێناوە. هەر لەگەڵ ئەویشدا چووین بۆ بینینی پەیکەرە گەورەکەی "ئەبراهام لینکۆڵن"و بینینی مۆنۆمێنتی ئەو سەبازانەی لەشەڕی ڤێتنامدا کوژرابوون‌و لەسەر خشتەکانی چەند ڕیزە دیوارێ ناوەکانیان هەڵکۆڵرابوون. یەکێک لەو مۆزە گرنگانەی جێی سەرسامیم بوون. مۆزەی گەشتە ئاسمانییەکان و چوونە سەر مانگ بوو. ئیتر هەر لەهەوڵە سەرەتاییەکانەوە تا ئەو کاتەی گەیشتوونەتە سەرمانگ، قۆناغ دیاریکرابوون و کەشتییە ئاسمانییەکانیش لەشوێنی خۆیاندا دانرابوون. کەرەستەو جل و بەرگی ڕێبەرەکان، وێنەکانیان، دەنگیان، لەیەکەم جیابوونەوەی ساروخەکانیانەوە لەعەردەوە تا دیمەنی ئەستێرەکانی تری گەردوون .

بەردی ناو مانگ، ئەو خواردەمەنییانەی لەگەشتەکاندا خواردوویانن. هەروەها بۆ من یەکەمجار بوو فیلمی موجەسەمی بەرجەستە ببینم، بەڕاستی لەزۆر دیمەندا یان چاوی خۆم ئەگرت یان وامئەزانی ئەو بەردەی لەفیلمەکەدا هەڵیئەدەن بەرم ئەکەوێ لەبەر ئەوە بێ ئاگا خۆم لائەدا! هەر بۆیەکەمجاریش بوو کامەران بردمی بۆ گازینۆیەک لەنهۆمێکی بەرزی ئەپارتمانێکدا. گازینۆکە وردە وردە ئەجوڵاو ئەسوڕایەوە، لەبەرئەوە تۆ ئەتتوانی واشنتۆن لەهەموو ڕوانگەکانەوە ببینی. بازاڕە مۆدێرنەکانی ئەمریکا هەر ئێجگار گەورەو فراوانن. من؛ هیلاک ئەبووم و نەمئەتوانی هەموو بەشەکانیان بگەڕێم. هەموو شتێ لەمرۆڤەوە بۆ شەقامو پرد و بازاڕو باخچەو کتێبخانەو موزەخانە لەئەمریکادا زل و زەبەللاحن. من دوای گەڕانەوەم بۆ ئەوروپا، وتم ئەوروپا بە بەراورد لەگەڵ

ئەمریکادا وەک ئەوە وایە شقارتەیەک لەتەنیشت کارتۆنێکەوە دابنێیت!. بۆ خۆم کەم ژنی باریکەلە یان پیاوی بەلەش لاوازم بەرچاو کەوت. هەموو کەتەو قەڵەو، بەردەوامیش ئەخۆن.

پاشئەوەی چەند ڕۆژ بوو لەواشنتۆن بووم. بەدەرفەتمزانی بچم بۆ نیویۆرک و ئەو شارە گەورەیەیش ببینم .

"کاک ئەحمەد جاف" یەکێک بوو لەو کوردە دڵسۆزانەی چەند ساڵ بوو لە ئەمریکا بوو. لەڕیزەکانی (ی. ن. ک)دا کاری ئەکرد، وەختێ داواکەی خۆم پێوت. زۆر بەدڵ فراوانییەوە هاتە پێشێ و وتی: (کەی ئەڵێیت خۆم و ئۆتۆمبیلەکەم ئامادەین). ڕۆژێکمان دیاریکردوو کەوتینە ڕێ. نێوان واشنتۆن و نیویۆرک بەئۆتۆمبیل نزیکەی پێنج سەعاتێک ئەبێت. بەدرێژایی ئەو ڕێگایە شتێک نییە پێی بوترێ بۆشایی. ئۆتۆبانەکەیش پان و بەرین و لێخوڕینی هێواش قەدەغەیە. من بۆ خۆم لەدوو وڵاتی دنیادا جادەو شەقامی جوان و باشم دیوە. ئەڵەمانیاو ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا. لەڕێگە گوێمان لەگۆرانییەکانی مەزهەری خالقی و ڕەزازی و ماملێ و دیلان ئەگرت. ناو بەناو کاک ئەحمەد خۆیشی ئەیوت و دەنگی ناخۆش نەبوو. سەر لەئێوارە گەیشتینە قەراغ شاری نیویۆرک.

ئاشکرایە نیویۆرک؛ یەکێکە لەشارە هەرە گەورەکانی دنیا. کاک ئەحمەد، بەپێی ئەو ناونیشانەی پێیبوو ڕوویکردە ماڵە ئاسیاوێکی خۆی کەخەڵکی مەهاباد بوون، کاک "فەرهاد" و براکەی، دوای گەڕانێکی زۆر ماڵەکەمان دۆزییەوە. کاک ئەحمەد منی بەکاک فەرهاد ناساندو زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردم، چووینە ژوورەوە، ماڵێکی خنجیلانەو خۆش بوو، هەر خۆیی‌و براکەی لەم ماڵەدا ئەژیان. دوایئەوەی نانمان خواردو حەساینەوە. کاک فەرهاد لەگەڵماندا هاتەدەرەوەو ڕومانکردە ناو شاری نیویۆرک. لەبەر ئەوەی سەفەرەکەمان تەنها بۆ دوو ڕۆژبوو، بۆیە ئەمویست، ئەوەی لەو ماوەکەمەدا بۆ بینینی چەند شوێنێکی گرنگ پێمان ئەکرێ بیکەین، ئەگەرچی ئەمزانی دووڕۆژ بۆ نیویۆرک هەر ئێجگار کەمەو ئاخۆ ئەبێ فریای چی بکەوین !

زۆرم مەبەست بوو تەلاری نەتەوەیەکگرتووەکان و دوو بورجە هەرە بەرزەکەی نیویۆرک و پەیکەری ئازادی ببینم. بەڕاستی ئەم شارە نەسەری دیارەو نەبن. بریتییە لەئاپوورەی ملیۆنان مرڤ و ژاوەژاوێکی بەردەوام. هەمووی هەر ڕاکەڕاکەو بەیەکدا چوونە. کەس ئاوڕ لەکەس ناداتەوە. لەدارستانێکی چڕی کۆنکرێتی ئەچوو، هەر چۆنێک بوو گەیشتینە بەردەمی دوو

بورجەکەو سەرکەوتینە سەرەوە. هەرە بەرزەکەیان ئەبێ لەسەر عەرد پاڵکەوی ئینجا ئەتوانی دوا نهۆمی ببینی. من بۆ خۆم لەشاری وا قەرەباڵغ و بەراکەراکەدا ئاسوودە نابم، چونکە بەردەوام ماندوویت و بەهۆی ترافیکی زۆرەوە گران ئەگەیتە شوێنەکان. لەسەر داوای من چووینە یەکێک لەکافتریا خۆشەکان. لەدواییدا تەلاری کۆمەڵی نەتەوە یەککرتووەکانیشم بینی. شەو درەنگان گەراینەوە بۆ ماڵێ و لەبەرئەوەی ئەو رۆژە هەر بەرێگاوە بووین و لەم چوونە دەرەوەیەشدا ئەوەندەی تر ماندوو ببووم. بۆیە وەختێ راکشام یەکسەر خەوم لێکەوت .

بۆ سبەینێ ئەبوو بچین بۆ بینینی پەیکەری ئازادی، ئیتر تا ئەو شوێنەی رێی وشکانی بوو بەئۆتۆمبیلەکەمان چووینو لەپارکێکی گەورەدا ئۆتۆمبیلەکەمان پارککردوو بلیتی کەشیتمان بری و سواربووین. ئەم کەشتییانە بەقەوارە گەورەنین و مامناوەندین، هەر ئەوەندەی کەجێی سەد سەدو پەنجا کەسێکیان تێدا ببێتەوە. بەشی زۆری سەرنشینەکان ئەو گەریدانە بوون، کە لەولاتانی دنیاوە هاتبوون، بەلام ژمارەی ژاپۆنییەکان لەهەمووان زۆرتر بوون. ماوەی نێوان هەردوو رۆخی ئەم رووبارە تائەوبەر، نزیکەی نیو سەعاتێک ئەخایێنێ. لەسواربوونەوە تۆ پەیکەرەکەت هەر لێدیارە تا ئەیگەیتێ، بەلام دیارە تانزیکتربیتەوە قەوارەی پەیکەرەکە وردە وردە گەورەتر ئەبێت. پەیکەرەکە خۆی ئەپارتمانێکی بەرزە، بەشێکی کافتریاو چێشتخانەیەوو لەناوەراستی چیمەنو باخێکی گەورەدایە، لەبەرئەوەی ئەوکاتەی ئێمە لەوێبووین لەناوەوە خەریکی چاککردنەوەو تازەکردنەوەی بوون، بۆیە نەمانتوانی هەموو بەشەکانی ببینین. ئەو رۆژە تادرەنگانێ لەدەوروبەری ناوچەی پەیکەری ئازادی ماینەوە. دواتر گەراینەوە بۆ ئەو بەرو ئەمجارەیان بەبێئەوەی بەرنامەیەکمان هەبێت بۆ خۆمان ئەسوورراینەوە. ئەوەی لەم گەشتەی ئەمریکاداو لەنیویۆرکدا سەرنجیراکێشام، دووژیانی زۆر ناکۆک بەیەکبوون. لەلایەکەوە سەرمایەداری ئەو چینەی کە خاوەنی ملیارەهان و لەم لای تریشەوە ژیانی ئەو هەژارو بێکارانەی کە لەخانووی تەنەکەی رزیوو کەلاوەکاندا وەک ئاژەل ئەژیان. بۆ خۆم کەسانێکم ئەدی کەبۆرییە کۆنکرێتە گەورەکانیان لەژێر پردە گەورەکاندا کردبوو بەکولانە بۆ خۆیان! زنجیان بەتەنەکەو کارتۆن دروستکردبوو. سەرو ریش هاتوو، جل دراوو، قژ بژو چڵکن. ئەمانە بەشی زۆریان لەرەش پێستەکان بوون. بەکورتی تۆ لەپاڵ تەلاری سەر لەئاسمان گیرکردوودا برسی و رەش و رووتیشت

ئەبینی، ئەو کوختانەت ئەبینی کەتەنانەت دەرگاو پەنجەرەیشیان نەبوو. پێموایە پێشکەوتنی گەورەی هەر وڵاتێ لەبەختەوەری مرۆڤەکانیدایە، بۆ خۆم گاڵتەم بەوەدێت پێشکەوتنی تەکنەلۆجیام بمگەیەنێتە ناو مانگو بەڵام لەسەر ئەو زەوییەی لێوەی ئەچم بۆ مانگ خەڵکی سەر نوێلکەکان بگەڕێن بۆ ئەوەی پارچە نانێکی فڕێدراویان چنگ بکەوێ !.

لە ڕووسیا و لە ئەمریکایش لەژێر سایەی سیستەمی بەناو ئیشتراکی و لەملایش لەژێر سایەی سیستەمی سەرمایەداری ئەمریکادا ئەو دیمەنانەم ئەبینی کەلەدەرەوەی تیۆری و کتێب و بانگەشەو پروپاگەندەی ڕاگەیاندن و تەلەفزیۆندا، ڕاستی و واقیعی ژیانی ئەو خەڵکە برسی و ڕەش و ڕووتانەیان تێئەگەیاندم. بەچاوی خۆم لەو پەناو پاسارانەدا، لەو ماڵە تەنەکەو زنجانەدا، جیاوازییەکانم ئەبینی. بەڕاستی "درۆکردن" بووە بەبەشێکی دانەبڕاو لەپێکهاتەکانی هەموو ئەو سیستەمانە، بەخۆرهەڵات و بەخۆرئاواوە. بۆ من وەک شاعیرێ پێمخۆشە وڵاتێ ببینم جوان و ڕازاوەو لەڕووی تەکنەلۆجیاو پێشکەوتنی زانیارییەوە گەیشتۆتە ئاستێکی سەرسوڕهێنەر، بەڵام لەوە گرنگتر بۆ من ئەوەیە مرۆڤی برسی و ڕووت و ڕەجاڵ و ماڵی تەنەکەی تێدا نەبینم. بۆمن ئەوە گرنگ نییە لینین و ستالین و خرۆشۆف و گۆرباچۆف چییان وتووە! ئەوەی بەلای منەوە مەسەلەی جەوهەرییە لەمەیدانی کاردا ئەو وتانە چییانکردووە؟ تا چەند لەبرسێتی و نەخۆشی و بێ ماڵی و زۆرداری و نادیموکراتی و نامرۆڤایەتییان کەمکردۆتەوە یان نەیانهێشتوون و لەناویانبردوون.!

بۆ ڕۆژی دوایی لەگەڵ کاک ئەحمەد جاف-دا بەهەمان ڕێگادا گەڕاینەوە واشنتۆن. نازانم من شاری وا بەئاپوورەو ڕەق و تەقی کۆنکرێتیم پێخۆش نییە. هەست ئەکەم تیایاندا تەنگە نەفەس ئەبم. نیویۆرک شاری کۆمپانیاو پیشەسازییە گەورەکانە. ئەگەرچی ستۆکهۆڵم پایتەختی سویدیشە، بەڵام ژمارەی هەموو دانیشتوانی ناگاتە دوو ملیۆن کەس. ئەمە جگەلەوەی هەواکەی پاکەو وەکوو هەوای لەندەن و نیویۆرک ناو دەم و کونە لووت ڕەشایی نادەنەوە، جل و کراسی سپی زۆر زوو چڵکن نابن.

کاوە-ی برام خۆیی و خێزان و منداڵەکانی لەکالیفۆرنیاو لەشاری "ساندیاگۆ" ئەژیان. لەدێرزەمانەوە نەمدیبوو. بۆیە بە تەلەفون قسەمانکردو وەختێکمان دیاریکرد بۆ ئەوەی سەردانیان بکەم و دە دوانزە ڕۆژێک لەلایان بمێنمەوە. بە

بورجەکەو سەرکەوتینە سەرەوە. هەرە بەرزەکەیان ئەبێ لەسەر عەرد پاڵکەوی ئینجا ئەتوانی دوا نهۆمی ببینی. من بۆ خۆم لەشاری وا قەرەباڵغ و بەڕاکەڕاکەدا ئاسوودە نابم، چونکە بەردەوام ماندوویت و بەهۆی ترافیکی زۆرەوە گران ئەگەیتە شوێنەکان. لەسەر داوای من چووینە یەکێک لەکافتریا خۆشەکان. لەدواییدا تەلاری کۆمەڵی نەتەوە یەککگرتووەکانیشم بینی. شەو درەنگان گەڕاینەوە بۆ ماڵێ و لەبەرئەوەی ئەو ڕۆژە هەر بەڕێگاوە بووین و لەم چوونە دەرەوەیەشدا ئەوەندەی تر ماندوو ببووم. بۆیە وەختێ ڕاکشام یەکسەر خەوم لێکەوت .

بۆ سبەینێ ئەبوو بچین بۆ بینینی پەیکەری ئازادی، ئیتر تا ئەو شوێنەی ڕێی وشکانی بوو بەئۆتۆمبیلەکەمان چووینو لەپارکێکی گەورەدا ئۆتۆمبیلەکەمان پارککردوو بلیتی کەشیتمان بڕی و سواربووین. ئەم کەشتییانە بەقەوارە گەورەنین و مامناوەندین، هەر ئەوەندەی کەجێی سەد سەدو پەنجا کەسێکیان تێدا ببێتەوە. بەشی زۆری سەرنشینەکان ئەو گەڕیدانە بوون، کە لەولاتانی دنیاوە هاتبوون، بەڵام ژمارەی ژاپۆنییەکان لەهەمووان زۆرتر بوون. ماوەی نێوان هەردوو ڕۆخی ئەم ڕووبارە تائەوبەر، نزیکەی نیو سەعاتێک ئەخایەنێ. لەسواربوونەوە تۆ پەیکەرەکەت هەر لێدیارە تا ئەیگەیتێ، بەڵام دیارە تانزیکتربیتەوە قەوارەی پەیکەرەکە وردە وردە گەورەتر ئەبێت. پەیکەرەکە خۆی ئەپارتمانێکی بەرزە، بەشێکی کافتریاو چێشتخانەیەوو لەناوەڕاستی چیمەنو باخێکی گەورەدایە، لەبەرئەوەی ئەوکاتەی ئێمە لەوێبووین لەناوەوە خەریکی چاککردنەوەو تازەکردنەوەی بوون، بۆیە نەمانتوانی هەموو بەشەکانی ببینین. ئەو ڕۆژە تادرەنگانێ لەدەوروبەری ناوچەی پەیکەری ئازادیماینەوە. دواتر گەڕاینەوە بۆ ئەو بەرو ئەمجارەیان بەبێئەوەی بەرنامەیەکمان هەبێت بۆ خۆمان ئەسووڕاینەوە. ئەوەی لەم گەشتەی ئەمریکاداو لەنیویۆرکدا سەرنجیڕاکێشام، دووژیانی زۆر ناکۆک بەیەکبوون. لەلایەکەوە سەرمایەداری ئەو چینەی کە خاوەنی ملیارەهان و لەم لای تریشەوە ژیانی ئەو هەژارو بێکارانەی کە لەخانووی تەنەکەی ڕزیوو کەلاوەکاندا وەک ئاژەڵ ئەژیان. بۆ خۆم کەسانێکم ئەدی کەبۆرییە کۆنکرێتە گەورەکانیان لەژێر پردە گەورەکاندا کردبوو بەکولانە بۆ خۆیان! زنجیان بەتەنەکەو کارتۆن دروستکردبوو. سەرو ڕیش هاتوو، جل دڕاوو، قژ بژو چڵکن. ئەمانە بەشی زۆریان لەڕەش پێستەکان بوون. بەکورتی تۆ لەپاڵ تەلاری سەر لەئاسمان گیرکردوودا برسی و ڕەش و ڕووتیشت

ئەبینی، ئەو کوختانەت ئەبینی کەتەنانەت دەرگاو پەنجەرەیشیان نەبوو. پێموایە پێشکەوتنی گەورەی هەر وڵاتێ لەبەختەوەری مرۆڤەکانیدایە، بۆ خۆم گاڵتەم بەوەدێت پێشکەوتنی تەکنەلۆجیام بمگەیەنێتە ناو مانگو بەڵام لەسەر ئەو زەوییەی لێوەی ئەچم بۆ مانگ خەڵکی سەر نوێلکەکان بگەڕێن بۆ ئەوەی پارچە نانێکی فڕێدراویان چنگ بکەوێ !.

لە ڕووسیا و لە ئەمریکایش لەژێر سایەی سیستەمی بەناو ئیشتراکی و لەملایش لەژێر سایەی سیستەمی سەرمایەداری ئەمریکادا ئەو دیمەنانەم ئەبینی کەلەدەرەوەی تیۆری و کتێب و بانگەشەو پڕوپاگەندەی ڕاگەیاندن و تەلەفزیۆندا، ڕاستی و واقیعی ژیانی ئەو خەڵکە برسی و ڕەش و ڕووتانەیان تێئەگەیاندم. بەچاوی خۆم لەو پەناو پاسارانەدا، لەو ماڵە تەنەکەو زنجانەدا، جیاوازییەکانم ئەبینی. بەڕاستی "درۆکردن" بووە بەبەشێکی دانەبڕاو لەپێکهاتەکانی هەموو ئەو سیستەمانە، بەخۆرهەڵات و بەخۆرئاواوە. بۆ من وەک شاعیرێ پێمخۆشە وڵاتێ ببینم جوان و ڕازاوەو لەڕووی تەکنەلۆجیاو پێشکەوتنی زانیارییەوە گەیشتۆتە ئاستێکی سەرسوڕهێنەر، بەڵام لەوە گرنگتر بۆ من ئەوەیە مرۆڤی برسی و ڕووت و ڕەجاڵ و ماڵی تەنەکەی تێدا نەبینم. بۆمن ئەوە گرنگ نییە لینین و ستالین و خرۆشۆف و گۆرباچۆف چییان وتووە! ئەوەی بەلای منەوە مەسەلەی جەوهەرییە لەمەیدانی کاردا ئەو وتانە چییانکردووە؟ تا چەند لەبرسێتی و نەخۆشی و بێ ماڵی و زۆرداری و نادیموکراتی و نامرۆڤایەتییان کەمکردۆتەوە یان نەیانهێشتوون و لەناویانبردوون.!

بۆ ڕۆژی دوایی لەگەڵ کاک ئەحمەد جاف-دا بەهەمان ڕێگادا گەڕاینەوە واشنتۆن. نازانم من شاری وا بەئاپوورەو ڕەق و تەقی کۆنکرێتیم پێخۆش نییە. هەست ئەکەم تیایاندا تەنگە نەفەس ئەبم. نیویۆرک شاری کۆمپانیاو پیشەسازییە گەورەکانە. ئەگەرچی ستۆکهۆڵم پایتەختی سویدیشە، بەڵام ژمارەی هەموو دانیشتوانی ناگاتە دوو ملیۆن کەس. ئەمە جگەلەوەی هەواکەی پاکەو وەکوو هەوای لەندەن و نیویۆرک ناو دەم و کونە لووت ڕەشایی نادەنەوە، جل و کراسی سپی زۆر زوو چڵکن نابن.

کاوە-ی برام خۆیی و خێزان و منداڵەکانی لەکالیفۆرنیاو لەشاری "ساندیاگۆ" ئەژیان. لەدێرزەمانەوە نەمدیبوو. بۆیە بە تەلەفۆن قسەمانکردو وەختێکمان دیاریکرد بۆ ئەوەی سەردانیان بکەم و دە دوانزە ڕۆژێک لەلایان بمێنمەوە. بە

فرۆکە نێوان واشنتۆن و ساندیاگۆی کالیفۆرنیا پێنج سەعاتە. ئەمپەڕو ئەوپەڕی ئەمریکایە لەڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، بەفرۆکە نێوان لەندەن و بەغدا پێنج سەعات و نیوێکە. گوایە ئەمە سەفەری ناوخۆی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە!. "ژیان"ی خوشکم و "بنار"ی کوڕی لەگەڵمدا هاتن بۆ فرۆکەخانەو بەڕێیانکردم. ئەو کاتە ژیان بەتەواوی لەمێردەکەی پێشووی جیاببۆوە. بەڵام کێشەی "بنار"یان هەبوو. ئەوەیش کەوتبووە دادگاوەو کاری دادگایش لەو وڵاتانە هەویرێکەو ئاو زۆر ئەکێشێ و نابڕێتەوە.

بەڵام ئەو کاتە دادگا بڕیاری ئەوەیدابوو کەپێویستە ژیان مانگانە بناری کوڕی ببینێ و چەند ڕۆژێ لەلای بمێنێتەوە. گەیشتینە فرۆکەخانەی ساندیاگۆو، کەهاتمە دەرەوە کاوەی برام هاتبوو بەپیرمەوە .

کالیفۆرنیا؛ لەمەڵبەندە هەرە خۆشەکانی دنیایە. شاری ساندیاگۆیش لەشارە جوانەکانی ئەو هەرێمەیە. کوردە ئاوارەکان لەمشارەدا ژمارەیان کەم نەبوو، پیاوەکانیان زۆریان کاری شۆفێری تاکسییان ئەکرد. من بەر لەوەی سەفەربکەم لەڕێی کاوەوە بەو برادەرو دۆستانەی ئەوێم ڕاگەیاند بوو، کە کۆڕێکی شیعر خوێندنەوەیان بۆ ئەگێرم. لەگەڵ کاوەدا چووینەوە بۆماڵەوە. ماڵێکی ڕازاوەو جوانیان هەبوو. ئەو شەوە حەسامەوەو ئیتر بۆ سبەینێ هەندێ لەو دۆست و ناسیاوانەی ساندیاگۆ هاتن بۆ بەخێرهاتنم. کاوە لەبەر ئەوەی ئەو کاتە خۆی و "نەوجوان"ی ژنی دووکانێکیان بەڕێوە ئەبرد، نەیئەتوانی بەردەوام لەگەڵ مندابێ. بۆیە یەکێک لەهاوڕێ نزیکەکانی "کاک تیشکۆ زەندی" پێناساندام و ئیتر من بەزۆری لەگەڵ ئەودا بووم. کاک تیشکۆ گەنجێکی ڕووخۆش و کورد پەروەرو سادەبوو، ئەگەر کاوەی برایشم لەگەڵدا بوایە هەر ئەوەندەی ئەو دڵی ڕائەگرتم و بەتەنگمەوە ئەبوو. هەر لەویش کاک "فەرەیدون "م ناسی و بەتایبەتی داوەتی ماڵەوەی کردم. ئەو ڕۆژەی کۆڕەکەیشم گرت، نزیکەی (٨٠-١٠٠) کوردێ کۆببووبوونەوە. ئەم ژمارەیە بۆ ئەوێ زۆرەو خۆیان وتیان چەند سیاسەتمەدارێکی کورد ڕێیانکەوتۆتە لالی ئەوان و خەڵک هەر ئەوەندە کۆبوونەتەوە. من پەرۆشی بینینەوەی دوو کەس بووم، چونکە لەهاوڕێ و خۆشەویستە نزیکەکانم بوون و لە دێرزەمانیشەوە لەیەکتر دابڕابووین. هونەرمەند کاکە "جەمال بەختیار"و هونەرمەند و ئەکتەر کاکە "کەمال قەرەداخی ".

هەڵبەت کاک بەختیار؛ لە من گەورەتر بوو، بەڵام لە شەستەکانەوە یەکترمان ناسیبوو، بەتایبەتی سەردەمی کۆمەڵی هونەرەجوانەکان و ئینجا کۆمەڵی هونەرو ویژەی کوردیش، ڕۆژگارێ بوو ڕۆژانە یەکترمان ئەبینی. ئەو سەردەمەی کاک بەختیار وێنەی ئەکێشا، وێنەکێشەکانی شاری سلەیمانی لەپەنجەی دەست کەمتر بوون. بەکورتی کاک بەختیار لەهونەرمەندە ڕێبەرەکانی هونەری شێوەکارییە لەکوردستاندا، کە لە دوای 'حەسەن فەللاح'ەوە تەنها ئەم و هونەرمەند 'خالید سەعید' هەبوون لە شاری سلەیمانیدا خۆیان بەوێنەکێشانەوە خەریکبکەن.

کاک بەختیار؛ جگەلە وێنەکێشان، جواننووس و خۆشنووسیش بوو، لەسەرەتای پەنجاکانەوە تاشەستەکان بەشێک لەتابلۆکانی سەرجامخانەی کۆگا و دوکان و فەرمانگە و ئوتێلەکان ئەو ئەینووسین. لەڕووی بیرکردنەوەیشەوە کاک بەختیار کوردستانی بوو، لە ئەندامە کۆنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانیش بوو. هەمیشەیش هەر لات و قەرزاربوو. وەختێکیش قسەی ئەکرد هەندێجار زمانی ئەیگرت. زۆرجار دەست و پەنجەی پاشماوەی ئەو بۆیە و ڕەنگانەی پێوە ئەمایەوە کە لەوەختی کاردا تێوەیان چووبوو. پیاوێکی سورو سپی و قژی درێژ ئەکردەوەو بۆ دواوە هەڵیئەدایەوە. لەدامەزرێنەرانی کۆمەڵی هونەرە جوانەکان و کۆمەڵی هونەر و وێژەی کوردی بوو. یەکترمان بینی و داوەتی ماڵەوەیکردم. دووسێ تابلۆی خۆی بەدیواری ژوورەکەیدا هەڵواسیبوو. بەساڵدا چووبوو. کوڕو کچەکانی گەورە بووبوون. شەوێکیشیان بەسێ قۆڵی خۆی و من و کوڕە گەورەکەی چووینە دەرەوە. بردمیان بۆ سەماگەیەکی خۆش، تا شەو درەنگان ماینەوە، بەیادەوەرییەکانی سلەیمانیدا چووینەوە. تا ئەو کاتەیش ئەو هەر قسەخۆشەکانی 'خاڵە ڕەجەب'ی ئەگێڕایەوەو باسی هونەرمەندەکانی تری ئەکرد. بەتایبەتی 'ڕەفیق چالاک'و شانۆنامەی 'پیسکەی تەڕپیر' و هەروەها هونەرمەندی موزیکژەن'قادر دیلان' و تیپی مەولەویی ئەوساو زۆر یادەوەری تر.

هەواڵی کاک 'کەمال قەرەداخی'م لێپرسی و وتی: (کەمال ئێستا لە 'لۆس ئەنجلسە'و ژنەکەی ئێرانی- فارسەو نایشزانم بۆ کاری هونەری شانۆ، سینەما، چی ئەکات و چیناکات، چونکە دەمێکە یەکترمان نەدیوە.

کالیفۆرنیا؛ نموونەی جوانی و پاکییە، بەشی هەرە زۆری دەوڵەمەندو سەرمایەدارە گەورەکان لەم هەرێمەدا ئەژین، لەبەرئەوە تەلارو خانووەکان لەسەر تازەترین تەرزی بیناکاری دروستکراون. هیچ زنج و کوخت و کەلاوەیەکم بەرچاو نەکەوت. یەکێک لەو شوێنە گرنگانەی لەم سەفەرەدا بینیم، "هۆلیوود" بوو. کاوەی برام لەگەڵ خۆیدا بردمی، هەر گەڕیدەیەک ڕێی بکەوێتە کالیفۆرنیا ناکرێ سەر لەهۆلیوود؛ شاری هونەرو سینەماو نیشتمانی فیلمە گەورەکانو یادگاری ئەکتەرە هەرە بەناوبانگەکانی دنیا نەدات، بۆچونە ژوورەوە ئەبێ ڕیزبگریت. ڕیزەکانیش بەردەوام درێژو بڕانەوەیان بۆ نییە. کاوە چووە ڕیزەوەو نزیکەی سەعاتێکی خایاند تا نۆرەمان هات و بلیتمان بڕی و لەدەروازە گەورەکەیەوە چووینە ناوەوە. بۆ تەماشاکردنیش ئەوە نییە خۆت بەپێ بڕۆیت و بگەڕێیت. بەڵکوو واگۆنی نزم نزم و چوار دەورکراوە، ئامادەکراون و سەر ئەکەوێتە سەرەوەو لەشوێنی خۆتا دائەنیشیت. هەر واگۆنێک چل پەنجا کەسێک ئەگرێت و ڕێبەرێکیشی لەگەڵدایە و دیمەن بەدیمەن و شوێن بەشوێن شرۆڤە ئەکات، تاکۆتایی و گەڕانەوە بۆ هەمان ئەو شوێنەی لێوەی هاتووین. ڕۆیشتنی واگۆنەکان بەهێلی ئاسندا زۆر لەسەرخۆیە، بۆ ئەوەی بەچاکی دیمەنەکان ببینی. ئاسەوارو دیکۆری کۆمەڵێ فیلمی بەناوبانگ وەکوو

خۆی چۆن بوون هێشتوویاننەتەوە. بۆ نموونە دیکۆرو دیمەنی هەندێ لەفیلمەکانی "هیچکۆک" یان "زۆربا"ی یۆنانی، یان بەشێک لەدیمەنەکانی فیلمی "پیرەمێرد و زەریا" هتد... تۆ لەم گەشتەدا تێئەگەیت، کە فێڵە سینەماییەکان چۆن ئەکرێن، بۆ نموونە ئێمە گەیشتینە شوێنێک، لافاوو بوومەلەرزەی سینەماییان نیشاندایـن، پەنجەیان نا بەدوگمەیەکداو لەپڕ لافاوێک دروستبوو، بەسەدان درەختی لەبەردەمتا ڕائەماڵی، یان بومەلەرزەکە چۆن دەیان واگۆنی شەمەندۆفێری بەیەکدا ئەداو، ئەرز ئەقڵیشایەوەو، ئەبووە ڕۆژی حەشر. کەچی بەجووڵەیەکی تر، لافاو نەئەماو، درەختەکان هەموو ئەچوونەوە شوێنی خۆیان و، هەروەها شەمەندۆفێرەکان ئەچوونەوە سەر هێڵی ئاسنی خۆیان، وەکوو هیچ ڕوویننەدابێ وابوو. تۆ تەکنیکی سینەمایی لەبەرزترین ئاستی هونەری فیلمدا ئەبینی. یان ئەو فیلمانەی لەبارەی ئەستێرەکانو درێژترین تونێلو ترسناکترین دیمەن بەوێنەکێشراونو لەڕاستیدا بوونیان نییە. یان بۆ نموونە فڕینی پاسکیلێ بەئاسماندا، پایسکیلەکە بەبەرزاییەوە لەڕێی قوڵێکی مەعدەنییەوە بەدیوارێکەوە چەسپکراوە تۆ سواری ئەبی و پایدەری خۆت لێئەدەیت و هیچی تر. بەلام وەختێ ئەبێتە فیلم هیچ شتێ لە تووە دیارنییە تەنها پایسکیلێکەو بەئاسماندا ئەفڕێ!. یان ئەم ئاگرانەی بەر ئەبنە خانوو ماڵ و کڵپەیان ئەگەنە ئاسمان، هەر لەبەرچاوی خۆت لەچەند ساتێکدا ئەیکەنو بەهەمانشێوەیش دایئەمرکێننەوە. لەم گەشتە سەیرەدا، لەپێچێکدا وەختێکمانزانی گۆریللایەکی ڕەشی گەورە هەستایە سەرپێو دەستیکرد بەبۆرەبۆڕو هەر ئەوە نەبوو نەیەتە ناو واگۆنەکەوە. لەپڕیش ڕایانگرتو گەڕایەوە دواوە، هیچ نەبوو، جگە لە گۆریللایەکی پلاستیکی ڕەشی گەورەی دەستکردی مرۆڤ خۆی. ئەو کۆشکە گەورانەی ئێمە لەفیلمەکاندا ئەیانبینین هەندێکیان هەر بەکارتۆن دروستکراون و گەورە ئەکرێن. یان خانوویەک هەر دیکۆرەو بەلام بەتەنها ڕووکارەکەی دروستکرداوەو ئیتر هەموولاکانی تری بەرەڵلایەو دەرهێنەر تەنها لەیەک گۆشەوە ئەو تەلارەی نیشانی ئێمەداوە. هەر لەم گەشتەدا بەنێو شاری دیکۆری "کاوبۆیەکاندا" تێپەڕین، خانووی نزم و جادەیەکی درێژ و لەپڕێکدا لەنێوان "کوڕە ئازاکەو"

بەرامبەرەکەیدا ئەبێتە شەڕە دەمانچەو فەرتەنەو هەردوو لاشیپانی دەرگای مەیخانە ئەکرێتەوەو ئەبێتە جەنگی مەغلوبە، هەندێ لەم دیمەنانە لەبەرچاوی خۆت بەزیندوویی نیشان ئەدەنەوە. وەک ئەوەی چۆن لەسەرەتادا فیلمەکەیان دروستکردووە. بردیانینە عەمباری ئەو جل و بەرگانەی، کە لەفیلمەکاندا بەکارهاتوون و لەلایەن ئەکتەرەکانەوە لەبەرکراون. لەجلوبەرگی هەرە کۆنی ئادمیزادەوە تا تازەترین شێوەی. جلوبەرگی قەیسەرو پادشاو ئیمپراتۆرەکان. شاژنەکان. جلوبەرگی کۆیلەکان، ئاخر مرۆڤ لەم شوێنانەدا تێئەگات شارستانێتی و هونەری بەرزی سینەمایی لەئەمریکادا گەیشتۆتە کوێ. بینینی هونەری بەرزی سینەمایی لەئەمریکادا گەشتۆتە کوێ. بینینی شاری هۆلیۆدو ئەم گەشتە بۆ من، ئەزموونێکی تازە بوو کە، لەوەوبەر زانیارییەکی ئەوتۆم لەم بارەیەوە نەبوو. بەداخەوە لەبەرئەوەی من بیرەوەرییەکانی خۆم لەکاتی خۆیاندا ڕۆژانە نەنووسیوە، دڵنیام زۆر شتم لەیادکردووە یان لە بیرمچوونەتەوە .

نەک هەر دیمەن و بیرەوەرییەکانی ئەم گەشتە، بەڵکوو گەلێ لەیادەوەرییەکانی ڕابوردووی دوورتریش، بەتایبەتی ناوی شارو گوندو یان ناوی ئەو ژن و پیاوانەی، کە لە چەندین بۆنەو کۆڕو کۆبوونەوەدا ناسیومن، یان ساڵ و مانگ و ڕۆژی ئەو ڕووداوانەی، کە نەئەبوو فەرامۆشیان بکەم و لەبیرم بچنەوەو لەوەختێکی وەک ئێستادا دەستیان بۆ بدەم بەدەستدا! بەڵام هەر چۆنێک بێ، وەک سەرئەنجام نووسینەوەی ئەم یادداشتانەم بەباشترزانی وەک لەوەی، کە هەر نەیاننووسم و لەگەڵ خۆمدا بیانبەمە ژێر گڵەوە!

لەم گەشتەی کالیفۆرنیادا، هەر بەئۆتۆمبێل چووین بۆ شاری "لۆس ئەنجلۆس"، کە چوار پێنج سەعاتێ لەشاری ساندیاگۆوە دوورە. دیارە ئەمشارە لەشارە خۆشەکانی دنیایە، بەڵام من حەز لەشاری بەئاپوورەو قەرەباڵغ و هەوا خنکاو ناکەم. بیرمە هەر لەناو ئەمشارەدا، ئەو وەختەی ویستمان بچین بۆ ماڵی کاک "کەمال قەرەداخی" لەو شوێنەی لێی بووین لەبەر ترافیکی هاتوچۆ، تاگەیشتینە ئەوێ سێ سەعات و نیومان پێچوو! واتە لەماڵێکەوە بۆ ماڵێکی تر!. دوایئەو

هەموو ساڵە بەدیداری کاک کەمال قەرەداخی گەیشتمەوە. ئەوکاتە هەر خۆی لەماڵەوە بوو. وەک بێتەوە بیرم هاوسەرەکەی بەسەفەر گەڕابۆوە بۆ ئێران .

کاک کەمال؛ هەر لەناو خەونەکانی خۆیدا ئەژیا! بەڵام دیارە ئەرکی ژیان و بژێوی، لەشاری واگەورەدا، چی بۆ ئەو خەونانە ئەهێڵێتەوە!. ئەمە جگەلەوەی تەمەنیش تابەرەو ژوورتر هەڵکشێ، هاتنەدی خەونەکان گرانتر ئەبن، ئەگەر نەبنە مەحاڵ. لەگەڵ کاک کەمالدا چووینەوە ژێر ساباتی بیرەوەرییەکان. بەدرێژی باسی نۆی حوزەیرانی ساڵی (١٩٦٣) مان کرد. ئەو ڕۆژەی لەبەیانییەوە تاشەو درەنگ لەماڵی ئەوان بووم و چاوەڕێی ئەوەمانئەکرد کەی سەربازەکانی "زەعیم سدیق" ئەدەن بەسەرماندا و ئەمانگرن و ئەمانبەن .

بینینی لۆس ئەنجلۆس؛ بۆ من خۆشییەکەی لەوەدابوو، کە یەکێک لە کۆنترین و نزیکترین هاوڕێی قۆناغێکی تەمەنی خۆم لەوێ بینیەوە .!

لەمەکسیک نە بکەی نە بخۆی؛
تەماشای سای گەردن بکەی!

ڕۆژێک کاک تیشکۆ زەندی وتی: ئەمڕۆ ئەچین بۆ شارێک لەولاتی مەکسیک و پەساپۆرتەکەت لەگەڵ خۆت بێنە. من لای خۆمەوە مەزەندەی ئەوەم ئەکرد، کە ئەبێ ڕێگاکەی بەلایەنی کەمەوە چەند سەعاتێ بخایەنێ. نەمزانی زۆر نزیکین‌و نیو سەعات ناخایەنێ! هەروایش بوو، بیست دەقیقەی نەخایاند، چووینە بەردەمی پۆلیسەکانی سەر سنوورو پەساپۆرتەکانیان کۆنترۆڵکردین‌و چووینە ناو مەکسیکەوە .

دوو دنیای جیاواز، ئەوەندە جیاواز کەهیچ شتێ بەیەکییانەوە نەبەستێتەوە نە شەقامیان و نەشاریان و نە خەڵکیان، نەخانوویان و نە دووکانەکانیان و نەبازاڕیان و نە جل و بەرگیان و نە پاک و خاوێنییان. من یەکسەر دەمزانی فرێیانداوەمەتەوە ناو یەکێک لەشارەکانی ڕۆژهەلات. یان کوردستان! وەک ئەوەی لەکەرکوک بم یان لەهەولێر و سلەیمانی و سنە. لەسەر شۆستەکان گۆشتیان ئەبرژان و دووکەڵ ئەچوو بەئاسماندا. لەسەر عەرەبانە دەستگێڕەکان لەتاوەی گەورەدا ماسییان سوور ئەکردەوە، یان قرەقرِی خەڵکی و هاوار هاوارو فیکەلێدان! دوکانەکان شت‌و مەکیان هێنابووە دەرەوەو ڕیزیانکردبوون. شەربەتی دەستگێڕ، بۆنی زەردەچەوەو دارچینی، پەڕینەوەی خەڵکی بەهەڕەمەکی لەمبەر بۆ ئەوبەری شەقامەکان، کۆمەڵبوونی خەڵکی لەشوێنێکدا، قاقای پێکەنین .

پۆلیسی هاتوچۆی بێباک و خەیاڵ ڕۆیشتوو، سواڵکەر، لەپڕێکدا پشیلەیەک لەژێر عەرەبانەیەکەوە دەرئەپەڕێ. یان لەناکاو خانمێک وەرئەچەرخایەوەو پیاوێکی دائەشۆرێ. کۆنترین مۆدێلی ئۆتۆمبێل و تازەترینیان. هۆرنەکانیان. ئەوەی ڕاستیبێ، من بۆ خۆم، بەدڵ پێمخۆش بوو هەندێ لەو دیمەنانەم ببینییەوە بەتایبەتی وەجاخی ئاگر و گۆشت برژاندن. بۆیە یەکسەر داوام لەکاک زەند کرد و پێموت: (من ئەمەوێ دووشیش گۆشتی برژاو بخۆم). هەرچەند پێیوتم: (ئەم خواردنانە پاکنین، بەڵام تازە نەوسی گۆشتی برژاو خواردن لەکەللەی دابووم). هەروایشمکردوو چووینە لای یەکێکیانو دوو ششیش گۆشتی ناسکی بەرخیان بۆ لێدامو هەر لەوێدا بەسەرپێوە خواردم و ئینجا ڕۆیشتین. گازینۆو کافتریاکانی سەرزەریا یاخود ئۆقیانووسی ئارام، شوێنی حەوانەوەو ڕابواردنی هەموو ئەو گەڕیدانەن کەڕوو ئەکەنە باکووری مەکسیک. ئەم هاوینە هەوارانە هەموو لەڕۆخی ئۆقیانوسدا و بەدرێژایی ئەو کەنداوانە دروستکراونو شەوانە تادرەنگان جێی سەماو گۆرانی و موزیکژەنینن. تیپی گەڕۆکی موزیکی میللی مەکسیکی، هەموو ئەو سەیرانگایانە بەسەر ئەکەنەوە. گرانترین خواردەمەنیش خواردنە زەریاییەکانن. ئەوەی ڕاستیبێ من حەزم لێنەئەکردن، ئەگەرچی ئەمزانی زۆر لەخواردنەکانی ئێمە پاکترن. ئەوەیش هەر ڕاهاتنە، کە حەزلێکردن و نەکردن دیاری ئەکات .

کاک تیشکۆ زەند لەوێ هاوڕێ و ناسیاوی مەکسیکی هەبوو، دوو ڕۆژیان سەر لەئێواران لەگەڵ ئەواندا ئەچووینە دەرەوە، شۆخێکیان تێدابوو، بەدەردی حیکایەتخوانەکان ئەڵێن "نەبکەی نەبخۆی تەماشای سای گەردنی بکەی" ئەسمەرێکی خوێن گەرمی کەڵەگەتی چاوگەشی قژ ڕەش. هەر ئەتوت کیلۆباترایەو زیندوو بۆتەوە. بەڵام ئەم کیلۆباترایەکی سادەو ساکاربوو. ڕووی خۆش و دەم بە پێکەنین. لە هەمانکاتدا سەنگین و سەلاریش بوو. گوڵەباخ و ئەستێرەو شیعر و تاڤگەو هەڵووژەو خەون و مانگە شەوی سەر مێزەکەمان بوو. هەرچەند سەرنجم لێئەدا، خەوشێکم تێدا نەئەدی!. هەندێ قسەی لەشیعر چووی منیان بۆ وەرگێڕا. زۆری پێخۆشبوو، لەوەڵامدا وتی: (من سوپاسی ئەم شاعیرە ئەکەم، بەڵام بەداخەوە من هاوڕێی خۆم هەیە). منیش لەوەڵامدا وتم: (ئەوە گرنگ نییەو من بەتەمای هیچ نیم، ئەوەنەبێت بەردەوام تەماشات بکەم). لەڕاستیدا ئەم وەڵامەی من دیپلۆماسییانە بوو. ئەگینا لەناوەوە بۆی ئەسووتام. لەهەمانکاتدا بەزەییم بەتەمەنی خۆمدا ئەهاتەوە، کە سەربەرەو خوارەو تازە ئیتر

نابێ بەتەمای ئەوەبم ئەم جوانانە ئاوڕ لە ئێمەومانان بدەنەوە. بیرمکردەوە: "مردن ئاساییە، بەڵام مردنی ڕاستەقینە لەبەساڵاچوون و پیریتیدا دێت!". ئەو کاتەی جوانێکی وا، وەختێ تۆ لەتەمەنی پەنجاساڵیدا ئەبینێ، هەرچیەک بێت، بەڵام تۆ وەک ئاگردانێکی ساردەوە بوو ئەبینێ. ئەچیتە پەراوێزی دڵیەوە. ئاخ! چەند درەنگە، بۆ من، بۆ ئارەزووەکانم. باشە باپیریتیش بێت، بەڵام بەسەریەکەوە بهاتایە. لەش و دڵیش. کارەساتەکە لەوەدایە لەش پیر ئەبێ، بەڵام دڵ هەرگەنجە. ئیتر لێرەوە خەزان دێت. لێرەوە گریانێک لەشێوەی لاواندنەوەدا هەست پێئەکەیت. تۆ شەست ساڵیت و بەڵام دڵت بیست ساڵە. چی ئەکەیت؟! هیچ لەوەزیاتر، کە بۆ خۆت بڕۆ هەر شیعر بنووسە! ڕەنگە دڵی شەست ساڵ و جەستەی بیست ساڵیش هەبێ، بەڵام شۆخێکی وا هەر تەماشای ئەو ئەکات و بەتەمای ئەوە، نەک من !.

دوو ئێوارەی جوان بوو، بەڵام بۆ من مایەی داخیش بوو! چونکە نامەوێ درۆلەگەڵ خۆم و ئێوەیشدا بکەم و ئەو شتەی حەزی لێئەکەین، حەزئەکەین دەستمان کەوێت جا ئیتر هەرچیەک بێت.

ئەو دە دوانزە ڕۆژەی لەکالیفۆرنیا بووم دووسێجار چوومەوە سەر نووسینی شیعرەکانی "دەربەندی پەپوولە". دوایئەوەی لەم پێداچوونەوەیەدا دووسێ لاپەڕەم دڕاند! ئینجا چەند لاپەڕەیەکی تازەم نووسیی، بەڵام هەستمکرد ئەوەی لەناوەوەمدا پەنگیان خواردۆتەوە زۆر بەگینگڵترن لەوەی کە خستوومنەتە سەرکاغەز، بۆیە لای خۆمەوە بڕیارمدا هەرکاتێ گەڕامەوە بۆ ستۆکهۆڵم، دانیشتنەکانم درێژتربکەمەوە. واتە لەجیاتی ئەوەی هەرجارێک سێ سەعات خەریکم، بیانکەم بەشەش سەعات. چونکە دابڕان و پچڕانی زۆریش ئەبنە هۆی "خاوبوونەوەیەک"، کەوەک سەرئەنجام "وەستان و چەقینیشیان" لەدوایە !

من؛ هەندێجار یەک لاپەڕەی فۆلسکاب بەچوار پێنج سەعات ئەنووسم. بەڵام چۆن؟! یەکەم ڕەشنووس ئەو لووزەوەیە، کەدێت و خۆیشم بەریم بۆ ناگیرێ. لەدووەمدا سەرنج لەئیقاع و ئاهەنگی ڕستەکان ئەدەم. لەسێهەمدا هەوڵئەدەم شەن و کەوی وشەکان بکەم. لەچوارەم و پێنجەمدا بەشوێن کەلەبەرەکاندا ئەگەڕێم، لەکوێدان و بۆچی. ئەو ڕەشنووسانە ئەدڕێنم. تادوا ڕەشنووسی لاپەڕەکەو ئەیخەمەلاوە. بەڵام دیسان دوای تەواوبوونی هەموو کارەکە یەک نووسینەوەی سەرتاسەرم ئەمێنێ، کە ئینجا ئیتر ئەمەیان ئەبێتە دوا ڕەشنووس

و ئامادە ئەبێ بۆ چاپکردن. من لەسەر کاغەزی سپی بێ خەت ئەنووسم. ناتوانم لەسەر کاغەزێ بنووسم خەتداربێ. چونکە وائەزانم ئەو خەتانە ڕێم لێئەگرن! لەسەر پارچە کاغەزی بچووکیش نانووسم. ئەگەر چەند دێڕێکیش بنووسم هەرئەبێ لەسەر یەک لاپەڕەبێت، لەڕەشنووسی یەکەمدا، ئەو پارچەیەی یان ئەو کۆپلەیەی بەدڵم بوو نیشانەی (√) لێئەدەمو ئەگەر نیوە ناچڵیش بوو نیشانەی(√) لێئەدەم بۆ ئەوەی، کە لەدواییدا چوومەوە سەریان بزانم چیئەکەم و کام شوێن پێویستی زیاتری بەپیاداچوونەوەو لابردن و یان زیادکردن و مۆنتاژی تر هەیە. زووتر وانەبووم، پێداچوونەوەم کەمتر بوو. بە ئەزموونی خۆم گەیشتوومەتە ئەو بڕوایەی، کە شاعیرو نووسەر هەتا ڕەشنووسیان زیاتربێ و پێداچوونەوەیان زۆرتربێ، کارەکانیان کۆکتر ئەبێ. هەڵبەت لەئێستادا کۆمپیوتەر ئەم ئیشانەی ئاسانتر کردووە .

ساڵی (١٩٨٨) لەسوید یەکەمین خولی فێربوونی کۆمپیوتەرم خوێند، بەلام حەزم لێنەئەکرد. ئەگەر بەدەست خەتی خۆم نەبێ، ناتوانم هیچ بنووسم، ئەگەر بیشینووسم وائەزانم یەکێکی تر لەگەڵمایەو بۆم ئەنووسێ و خۆم نیم! ڕەنگە لەدنیای ئەمڕۆدا ئەوانەی وەک من بەقەڵەمەکەی خۆیان نەبێ نەتوانن بنووسن، هەر زۆر کەمبن. هەڵبەت کۆمپیوتەر وەختێکی زۆرت بۆ ئەگەڕێنێتەوە. ئەمە ڕاستە، بەلام ڕاهاتنیشە. بەم دواییەیش خۆم ڕاهێناوە بەقەڵەمی ڕەساس بنووسمو لاستیکی خەتکوژانەوەیش و قەڵەم دادانیش لەلای خۆمەوە دانێم. ڕەنگە ئیتر هەروا بکەم! قسە قسە ڕائەکێشێ، من پیاوێکم زۆرجار لاوبالی و بیرم پەرتە، زۆرجار جانتاو دەفتەرو کتێب و ڕۆژنامەم بزرکردووە. لەناوەڕاستی حەفتاکانداو ئەوکاتەی لەبەغدادییەوە ئەچووم بۆ بەغداو باری دەروونیم ئاڵۆزو چارەنووسم لەگێژاوێکدا بوو، واتە هەر لەو سەردەمەدا، کە قەسیدەی 'کۆچ'م تیا نووسی. ڕۆژگارێ بوو، کەتەنها شیعر هاوڕێم بوو، کەس لەکەس دڵنیانەبوو. باوک چاڵی بۆ کوڕی خۆی هەڵئەکەند. بیرمە: دەفتەرێ شیعری بڵاونەکراوەم لەگەڵ خۆمدا برد بۆ بەغدا، بەشێکیانم بۆ هاوڕێ نزیکەکانم خوێندەوە، هەر لەو سەفەرەدا، دەفتەرەکەم بزرکرد. لێمکەوت؟!

لەشوێنێک بەجێمهێشت؟! بردیان؟! نازانم. نەمئەزانی چیبکەم هەر شوێنی چووبووم سۆراخم کردەوە، بەڵام ئێستاو ئەوسایش دەستم نەکەوتەوە. هیچ ڕەشنووسێکی تریشم نەبوو. بۆ خۆیشم یەکێکم لەوکەسانەی شیعری خۆم لەبەر ناکەم. کۆمەڵێ شیعری جوان بوون لەسەرەتای شیعرێکیاندا نووسیبووم "سلەیمانی بیرم ئەکا". تەواوی شیعرەکان غوربەتیان لێئەچۆڕایەوە، لەو شیعرانەبوون، کە بەتیلماسکەکانی ژان و هەناسەی تەنیایی نووسرابوون. بۆیە بزربوونیان و لەناوچوونیان وەک فەوت و تیاچوونی کۆمەڵێ لەهاوڕێ و خۆشەویستەکانم وابوون و بیرناچنەوە!

ئەگەر گەڕامەوە ستۆکهۆڵم چی بکەم؟
پرسیارێکی جدی لەخۆم!..

وەختێ گەڕامەوە ستۆكهۆڵم، چەند نامەیەكم لەسەقزو سلەیمانییەوە بۆ هاتبوو. یەكێك لەو نامانە، نامەی بێگەردی هاوڕێم بوو، كە تیایدا بەئاماژەو ناڕاستەوخۆ خراپی بارودۆخەكەی بۆ نووسیبووم، بەڵام ئەوەیشی بۆ نووسیبووم كەپارێزگای ژمارە نۆزدەی عێراق هەرگیز نادەینەوە بەكوەیت. هەموو هەواڵەكانی تری دنیای داپۆشیبوو. سەدام سوربوو لەسەرئەوەی لەو كەلی عروبەیە نایەتە خوارەوەو ناوبژیكەران نائومێد ببوون. ئەمریكایش سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەگەر لەماوەی دیاریكراودا نەچێتە دەرەوە، بەشەق ئەیكاتە دەرەوە. هەموو هیوایەكی ئێمەشی بەو شەقەوە بەسترابوو. زوربەی هەرە زۆری چاودێرە سیاسییەكان وای بۆ ئەچوون، كە سەدام لەدواساتدا پەشیمان ئەبێتەوەو مل ئەدات.

شەوی (١٦-١٩٩١/١/١٧) دوای نیوەشەو، من نوستبووم كە زەنگی تەلەفۆن خەبەری كردمەوە. هاوڕێم "تەها باراوی" بوو هاواریكرد: (بیخەرە سەر .C. N .Nله بەغدا درا !). یەكێك بوو لەمژدە هەرە خۆشەكانی ژیانم، مەگەر پێش ئەوە هەر مژدەی دروستبوونەوەی موقاوەمەتو هەڵۆ سوورەكانی شاخ ئەوەندە دڵیان خۆشكردبم!. ئیتر بەرم تەلەفزیۆن گرتو بەرمنەدا، شوێنی نانخواردنیشم گواستەوە بۆ بەر ئەو. دیارە هەموو جەنگێك ماڵوێرانی لەدوایەو بێ گوناهی

زۆریش تیا ئەچن، خەڵکی مەدەنی زۆر پێوە ئەبێ و ئەبێ باجی ملهوڕێتی و دڕندایەتی دیکتاتۆر بدەن. بەڵام هەر ئەم گورزانەیشە چاری دێوو درنجێکی وەک سەدام ئەکات و ڕەنگە بیکات بەتەیرە ماقولەکەی مەلای مەزبوورە!

ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لەپێشڕەویدا بوون "شوارزکۆف"ی زەواڵ و مێملەکەی سەدام پاڵەوانی مەیدان بوو. سوپاکانی سەدام و پاسەوانانی "بەوابەی شەرقی" و قەعقاعەکانی قادسییە، کونە مشکیان لێببوو بەقەیسەری، لە تەلەفزیۆندا ئەمانبینین، چەند زەلیل و ڕسوا بوونو چۆن چۆنی دائەنەوینەوەو پۆستاڵی سەربازە ئەمریکییەکانیان ماچ ئەکرد. ئەوەتا ڕۆژان ڕۆژی لەدوایە، هەر ئەم سوپایانەیش بوون لەکوردستانداو لەئەنفالەکانی (١٩٨٨)دا تەڕووشکیان پێکەوە ئەسووتان وژن و منداڵ و پیرەمێردی پەککەوتەیان ئەکوشتو لەسەر لاشەکانیان ئاهەنگی سەرکەوتنی قادسییەیان ئەگێڕا. هەر ئەمان بوون، چوارپێنج هەزار گوندی ولاتەکەی منیان بەتوورەکە بێژایەوە. بەڵام ئەوەتا نەمردم و بەچاوی خۆم ئەبینم، چۆن بەچۆکدا هاتوون و بوون بەجرجی بیابان و، کونێک نییە خۆیانی تێدا بشارنەوە!

ڕووداوەکان چون شەپۆلەکانی دەریا بەتەوژم و خێرا تێئەپەڕین. هەموومان چاوەڕوانی ڕامالینی ڕژێمی دیکتاتۆر و گۆڕان و وەرچەرخانی گەورەی سیاسی بووین. بەپێی ئەو هەواڵانەی لە کوردستانەوە ئەگەیشتنە لامان، دیوارەکانی قەلای ترس و بێدەنگیی ڕووخابوون، هێزی پێشمەرگەی کوردستان خەریکی خۆڕێکخستنەوە بوون. سەرەک جاشەکان لەژێرەوە کەوتبوونە پەیوەندیکردن و خۆنزیک خستنەوە، لەسەرکردە سیاسییەکانی کورد. تەبایی نێوان هێزە جۆراوجۆرەکانی ناو شۆڕش باشتر ببوو. لەو ڕۆژە کوردستانم بەجێشهێتبوو، ئەوە یەکەمجار بوو هەستبکەم لەئاسۆدا ڕووناکییەک بۆ دوارۆژ بەدیبێئەکەم. یەکەمجار بوو ئومێدم بەگەڕانەوە بۆ کوردستان لادروستبێ و ڕۆژانە بیریلێبکەمەوەو تەنانەت بەخەیاڵ پلانەکانیشی بۆ دابڕێژمو یەکەمجار بوو پرسیارێکی وا جیدی لەخۆمبکەم، ئەگەر گەڕامەوە لەولات چیبکەم؟! یان ئەتوانم چیبکەم؟! ئەم هیوایە گوڕوتینێکی تازەتری پێبەخشیم، بۆ ئەوەی وەختێکی زۆرتر بۆ تەواوکردنی "دەربەندی پەپوولە" تەرخانبکەم. ڕۆژی واهەبوو لەبەیانی سەعات هەشتەوە لەماڵ ئەچوومە دەرەوە بۆ ناو ستۆکهۆڵم و ڕەشنووسەکانم لەگەڵ خۆمدا ئەبردوو چایخانەم ئەدۆزییەوەو دائەنیشتم و ئەمنووسی. ئەگەر چایخانەیک لێم وەڕس بوایە، هەڵئەسام و چایخانەو کافتریایەکی ترم

ئەدۆزییەوەو بەو جۆرە تائێوارە نەئەگەڕامەوە بۆ ماڵەوە. شەویشم بۆ سەیرکردنی تەلەفزیۆن و سۆراخی هەواڵ و دەنگوباس دانابوو. لەو دووسی مانگەدا ئیشی شەش حەوت مانگم کرد. من یەکێک لەو خاسییەتانەی تیامدایەو هەتا ئیستەیش هەروام و بەلایەنێکی پۆزەتیفی خۆمی لەقەڵم ئەدەم. ئەوەیە: دەستمدایە هەر کارێک و سەرەتاییم نووسی و چوومە ناوییەوە، ئیتر نایەمە دەرەوە، تا تەواوی نەکەم. هەموو شتێکی تر تەنانەت خوێندنەوەیش ئەخەمەلاوە، پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانم کەم ئەکەمەوە. بەکورتی هەموو مەراقێکم لەوکارەدا کۆئەبێتەوە. بەجۆرێک ئیتر بیرم پەرت پەرت نابێ و ئەو بەرهەمە داگیرم ئەکات. ئەوکاتەی نەیشنووسم لەناوخۆمدا هەر ئەنووسم.
ڕێکەوتووە لە بەیانییەوە تائێوارەو لەو "حاڵگرتنانەدا" برسێتیم بیرچۆتەوەو ئەگەر لەماڵەوە بووبم ژەمە خواردنیان بۆ داناوم و ساردو سڕبۆتەوەو دەستم بۆ نەبردووەو خەریکی عەشقەکەی خۆم بووم. من ئەگەر لەماڵەوە بنووسم. هەمیشە هەر لەسەر مێزی نانخواردنی موبەق دائەنیشم، ئەخوێنمەوەو ئەنووسم. گرنگ ئەوەیە من قاوەو چاو جگەرەم لێنەبڕێ. یەکێک لەخووەکانی تریشم ئەوەیە لەکاتی نووسیندا، ئەوکاتانەی ئەوەستم و بیرئەکەمەوەو خەیاڵم لەفڕیندایە، مووکێشەکەم لاوە بێتو خەریکی دەرکێشانی مووە زیادەکانی دەموچاوم بم، بەبێئەوەی پێویستم بەوە بێت تەماشای ئاوێنە بکەم. لەهەر شوێنێکیش بم، من ئەبێ زوو زوو تەپڵەکەکەی بەردەمم بڕێژم، لەبەرئەوەی هەمیشە سەبەتەیەک داوائەکەم یان ئەگەر لەکافتریاو چایخانەبم، خۆم هەڵئەسمو قنجکە جگەرەکانو پارچە کاغەزی دڕاوی ناو تەپڵەکەکە ئەڕێژمە ناو نزیکترین سەبەتەو سەتڵی بۆ تەرخانکراوەوە. ئەم خووەم هەر لەکاتی نووسیندا نییە، بەڵکوو لەهەموو کاتێکدایە. لاموایە یەکێک لەهۆیەکانی ئەوەبێت جگە لەپاک و خاوێنی، نەزانم چەند جگەرەم کێشاوەو خۆم هەڵئەخەڵەتێنم، هەروەک نەعامە چۆن لەکاتی مەترسیدا سەری خۆی ئەکا بەژێر خۆڵەوەو وائەزانێ، کە ئەم کەسی نەبینی ئیتر کەسیش نایبینێ و وەختێ بەخۆی ئەزانێ تووشبووە!
ڕێکەوتووە لەمجۆرە حاڵەتانەدا لەپڕ میوانێک هاتووەو ناچار بووم بچم لای دابنیشم، بەلام نەزانیومە چی وتووەو نەخۆیشم زانیومە چی ئەڵێم، وەک لەسەر ئاگربم وابووە. ئەگەر لەوکاتانەیشدا وێنەیەک یان ڕستەیەکم بەخەیاڵدا هاتبێ هەستاوم و چووم نووسیومەو ئینجا گەڕاومەتەوە بۆلای میوانەکە. ئەم مەراقانە لەوەختی نووستن و خەوبینینیشدا وازیان لێنەهێناوم. خەوم بینیوە،

ڕەشنووسەکانم بابردوونی و منیش دوایان کەوتووم. یان ئاگریان تێبەربووەو منیش بەدیاریانەوە گریاوم. دووسێ جارێکیش ڕوویداوە لەخەودا ڕستەیەک یان وێنەیەکی شیعریم نووسیوەو لەپڕێکدا لەخەوەکەدا قەڵەمەکە مەرەکەبی تیا نەماوەو داچڵەکیوم و ئەوەی لەبیرما ماوەتەوە، هەڵساوم و خستومەتە سەر کاغەز .

بۆ نموونە دێڕێک هەیە لەقەسیدەی "کۆچ"دا ئەڵێت:

" هەر تاڵە مووی ڕەشەو لەدەممەوە دێنە دەرێ و

بەڵام ئەوسەری تاڵە موو هیچ دیارنییە ."

ئەم وێنەیە لەخەودا ئەموتەوە، ئەمەیش دوابەدوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول بوو. جارێکی تریش هەر لەخەودا، ببووم بە دوو پلنگ، هەردوو پلنگەکەیش هەر خۆم بووم، بەڵام وردە وردە چاوم لەپلنگەکەی ترم بوو، هێواش هێواش، ئەپووکایەوە، هەر ئەپووکایەوە هەتاکوو پێستەکەی مایەوە. نازانم لەکام قەسیدەدا بوو ئەمەیش بوو بەوێنەیەکی شیعری.

ئەوکاتەی ڕوومکردە شاخو دواییش ئەوروپا، چەند شاعیرو چیرۆکنووسێکی بەهرەدار لەخەملین و گەشەکردندا بوون. ئەوانەی لەکۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکاندا دەرکەوتبوون، بە تەمەنیش پانزە ساڵو بیست ساڵ لەنەوەی ئێمە بچووکتر بوون .

مەبەستم دوای نەوەی 'ڕەفیق سابیر و لەتیف هەڵمەت و فەرهاد شاکەلی'شە. لەوانە شاعیر 'قوبادی جەلی زادەو جەمال غەمبار و کەریم دەشتی و دڵشاد عەبدوڵلا و چیرۆکنووس شێرزاد حەسەن' بوون. کە من لای خۆمەوە بەشێک لەبەرهەمەکانیانم بینیبوو. بەڵام بەهەنگاوی گەورەوەو بەسیماو ڕەنگ و ڕووی خۆیانەوە خەریکی کامڵکردنی ئەزموونی شیعری و ئەدەبی خۆیان بوون. بیرمە لەسەرەتای هەشتاکاندا بوو. کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە لەهۆڵی کارگەی جگەرەی سلەیمانی گیراو کۆمەڵێ شاعیری گەنجی ئەوکاتە شیعریان تێدا خوێندەوەو منیش یەکێک بووم لەوانەی لەلیژنەی هەڵسەنگاندندا بووم .

ئەو شیعرەی من پەسندمکرد بۆ پلەی یەکەمی ئەم کۆڕە، شیعرێکی 'جەمال غەمبار' بوو، هەر ئەویش دەرچوو. لەدواییدا، کە بینیم گەلێ هانمداو دەستخۆشیم لێکردوو لەبیرمە پێشموت: (تەنها ڕەخنەی من لەتۆ هەڵبژاردنی ئەم

نازناوی "غەمبار"ە یە! چونکە بەر لەتۆ کاک کەمال-یش لەهەولێر هەر غەمبارەو لامواییە زیاد لەدوو سێ نووسەری تریش هەر غەمگین و غەمبار هەن).

شوارزکۆف؛ لە هەموو لایەکەوە چواردەوری سوپاکانی سەدام حسەینی گرتبوو. هەموویانی خستبووە نێو تۆڕێکەوە کە دەرفەتی ڕزگاربونیان نەبوو. سەدام حسەین، هەر ڕاگەیاندن و ڕادیۆو تەلەفزیۆنە درۆزنەکانی بۆ مابۆوە. "لەتیف نصیف جاسم"ی وەزیری ڕاگەیاندن، زۆر بێ پەرواو بێ شەرم، ژێرکەوتنەکانی سەدامیشی ئەکرد بەسەرکەوتن. لۆتی وا هەڵنەکەوتبوو. مەیمونی واو بووکە سەماکەرەکەی واو زوڕناژەن و ماستاوچی وا بێ وێنە، دروست نەبووبوو. لەدرۆو تەڵەکەبازیدا، "گۆبلز" لەچاویا پیاوێکی ڕاستگۆ بوو. پێموایە جارێک هەر سەدام خۆی وتبووی. دوایەوەی کە لەشەڕی فاودا ئەگەڕێتەوە. ڕادیۆی بەغدا ئەکاتەوەو گوێی لێئەگرێ، وتبووی: "خەریکم بڕوابکەم بەوەی ئێمە فاومان نەدۆڕاندوەو سەرکەوتوو بووین."!

پێویست بەناوهێنان ناکات، چونکە هەموو ئەو جاش قەڵەمە کوردانەی، کە لەڕاگەیاندنی سەدامدا کاریان ئەکرد هەر لەڕۆژنامەو ڕادیۆو تەلەفزیۆنەوە تا ئەگاتە سەر وەرگێرانی نامیلکەکانی دیکتاتۆر، ناسراون‌و بەناوی خۆیانەوە وتارو قسە پڕوپووچ و زڕاوەکانیان بڵاو ئەکردەوە. بەڵام پێویستە نەوەکانی داهاتوومان ئەوە بزانن، کە ئەو قەڵەمە سووکانە چ لەو ڕۆژگارانەداو چ لەپێشترو چ لەدواتریشدا تاکۆتایی ڕژێمی بەعس لەعێراقدا، لە ترسناکترین ساتەوەختی مێژوویی ئێمەدا، قەڵەمیان تێکەڵ بەقەڵەمی فاشیزمەکان و عەفلەقییەکان و ئەو ئەنفالچییانە کردبوو، کە ئەیانویست کورد لەڕەگ و ڕیشە دەربهێنن و ئاسەواری نەهێڵن. بۆیە بەلای منەوە بۆ ئەو قەڵەمانە هەر ئەوەندە بەس نییە شەرمەزاربکرێن و بەس، بەڵکوو پێویستە ناوەکانیان لەو لیستانەدا بنووسن کە "لەتیف نصیف جاسم و عبد الامیر مەعەلەو حەمید سەعید و سامی مهدی" و ڕێچکە قەڵەمەکانی تری بەعسیان تێدایە. بۆ ئەوەی قومقمۆکە ئاسا، ڕەنگی خۆیان لەگەڵ ڕەنگی بارودۆخی تردا نەگۆڕن و خەڵک چەواشە بکەن، وەکوو ئێستا ئەیانەوێ بیکەن و لەناو ڕۆژنامەو گۆڤارە ئازادەکانی ئەمڕۆدا خۆیان بشارنەوە. پێویستە بەردەوام پێیانبوترێ: (ئەوە پێناسەی ئێوەیە، کە وەختێ کورد جینۆساید ئەکرا ئێوە بۆ ڕژێمی جینۆسایدتان ئەنووسی. وەختێ هەڵەبجە کوژرا، ئێوە بۆ بکوژەکانی هەڵەبجەتان نووسی!).

دیارە پێچەوانەی ئەو قەڵەمە سووک و ڕسوایانەیش، ئەو قەڵەمە ئازاو دلێرانەیش هەبون، کەلەهەموو ئەو قۆناغە تاریکانەدا، بەدرێژایی ساڵانی حوکمڕانی بەعس و زەمانی لەسێدارەدان‌و ئەشکەنجەو ئینجا سەرهەڵدانەوەی موقاوەمەت و هەڵەبجە و ئەنفالەکان. تەنها وشەیەکیان بۆ دیکتاتۆرو ڕژێمی جینۆساید نەک هەر نەنووسی، بەڵکوو تیایاندا بوو، شیعر و چیرۆک‌و نووسینی خۆیان ئەکردە دیاری بۆ "پ. م"ی شاخ و لەشاری پڕ لەمەترسییەوە، یان لە دۆزەخی بەعسەوە، بەرهەمەکانیان ڕەوانەی سەنگەرەکانی دەرەوە ئەکردو پێشمەرگەیش ئەیکردن بەزادی ڕۆح و تێشووی ڕێگای ئازادی و بەرەنگاربوونەوە. ئەو نووسەرانە هەم شایەت و هەم بەشداربووی خەبات و چارەنووسی میللەتەکەیان بوون. پێویستە نەوەی دوارۆژیش ئەو نووسەرە جوامێرانە بناسێت. چونکە لەدژوارترین ڕۆژگاردا دەنگی ئازادی و ئەدەبی داهێنەرانەی موقاوەمەت بوون .!

من؛ بۆ خۆم یەکێکم لەو شاعیرانەی، کە بەڕاستی شانازی بەدوو قۆناغی ژیان و ئەدەبی خۆمەوە ئەکەم. چ لەناو شۆڕشی ئەیلولدا و چ لە شۆڕشی نوێدا. چونکە نەدەستم بەکلاوەکەی خۆمەوە گرت‌و نە بێدەنگ بووم و نە بەجەستەیش لەشیعرەکانم دوورکەوتمەوە. من ئەم هاوبەشیکردنەی خۆم لەچاو ئەو فیداکاریانەی لەنەبەردەکانی موقاوەمەتی بەعسدا ئەکران، زۆر بە بچووک ئەزانم، بەڵام هەر ئەوەندە لە دەست ئێمە ئەهات.

یەکێک لەو دیاردە ناخۆش و ناجۆرانەی، کە لەو ساڵانەی دواییداو، لەناو هەندێ لەنەوەی نوێ‌و ئەدیبانی تازەپێگەیشتوودا بەدیئەکرێ. خوێن ساردی‌و یان بەتەنگەوە نەبوون و ئاوڕنەدانەوەیە لەو ساڵە تاریک و نووتەکانەو بەکەم تەماشاکردنی ئەو ئەدەبەیە کە لەسەردەمی شاخ و موقاوەمەتدا ئەنووسران. ناوبەناویش هەندێکی تر لەمەیش تێیانپەڕاندووەو بەلاقرتێ و گاڵتەوە باسیئەکەن!، وەک ئەوەی باس لەئەدەبێکی بێبایەخ بکەن!. ئەم جۆرە تێڕوانینانە، جگەلەوەی بێ ڕێزی نواندنێکی ناپەسەندە بەرامبەر قۆناغێکی لەبەرچاوی تێکۆشان و ئەدەبی کوردی، لەهەمانکاتیشدا تێنەگەیشتنە لەهەلومەرجەکانی ئەو سەردەمەی ئەدەبی موقاوەمەت و شاخ و نەزانی ئەو کەسانە دەرئەخات کەناتوانن، هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوەی زانستی و مەوزوعی بەئەنجام بدەن‌و پەنا ئەبەنە بەر قسەی هەڕەمەکی و میزاجی .

ئەشێ نموونەی بانگەشە ئاسای سیاسیی ڕاستەوخۆ لەنێو ئەو بەرهەمانەدا بەدیبکەین، بەلام لەناو هەموو فۆرمە جیاجیاکانی ئەدەبدا ئەو نزمی و بەرزی و کاملبوون و کاڵ و کرچییانە هەرهەن، ئەمە چ پەیوەندییەکی بەخودی ژانرو بابەتەکانەوە نییە، بەلکوو پەیوەندی بەزمان و خەیاڵ و هونەری فانتازیاو داهێنانەوە هەیە. بەمانایەکی تر شیعر هەیە بۆ شۆڕش‌و (پ. م) نوسراون‌و لەهەمانکاتدا ئاستێکی بەرزی هونەرییان بەخۆوە گرتووە. هەڵبەت پێچەوانەکانیشیان هەن. من بۆ خۆم پێموایە یەکێک لەو هۆیانەی کەبۆتە هۆی ئەوەی لای بەشێک لەو گەنجانە ئەم جۆرە شیعرانە پەسەند نەبن یان پێشوازییان لێنەکرێ، (ناشیرین بوون و یان ناشیرکردنی سیاسەتە بەگشتی لەولاتی ئێمەدا. بەتایبەتی لەدوای ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٩١)ەوە، تەنانەت ناشیرنکردنی ناوی "پ. م"و "موقاوەمەت"یش لەئەنجامی هەموو ئەو کارو کردەوە دزێوانەوە، کە هەندێ لەبەرپرسە سیاسییەکان و بەرپرسە عەسکەرییەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان ڕۆژانە لەشارو شارۆچکەکانی کوردستاندا و بەبەرچاوی خەڵکەوە ئەیانکرد) .

گەندەڵی ئیداری، دزی و ڕاووڕووت، پێشێلکردنی یاساو نائومێدی و بەتاڵکردنەوەی خەونەکانی ڕۆژانی ڕاپەڕین. ئینجا شەڕی ناوخۆو ئەو کارەساتانەی لێیکەوتنەوە. ئەمانە هەمووی بوونە هۆی ئەوەی کاریگەریەکی نێگەتیڤیان لەسەر دەروون و بیرکردنەوەی نەوەی تازە هەبێت، گرێیەکی سایکۆلۆجی لەناخیاندا دروستبکات بەرامبەر هەر شتێ پەیوەندی بەسیاسەت و حزبایەتی و تەنانەت ئەدەبی موقاوەمەتیشەوە هەبێت "ئەمە بۆچوونێکە بەلام من دڵنیام ئەگەر زۆر درەنگتریش بێ، ڕەخنەگرانی ئەدەبی، لەدواڕۆژدا لێکۆڵینەوەی جیدی خۆیان ئەبێت دەربارەی ئەو جوانی و داهێنان و ڕوانگە تازانەی، کە لەقۆناغە جیاجیاکانی ئەدەبی موقاوەمەتدا لەکوردستاندا نووسراون".

سەدان نامەی ئەدەبیمان بۆ نووسینو
وەڵامێکمان نەبوو!..

لەستۆکهۆڵم؛ ئامادەی یەکدوو کۆڕ بووم دەربارەی گیروگرفتەکانی زمانی کوردی. زمانی ئەدەبیو شێوە جیاجیاکانو هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی چارەسەری بۆ ئەم کێشە گەورەیەی ناو زمانی کوردی. واتە نەبوونی زمانێکی ستانداردو بەکارهێنانی یەک جۆر پیتو ڕێنووسێک، کە هەموولایەک لەسەری پێکبێن .

لێرەدا نامەوێ ئەوەی لەو کۆڕانەدا باسکران باسیانبکەمەوە. بەڵام بمانەوێ و نەمانەوێ ئەمە کێشەیەکی گەورەو ئاڵۆزە! نووسین بەدووسێ پیتی جیاواز. بەتایبەتی لاتینی و عەرەبی کەدوو ڕێچکەی سەرەکی ئەم زمانەن. من بۆ خۆم هەندێ بیروبۆچوونی جیاوازم هەیە کە لەگەڵ بەشێکی زۆری بەشداربووانی ئەو کۆڕانەدا ناکۆک بوون. زمانی ستانداری کوردی نە بەبانگەشەی ئایدیۆلۆجی و حزبی و نە بەبڕیاری هیچ کۆمەڵەو زانکۆو یان کۆمەڵەی نووسەرانو کۆنگرەی زمانەوانی و هتد.. دروست نابێ! چونکە لەبنەڕەتدا ئەم کێشەیە بەستراوە بەکێشەی دۆزی کورد خۆیەوە. بەستراوە بەبوونی دەوڵەتی کوردەوە، تا ئەو کیانە سەربەخۆیە نەبێت، زمانی ستاندارد دروست نابێت! ئەوە دەسەڵاتی سیاسییە، ئەتوانێ بوونی یەک شێوە زمان یان زمانێکی ستاندارد بچەسپێنێ. نەک بڕیاری من و تۆ. ئەمەیش وەختێک دێتە دی کەچارەنووسی زمانو بژێوی خەڵک پێکەوە گرێبدرێ، بەواتەیەکی تر تۆو خاوو خێزانت ناتوانن

هیچ کاریٚ بکەن ئەگەر ئەوشێوە زمانە یان ئەو جۆرە پیتانە لەخوێندن و کارو دادگاو هەموو بوارەکانی تری ژیاندا بەکارنەهێنن، کە دەوڵەت بڕیاری بۆداون. بێگومان ئەو بڕیارەی دەوڵەتیش ناکریٚ ئەگەر نووسەران و کۆڕو کۆمەڵە زمانەوانییو زانستییەکان دەستە پسپۆڕەکان ڕۆڵی سەرەکی تێدا نەبینن. بۆ نموونە ئەوە هەر دەوڵەت بوو لەدروستبوونی تورکیای ئەتاتورکدا توانی لەدوای پێنج سەد ساڵ زیاتر، بەکارهێنانی پیتی عەرەبی بۆ حەرفی لاتینی بگۆڕیٚ. بەڵام من بۆ خۆم لەگەڵ ئەو ڕایەدانیم، کە لەباشووری کوردستاندا حەرفی عەرەبی بگۆڕین بۆ لاتینی. چونکە یەکەم: پیتی لاتینی پیتی کوردی نییەو بە بەکارهێنانی ئەو پیتانەیش ئێمە نابین بەئەورووپی. دووەم: ئەوە بەتەنها هەر کورد نییە ئەم پیتە عەرەبییانە، کە لە ئەسڵدا پیتی ئارامی بوون بەکاربێنیٚ، جگە لەعەرەب کوردو فارسو بلوچو ئەفغانی و پاکستانییەکانیش بەکاری ئەهێنن. سێهەم: ئەوەی ئەتاتورک کردی ئەگەر لەسەرێکەوە پۆزەتیف بووبیٚ، لەسەرێکی ترەوە زۆر نێگەتیف بوو، وەختیٚ کەلتوورێکی دەوڵەمەندی بەپیتی عەرەبی نووسراوی خستە چاڵەوەو نەوەی تازەی تورکی لەو کەلتوورە کۆنە دابڕی. چوارەم: دەوڵەتی تورکیا نەیتوانی و دەرەقەتی ئەوە نەهات، هەموو ئەو کەلتوورەی بە پیتی عەرەبی نووسراون، بیانخاتەوە سەر پیتی لاتینی. پێنجەم: ئیتر ئێمە چۆن ئەتوانین ئەوەی تائێستە بەم پیتانە نووسیومانن بیانخەینەوە سەر لاتینی، دەست شتێنیش لەو کەلتوورەی، کە بەپیتی عەرەبی نووسیومانن، بەمانای ئەوەی مایە پووچ دەرئەچین. شەشەم: بەلای منەوە کتێخانەی کوردی گەنجینە بەنرخەکانی ئەدەب و مێژوو، بەشی هەرە زۆری بەم پیتانە نووسراون. بۆیە بەلای منەوە، ئەم شێوە زمانەی باشووری کوردستان، لەئێستەدا، بۆتە "نیمچە زمانێکی ستاندار"، لەبەر ئەوە پێویستە بیپارێزین. لەم حاڵەدا ڕەنگە بوونی دوو شێوە زمانی سەرەکی، تا ئەوکاتەی، کورد دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی ئەبێت. چارەسەرێکی نادروست نەبێت. حەوتەم: هەردوو شێوە زمانەکە ئەتوانن لەڕووی موتوربەکردنەوە، سوود لە یەکتری وەرگرن.

ئێستا ڕۆژانە لەڕێی تەلەفزیۆنەوە ئەو شەپۆلە گەورانەی خۆپیشاندانی هەزاران هەزار ئەورووپی و ئەمریکی ئەبینم کە "دژی جەنگ" دێنە سەر شەقامەکان. ئەمانە هەموو ئاشتیخوازن و دژ بەداگیرکردن و خوێن ڕشتن و کاولکردنن. تائێرە کێ هەیە مرۆڤ بێ و ئازادیخوازبیو وانەڵێت. بەڵام مەسەلەکە لێرەدا کۆتایی نایەت. منی کوردی هەڵەبجەو ئەنفالەکان، لەچاوی ئەو کارەساتو زامە قوڵانەوە تەماشای دنیاو ئەم ئاشتیخوازانە ئەکەم کە بەعسو ڕژێمی دیکتاتۆر بەدرێژایی ساڵان منیان تێدا سووتاندووە، منیان تێدا خەڵتانی خوێن کردووە!. ئەم هەزاران هەزار کەسە، کە دیارە بەشێکی زۆریان خوێندەوارو هوشیارو مامۆستاو ڕووناکبیرو پزیشک و ئەندازیارو نووسەرو ژن و پیاوی ناو لیژنەکانی مافی مرۆڤ و ڕێکخراوە دیموکراتییەکانن، ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ ئەڵێن: (دەست لە سەدام هەڵگرن! مەهێڵن ڕژێمی ئەنفالەکان بڕوخێت!) ئەگەرنا، ئەم هەزاران هەزار کەسە یان بێ ئاگاو لەگوێی گادا نووستووبوون وەختی کوژرانی هەڵەبجە و ئەنفالەکان؟! یاخود بەئاگابوون وەڵام بێدەنگ و کڕبوون و یان ئەو شارانە شەقامیان تێدانەبوو بۆ ئەوەی بێنەدەرەوەو لەسەر چەند ملیۆن مرۆڤی قوربانیی ڕێپێوان بکەن .!

ئاشتیخوازان؛ ئەم هەموو ئاپوورە گەورانە، جینۆسایدکردنی منیان بەجەنگ نەئەزانی؟! بەڵام ئەوەتا لەم ساتەوەختانەدا، کە دیکتاتۆر لەسەر لێواری مەرگە دژی جەنگن! چۆن و بۆچی؟! نا بۆ جەنگ!.. واتە نا بۆ ئەو جەنگەی سەدامی تێدا لەناو ئەچێ! نا بۆ ئەو جەنگەی گەورەترین دیکتاتۆری تێدا ئەبەزێ!. تۆ بڵێی ئەم هەموو ئاشتیخوازانە سەدامیان نەناسیبێ؟! جەنگ و ئاشتیش دوو زاراوەی موتڵەق-ین. بۆیە من لەلای خۆمەوە، یان ئەتوانم بڵێم کورد لەلای خۆیەوە هەموو شەڕێک، کە بە لەناوبردنی دیکتاتۆرێکی وەک سەدام کۆتایی بێ، ئەوە بەدەستپێکی گەورەترین ئاشتی ئەزانێ لەجیهاندا. ئاشتی و دیموکراسی لەبنەبڕکردنی دیکتاتۆرەکانی دنیادایە. ئەگەر لەبەرژەوەندیش بدوێین، هەموو دنیا لەو چاوەوە تەماشای کارەکانی خۆی ئەکات. ئەمریکا هەروەها و ئینگلتەرە هەروەهاو کوردیش هەروەها .

پێوانەکان هەر هەموویان لەبنەڕەتەوە گۆڕدراون. ڕژێمی سەدام حسەین بە ئۆپۆزسیۆنی عێراق ناڕوخێت و هەر ئەبێ هێزێکی دەرەکی بیڕوخێنێ. ئێمە پێویستە ئەم دەرفەتە زێڕینە بقۆزینەوە. دێوو درنجێک هەیەو ئەوە چەندین ساڵە نەوە لەدوای نەوەمان ئەخوات، کێ ئەم ئەژدیهاو دۆلپایە لەناوبەرێت، دەستخۆشی لێئەکەم و سوپاسی ئەکەم. جائیتر ناوی چی بێ و لەکوێوە هاتبێ، ئەوە بۆ من گرنگ نییە. دنیای ئەمڕۆ، دنیای دوو جەمسەری هەردوو هێزە گەورەکە نییەو، دنیای شەڕی سارد نییەو دنیای ئەو دروشمانەیش نییە، کە ئەزموونی تاڵو دوورودرێژی ئێمە بۆیدەرکەوت لەبێهودەیی و ئاسنی سارد کوتان بەولاوە شتێکی تر نییە. منی قوربانیش لەهەر شوێنێکو هەر لایەک تروسکەی بەرژەوەندییەک بۆ خۆم بەدیبکەم ڕووی تێئەکەمو هەرگیز بەخەوشییشی نازانم چاوگی ئەو بەرژەوەندییە لەلای هەر هێزو دەسەلاتێک بێ! بەلام ناخۆش ئەوەیە قوربانییەکانی دنیا لەناو خۆیاندا ببن بەجەللادی یەکتر. ئەوەتا ڕۆژانە لەشارەکانی فەلەستین و ئوردوندا، قوربانییەکانی فەلەستین دێنە سەرشەقام و لەژێر سایەی وێنەکانی سەدام حسەیندا خۆپیشاندان ئەکەنو جەللادە گەورەکەی من بەڕێبەری ئازادی خۆیان ئەزانن. ئەمەیە ئەو کارەساتەی وا لەمن ئەکات چاو بەهەموو پەیوەندییەکاندا بگێڕمەوە. سەرلەنوێ بەعەقڵێکی تازەترەوە بڕوانمە دنیاو بڕوانمە شیکردنەوەی مانای دۆست و دوژمن و لەشوێنێکدا نەچەقم!. سەرکردەکانی فەلەستین لەعەرەفاتەوە بۆ هەموو ئەوانیتر باش ئەزانن لەم بەشەی کوردستاندا کورد قوربانیی دەستی کێیە؟! کەواتە منیش نابێ پیاوە گێلەکەی جاران بم و باجی خۆڕایی و هەڕەمەکیو بێ بەرامبەر بدەمو ئەگەر ئەوان خۆیان بەقوربانیی ئازادی و ڕزگاری فەلەستین ئەزانن. ئەی من چیم؟! چییان بۆ وتم و چییان بۆ کردم؟! لەحەفتاکانی سەدەی ڕابوردوودا، لە نیازی پاک و خاوێنی خۆمانەوە، بۆ لەسەرکردنەوەی مەسەلەی ڕەوای میللەتی فەلەستین، سەرەڕای خوێن لەبەر ڕۆیشتنی جەستەی خۆمان، کەممان نەوت بۆ ئەوان، سەدان نامەی ئەدەبیمان بۆ نووسینو وەلامێکمان نەبوو. من لەو هەڵوێستە ئینسانییانەی خۆم پەشیمان نیم. بەلام هەموو

بەپیرەوەچوون و بانگکردن و لەسەرکردنەوەیەک، وەڵامدانەوەو بەپیرەوە هاتن‌و باوەشگرتنەوەی بەرامبەریشی ئەوێ. کە نەبوو. تۆیش ئیتر ئەبێ بوەستی و لایەنی کەم قسە نەکەی. ئەگینا بەپێچەوانەوە، ئەبیتە گاڵتەجاڕو پیاوێک، کە لەنرخی ئازادی و قوربانییەکانی خۆیشت کەم ئەکەیتەوە. سەرکردایەتی سیاسی فەلەستینی بەهەموو باڵ و ڕێکخراوو بزووتنەوە جیاجیاکانییانەوە. لەئەنجامی هەڵەی خۆیانەوە. خۆشەویستیی دیکتاتۆرێکی وەک سەدامیان بەدەستهێنا، بەڵام خۆشەویستیی چەند ملیۆن مرۆڤی کوردیان دۆڕاند. بۆیە ناکرێ پیرۆزباییان لێنەکەم.!

"أم المعارک"ی سەدام حسەین؛ لەلایەن ئەمریکییەکان و هاوپەیمانانەوە نەک هەر خرایە ژێر! بەڵکوو پەل پەلیشکراو بەجۆرێک قادسییەکەی دیکتاتۆر ڕسوا کراو سوپای چوارەمی دنیا تێکوپێک شکێنرا!، هەر بەتەواوی بوو بە جێی گاڵتەجاڕی هەموو ڕۆژنامەو کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی وڵاتان‌و دەوڵەمەندترین زەخیرەیش بۆ کاریکاتێریستەکانی هەموو دنیا. دواتریش لەژێر چادرەکانی "سەفوان"دا بینیمان وەزیری بەرگری سەدام چۆن زەلیلانە وەک کۆیلەیەک لەبەردەم ئەمریکییەکاندا بەچۆکدا ئەهات‌و هەر ڕۆژەی پارچەیەک لەجلەکانی‌و نیشانەکانیان پێدائەنا تا بەتەواوی ڕووت‌و قوتیان کردەوە.!

کۆمەڵەی ڕۆشنبیری لەشاری یۆتوبۆری، بانگهێشتیانکردم بۆ ئەوەی کۆڕێکی شیعر خوێندنەوەیان بۆ بگرم. ڕۆژێک بەر لەگرتنی کۆڕەکە بەڕێکەوتمو هەر بەشەمەندۆفێریش سەفەرەکەم کرد. ئەو ڕۆژانە میزاجم گەلێ باشبوو. لەباری دەروونییەوە ئارام و پڕپڕبوم لەقوڵە قوڵی پێکەنین. هۆی هەرە گەورەیش ئەو دارمان و داتەپینەبوو، کە تووشی گەورەترین دوژمنی میللەتەکەم بووبوو. ڕۆژی کۆڕەکە، خوێندنەوەم زۆر باش بوو. یەکێک بوو لەو کۆڕانەی نزیکەی دوو سەعاتێکی خایاند.

بەر لەوەی بێمە سەر ڕووداوەکانی دواتر، ناکرێ باس لەفیستیڤاڵێکی گەورەی ڕووناکبیری و ئەدەبی نەکەم، کە لەبەرلینو لەساڵی (١٩٩٠)دا بەڕێوەچوو. دەزگای کەلتووری ئەڵەمانی بەناونیشانی ڕووناکبیری عێراق لە تاراوگەدا "فیستڤاڵێکی چەند ڕۆژەی" بۆ شیعر و موزیکو شانۆو هونەری شێوەکاری و توێژینەوەی ئەدەب لەعێراقدا ڕێکخست .

لەهەموو وڵاتە جیاجیاکانی دنیاوە بانگهێشتی هەڵبژاردەیەک لەشاعیران و ڕووناکبیران کرابوون. کۆمەڵێ لەئەدیبان و ڕووناکبیرانی کوردیش لەم فیستیڤاڵەدا ئامادەبوون.

لەوانە مامۆستایان "فەلەکەددین کاکەیی و د. کەمال میراودەلی و سامی شۆڕش و منّ" وو چەند هونەرمەندێکی هونەری شێوەکاریش بەشداریمان تێداکرد.

بۆیەکەمین ڕۆژی شیعر خوێندنەوە سێ شاعیریان دیاریکردبوو. "بلند الحیدری و سعدی یوسف و من". هەڵبەت بەشی زۆری گوێگران عەرەب بوونو ئینجا کورد و ئەڵەمان. هۆڵەکە بازنەیی بوو. من بۆ خۆم لەهەموو کۆڕو کۆبوونەوەیەکی وادا، کە پێویستبێ شیعرەکان بەزمانێکی تر بخوێنرێنەوەو خۆیشم بۆ کوردی، ئەبێ شاعیرێک یان ئەکتەرێ لەم دوو قوژنی خوێندنەوەیەدا یارمەتیم بدات. بۆ ئەم فیستیڤاڵە گەلێ لەهونەرمەندان و ئەکتەرە ناسراوەکانی عەرەب بانگهێشتکرابوون. خاتوو "زەینەب"ی ئەکتەری بەناوبانگی عێراقیش لەوێ بوو. بەر لەکۆڕەکە ڕووملێنا، کە ئەو شیعرەکانم بەزمانی عەرەبی بخوێنێتەوە، نەک هەر ڕازی بوو بەڵکوو لەبیرمە وتی: "من شانازی بەوەوە ئەکەم شیعری تۆ بخوێنمەوە". سوپاسم کردو ئەو کێشەیەم بۆ چارەسەرکرا. ئەو ڕۆژانەی فێستیڤاڵ بەردەوام "د. کەمال میراودەلی و سامی شۆڕش و من" بەیەکەوە بووینو بەیەکیشەوە ئەگەڕاین. ئەگەر ماڵە کوردێ یان ناسیاوێکیش داوەتی بکردینایە هەر پێکەوە ئەچووین. ڕۆژێ بەر لەکۆڕەکە دەقی وەرگێڕدراوی شیعرەکان کەوتە لای سامی. دووسێجار پێموت بیگەڕێنێتەوە، بۆ ئەوەی بیدەم بە خاتوو "زەینەب" هەر ئەیوت باشەو هیچ. وادەی بەستنی کۆڕەکە، سەر لەئێوارەیان دانابوو. ئەو ڕۆژە لەبەیانییەوە "د. کەمالو سامی" بەیەکەوە چوونە دەرەوەو وتیان ئێمە زووتر ئەگەڕێینەوە. بووە بەنیوەڕۆو دوای نیوەڕۆو هەرنەگەڕانەوە. کاتی گرتنی کۆڕەکە هاتو هەر دیارنەبوون. ئەتوت لەسەر ئاگرم. باشە من چیبکەم؟! شیعرەکان بەکوردی هەن، بەڵام وەرگێڕدراوەکان لای سامی-ن. چووینە سەرەوە دانیشتین. من چاوێکم لەبەردەرگاکە بوو، کەی کەمال و سامی دەرئەکەون. خێراخێرایش خاتوو زەینەب ئەیوت کوا شیعرەکان؟! لەژیانمدا کەمجار ڕێکەوتووە ئاوا شپرزەو شڵەژاوبم. "بلند الحیدری" دەستیکرد بەخوێندنەوەی شیعرەکانیو ئەوان هەر دیارنەبوون. نۆرەی "سەعدی یوسف" هات و دەستیکرد بەخوێندنەوەو هەر دیارنەبوون. من نائومێدبووموو لەم ساتەدا هەردووکیان کەمال و سامی دەرکەوتنو هەر بەناو خەڵکەکەدا دەست بەدەست تاسەر شانۆکە شیعرەکانیان گەیاندمیو دامە دەست خاتوو زەینەبو هەناسەیەکم هەڵکێشا!

ئەو شیعرانەی بەکوردیو عەرەبی ئامادەمکردبوون، نزیکەی چل پارچە کورتە شیعر بوون، کە لە دیوانەکانی کازیوەو ئاوێنە بچکۆلەکانەوە وەرمگرتبوون. من بەئەزموونی خۆم لەوە گەیشتووم، کە ئەمجۆرە شیعرانە ئەگەر بەهێزو

چرووپرین کاریگەرییان لەسەر گوێگر زۆرترە. وەختێ نۆرە گەیشتە سەر من، یەکەم شیعرم بەکوردی خوێندەوەو خاتوو "زەینەب"یش بەعەرەبیو بەوجۆرە تاکۆتایی .

لەو ئەدیبە ناسراوە عیراقیانەی لەم فێستیڤاڵەدا بەشداربوون، جگە لە "بلند الحیدری و سعدی یوسف". "فازل عەزاوی و یاسین النصیر و انور الغسانی" و زۆری تریش. ئەمە جگە لەو هونەرمەندە شێوەکارانەو ئەکتەرو توێژەرەوانەی کەبەڕاستی ناویانم بیرچۆتەوە.

ئەو ڕۆژانەی لەیۆتۆبۆری بوومو لەماڵە مەسیحییەکی کوردی خەڵکی شاری سلەیمانی میوان بووم. کە پێموایە ماڵی کاک "سەباح" بوو. شەوێک هەر لەماڵی ئەوان بوو، بەدیار تەلەفزیۆنەوە دانیشتبووینو سەرۆک "بوش" کۆتایی جەنگی "گەردەلوولی بیابان"ی ڕاگەیاند .

ئەم هەواڵە بۆ ئێمە ناخۆش بوو، چونکە سەدام لەسەر لێواری مەرگ بوو. "شوارزکۆف" ئەوەندەی نەمابوو خۆیبکات بە بەغداداو سەرانی بەعسیش هەر هەموویان لەئانو ساتدا بوو بڕۆنو عێراق بەجێبهێڵن. بەڵام دیارە هۆو هۆکاری هەرە گەورەی ڕاگرتنی ئەم جەنگە پەیوەندی بەڕژێمی کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە هەبوو. بەشی زۆری شیعەکان بەدەستی ئێران هەڵئەسوڕان، لەڕۆژی (١٩٩١/٣/١)دا خەڵکی بەسرە ڕاپەڕینو هاتنە سەر شەقامەکانو کەوتنە گوللەبارانکردنی وێنەی سەدام. لە (١٩٩١/٣/٥)داو لەکوردستانداو لە"ڕانیە"وە یەکەمین تەوژمی ڕاپەڕین دەستیپێکردو لەماوەیەکی کەمدا هەموو شارو شارۆچکەکانی کوردستان لەهێزەکانی بەعسو سەدام پاککرانەوەو بەهەزاران هەزار سەربازی ڕژێم خۆیان-دا بەدەست کوردەوە .

سەبارەت بەڕاگرتنی کوتو پڕی شەڕ لەلایەن ئەمریکاو هاوپەیمانانەوە. لەو چەند شەوەدا، کەناڵە ئاسمانییەکانی تەلەفزیۆن بە تایبەتی (C. N. N.) بەردەوام چەند دیمەنێکی بڵاوئەکردەوە. دوو دیمەنیان زۆر سەرنجڕاکێش بوون :

یەکەمیان؛ لەناو شاری بەسرەداو لەژێر وێنەیەکی زۆر گەورەی خومەینیدا ئاپوورەیەکی شیعە کۆبوونەتەوەو یەکێکیان وتارێک ئەخوێنێتەوە .

دووەمیان: لەکوردستانو ناوچەی ڕانیەوە، ئاپوورەیەکی خەڵکی ووڕژاون و بەدەم ڕێپێوانێکەوە دروشمێکی گەورەیان هەڵگرتووەو داسو چەکوشێکی گەورەی لەسەر نەخشاوە! هەر کەسێ ئەم دوو دیمەنەی بدیایە، ڕاستەوخۆ

لەوە ئەگەیشت، کەئەمریکا لەڕێی(C. N. N.) ەوە ئەیەوێ بەدنیا بڵێت، وا لەخوارەوە ئێرانو شیعە دێنو لەسەریشەوە کۆمۆنیستەکان، لەبەرئەوە مانەوەی سەدامێکی لاوازو زەلیل بۆ من باشترە وەک لەوەی شیعەو کۆمۆنیست عێراق بگرنە دەست .!

لە نەورۆزی (١٩٩١)دا هێزی پێشمەرگەی کوردستانو خەڵکی ڕاپەڕیوی کەرکوک بۆ یەکەمجار توانیان کەرکوک ئازاد بکەنو دەست بەسەر پارێزگای کەرکوکو شارەکەدا بگرن. بەڵام ڕاگرتنی شەڕ، تەرازووی هەموو هەلومەرجەکانی گۆڕی و بارودۆخەکەی بەبارێکدا قڵپکردەوە کە لەتەواوی پێچەوانەی بەرژوەندییەکانی گەلی کوردستان بوو. لەو ڕۆژە بەدواوە بەختی کورد ڕوویکردەوە سەرەولێژی. ئەمریکا سەدامی بردەوە ژووری ئینعاشو ژیایەوە. لەشکرەکانی سەدام، کە هەر هەموویان ئابلووقەدرابوونو دەرفەتی ڕزگاربوونیان سفریش نەبوو، ئەمریکا لەچەند لایەکەوە دەرگای بۆ کردنەوەو کەوتنەوە جووڵە .

ئاسمانی کوردستان، عێراق کە تاو ئەکاتە چۆلەکەیەکی سەدامی تێدا نەمابوو، ئەمجارەیان هالیکۆپتەرەکانی هێزی ئاسمانی بەعس کردیانەوە بەشوێنی فڕینو جێی بۆردوومانی خۆیانو دروێنەی شۆڕشگێڕانی کوردستان بەتایبەتی لەناو کەرکوکو دەوروبەریدا. بەمجۆرە سەدام لەئینعاشیش چوە دەرێو گەیشتەوە ماڵەوە.!

ئەم دنیای سیاسەتە زۆر بۆگەنە! بڕیارمدا ئیتر کەمتر گوێ لەهەواڵە سیاسییەکان بگرم. خوومدایە تەماشاکردنی وەرزشو سەرلەنوێ خوێندنەوەی سەرجەمی بەرهەمەکانی "چیخۆف". بەتایبەتی دوای ئەوەی لەپترسبۆرگ لە"دار التقدم" زۆربەی زۆری کتێبەکانی "چیخۆف"م کڕیبوو. سیاسیو قاچاخچی زۆر لەیەکەوە نزیکن، بەتایبەتی ئەو سیاسییانەی کەدەسەڵاتیان گرتۆتە دەستو لەگەمەی ڕۆژانەدا یاری بەهەموو شتێک ئەکەنو لەدواییشدا ئەوەی بۆ ڕەوشتو ڕاستگۆیی ئەهێڵنەوە، لەسەدا یەکی کوێ قسەو ئاکارەکانیان نییە!. چینەکەی؟! نانو ئاوو هەموو هەڵسوکەوتێکی ڕۆژانەمان بووە بەسیاسەت. خۆیشی لێبدزینەوە، ئەو ئەتدۆزێتەوە. بەتایبەتی بۆ ئێمەی کوردو ئەو میللەتە کلۆڵانەی وەک ئێمەن. ئەگینا هەندێ خەم هەن، کوا خەمی ڕۆژانەو هەموو کاتێکی. بۆ نموونە شاعیرێکی سویدین! بەڵام دیسانەوە ئەم چارەنووسە واهاتووەو ناکرێ خۆت لەگۆشەیەکدا قەتیس کەیتو ببیتە کوێرو کەڕەواڵە!

من؛

خۆم بەو شاعیرە هەرە گەورەیە نازانم!..

زۆرجار لەخۆم ئەپرسم؛ شیعری نەمرو زیندوو کام شیعرانەن؟! وەڵامدانەوە ئاسان نییە. بەڵام گومانم لەوەدا نییە، ئەوەی وەک سەرئەنجام زەمان کۆنی ناکاتو لەبیریناباتەوە ئەو شیعرانەن "کەجوانیو عەشق و پرسە ئەزەلییەکانی ژیان و مردن و وسروشت سەرچاوەیانن". دیارە بەهۆی زمان و دەربڕینێکی ئەوەندە چڕوپڕو لەئاستێکی هێندە درەوشاوەدا کە ئەفراندن بەوجود بێنن. تۆ تەماشا سەدان ساڵە خەیام چوارینەکانی خۆی نوسیووە، سەدان ساڵ بەسەر شیعرەکانی "حافزی شیرازی و شکسپیر"و زۆر شاعیری تریشدا تێپەڕبووەو کەچی تائیستەو ڕەنگە تا هەتا هەتایشە بەزیندوویی بمێننەوە. بۆچی؟! هەوڵئەدەم ئەوەندەی زەینم پەی پێبەرێ، وەڵامی ئەم بۆچییە بدەمەوە :

یەکەم: لەبەر ئەوەی فەزای شیعرەکان وەک فەزای "پرس"ەکان خۆیان نەمرن. تا دنیا دنیابێ بۆ وێنە "مردن" و پرسیاری "مردن" بەردەوام ئەبێ. پرسیاری عەدەم و ئەودیو مردن کۆتایی بۆ نییە. یان هەر پرسو خەمو عەشقێک، کە تا مرۆڤ هەبێ ئەوانیش هەن.

دووەم: عەشق و دڵداری و سروشتی غەریزەکانی ژیان و ئەو ئارەزووە بەردەوامانەی کەبڕاندنەوەیان بۆ نییەو نەوە لەدوای نەوە بوونو هەرئەبێ. هەمیشە ئەو خەون و پرسیارانەن لەهەموو دەورو زەمانێکد دێنەوەو

لەسوڕانەوەی خۆیان ناکەون. ئەم فەزایانە کاتی نین. بۆیە شیعرەکانیش لەمەودای کاتێکی دیاریکراوو سەردەمێکدا نامێننەوەو هی هەموو سەردەمێکن.

سێیەم: "نیشتمان" و ئینتیما بۆ "بیرو باوەڕێک" و یان "ڕێبازێ" تەنانەت "ڕزگاری" و "سەربەخۆیی" و هەموو ئەو پەیوەندی‌و پەیامانە هەر ئەکەونە "خانەی کاتییەوە"، چەند پیرۆزو جوانیش بن. کاڵ ئەبنەوە یان بەسەرئەچن، لەسەردەمێکدا گەرم و لەسەردەمێکی تردا سارد ئەبنەوە. هێزی بەردەوامبوونیان تاسەر نابێ. بەهاتنەدی خەونەکانیان ئەکەونە کەنارەوە. بەڵام غەریزەی عەشق و سێکس و مەسەلە ویژدانی و عاتیفییەکانی مرۆڤ بەسەرچوونیان بۆ نییە.

چوارەم: بەڵام ئەو دیاردە نەمرانە لە شیعرو ئەدەبدا بەگشتی پێویستە "زمان"یشیان نەمرێ، وەک جوانیی خۆی. بۆ وێنە ئەگەر زمانی خەیام خۆی ئەوەندەی ماناو فۆرمە تایبەتییەکەی بەهێز و قول و ورد نەبوایە، ئەگەری بەردەوامبوونیشیان ئەکەوتە مەترسیی لەبیرچوونەوەوە. شیعرە نەمرە عیرفانی و صۆفی و ڕوحییەکان بەگشتی زیندوو ئەمێننەوە. چونکە بەردەوام پرسیارەکانیان بێ وەڵامە و خەونەکانیشیان هەمیشە هەر وەک خەون ئەمێننەوە.!

ئاخ من کەی ئەو شیعرە ئەنووسم ڕازیمکات‌و ببێ بەسەرینی ئارامکردنەوەم ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ؟! باوەڕناکەم چونکە تا ئەم تەمەنەم هێناوەو بەڵام هەرگیز نەبووم بەخاوەنی ئەو سەرینەو ئارامنەبوومەتەوە. ڕازینەبووم، دانەسەکناوم‌و لەگومانکردن نەکەوتووم! هەموو پرسیارێک پرسیارێکی دیکەی بەدوای خۆیدا ڕاکێشاوە. هەموو خەونێک خەونێکی تری بەدوای خۆیدا هێناوە. سوپاس بۆ ئەو خۆشەویستییەی کەمیللەتەکەم پێی بەخشیوم. بۆ ئەو هەموو باوەش بۆ گرتنەوەیەی لەباکوورەوە بۆ باشوورو لەڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوای کوردستان بۆ من واڵا کراون. بەڵام ئەمەوێ لەدڵەوە ئەوە بڵێم من خۆم بەو شاعیرە هەرە گەورەیە نازانم وەک باس ئەکرێ و زۆرجاریش ئەم وشەی "گەورەیە" لە پێشکەشکردنما بەزیاد ئەزانم و هەست ئەکەم شاعیرو هونەرمەند پێویستیان پێیی نییەو ئەمجۆرە قسانەیش بەڕاستی لەکەلتووری پڕ لەمەدح و سەنای عەرەبەوە بۆ ئێمەیش ماوەتەوە، ئەگینا کەمجار لەدنیای پێشکەوتوودا ئەم "گەورەییە" دەستنیشان ئەکرێ و هەر ئەوترێ فلانی شاعیر یان فلانی هونەرمەندو ئەبڕێتەوە.

لەسەرەتای سالّی (١٩٩١)دا زوربەی ئەو هەواڵ و دەنگ و باسانەی بەئێمە ئەگەیشت، لەڕێی ڕادیۆو تەلەفزیۆنەوە ئاگاداریان ئەبووین. ناو بەناویش لەڕێی ئەو بەیاننامەو بلاوکراوانەوە کە ڕێکخراو و حزبە جۆر بەجۆرەکانی کوردستان بلاویان ئەکردنەوە ئەمانزانی چی ڕوویداوەو بارودۆخەکان لەناوەوەی وڵات چۆنن. لەدوای ڕاپەڕینی مانگی مارس و ئەو وەرچەرخانە گەورەیە. ڕۆژێک لە لەندەنەوە ئەو هاوڕێ و دۆستانەی ئەوێ، ئاگاداریانکردم، کە کۆنگرەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق لەبێروت ئەبەسترێ و منیش یەکێکم لەو کەسانەی بۆ ئەو کۆنگرەیە بانگهێشت کراوم. دوای چەند ڕۆژی خۆمکۆکردەوەو چووم بۆ لەندەن. یەکەم کەس کاک "سامی شۆڕش"م بینی و ئیتر ئەو تێیگەیاندم، کە پێکهاتەی ئەم کۆنگرەیە چۆنەو کوردیش وەک کوتلەیەک بەشداری تێدا ئەکات. ئۆپۆزیسیۆن فڕۆکەیەکی تایبەتی هێڵی ئاسمانی لوبنانیان بۆ ئەم سەفەرە بەکرێگرتبوو. ئەو ڕۆژەی چووین بۆ فڕۆکەخانە سەدان کەس لەوڵاتەکان دیکەی ئەورووپاوە هاتبوون. کوردو عەرەبو نوێنەری هەموو حزبو ڕێکخراوە عەلمانیو نیشتمانیو دیموکراتیو دینیەکان و هەروەها چەندین کەسایەتی سەربەخۆ، ئەدیب و هونەرمەندی ناسراو بەژنو پیاوەوە. فڕۆکەخانەکە جمەی ئەهات.. هەموویشیان دڵیان خۆشبوون، چونکە زۆربەی زۆریان پێیانوابوو. ئیتر سەدام کۆتاییەتیو ئەوەندە ناخایەنێ ئەگەڕێنەوە بۆ عێراق. شیعەکان بەشی هەرە زۆری ئەندامانی کۆنگرەبوون. هێڵی ئاسمانی لوبنانی ئەوەندە نەبوو کەوتبۆوە گەڕ. وەختێ سەرکەوتینە سەرەوەو چووینە ناو فڕۆکەکەوە، ئەوەی سەرنجیڕاکێشام ژنە کەیبانووەکانی ناو فڕۆکەکە هەموویان پیرۆڵۆک بوون!. کورسییەکانیش کۆن بوون. یەکەم پرسیارم ئەوەبوو، کە ئایا شوێنی جگەرەکێشانیان هەیە؟! یەکێکیان وەلامێکی سەیری دامەوەو وتی: (بەڵێ ئەم ڕیزەیان لەسەرەوە بۆ خوارەوە جگەری تێدا ئەکێشرێو بەلام ڕیزەکەی تر نە ! ). منیش وتم: (بەڕاستی ئەم فڕۆکەیە، پێشکەوتووترینو خۆشترین فڕۆکەی دنیایە!). ئەو وەختەی گەیشتینە ئاسمانی بێروتیش، باران ئەبارێ و تەماشامان کرد فڕۆکەکەمان لەچەند لایەکەوە دڵۆپە ئەکات! ئەوسا ڕوومکردە هاوڕێکانم و

وتم: (ژنه کەیبانووی پیرەلۆک، کورسی کۆن، چرە دووکەڵ، فڕۆکەی دڵۆپەکەر، ئەمانە هەمووی لە "موخەلەفاتی حەربی لوبنانە" و ئەبوو هەروایشبێ!) دوای ئەوەی لە فڕۆکەخانەی بێروت دابەزین، بەزوویی کارەکانیان بۆ ڕاییکردن‌و هاتینە دەرەوەو ئۆتۆبیس ئامادەکرابوون و یەکسەر بۆ ئوتێلێک، کە هەر هەمووی لەلایەن ئۆپۆزیسیۆنەوە بۆ ئەو چەند ڕۆژەی کۆنگرە قۆرغ کرابوو، ئوتێلەکە پێنج شەش نهۆم بوو. هۆڵی فراوانی کۆنگرەو چێشتخانەی گەورەو کافتریاو هەموو پێداویستییەکی تێدا بوو .

"بێروت"ی ئەو ڕۆژگارە، هێشتا هەر بۆنی بارووت و دووکەڵی لێئەهات. لەئەنجامی شەڕی ناوخۆوە بەشی زۆری تەلارو باڵەخانەکان جێی گوللە تۆپ و شەستتیریان پێوە دیار بوو، یان لەهەندێ لاوە داڕوخابوون. دووکەڵ دیوارەکانیان ڕەش هەڵگەڕاندبوو. هێشتا سەنگەرەکانی سەر سووچی شەقامەکان لانەبرابوون. دوکان و بازاڕ بەشێکیان کرابوونەوەو ئەوانی تر داخرابوون. بەکورتی ئەو بێروتە جوانەی جاران، ئەویش وەک ژنە کەیبانووە پیرۆلۆکانی ناو فڕۆکەکەی لێهاتبوو. تەنها هەر ئەوەبوو شەڕ ڕاگیرابوو، ئەگینا پاشماوەی ئەو جەنگەماڵوێرانکەرەت لەهەموو شوێنێکدا بەدی ئەکرد. لەدەموچاوی ڕێبوارەکانیشدا، خەم‌و پەژارەو دەردە سەریت ئەخوێندەوە. هەر زۆر زوو هەستت بەوە ئەکرد لەشارێکی پرسەداردایت. "شارع الحمراء" هەرچی سورایی بێ لەجەستەیدا نەمابوو. ئێمەیش نەئەبوو زۆر دووربکەوینەوە. بۆیە تەنها یەکجار بەشەقامەکانی چواردەوری ئوتێلەکەدا سوڕاینەوەو ئیتر ڕۆژەکانی تر نەئەچووینە دەرەوەو هەر لەناو ئوتێلەدا ئەماینەوە. کۆمەڵی هاوڕێ بووین، بەردەوام پێکەوە بووین، کاک "مەنسور حەفید" و کاک "سامی شۆڕش" و کاک "ئازادی کاک مستەفا" و کاک "ئازاد دوغرەمەچی" و "من".

کۆنگرەیەکی پڕ لەگەڕەلاوژێ بوو، هەر کۆمەڵەو لەئاشێکی ئەکرد. کە گوتارێکیان ئەخوێندەوە بڕانەوەی نەبوو، هێشتا هیچ بەهیچ نەکرابوو. هەندێکیان بەتایبەتی شیعەکان، هەڕەشەیان لەئەمریکا ئەکرد. کەس دانووی لەگەڵ کەسدا نەئەکولا، لەوچانەکانیشدا هەردوو کەس و سێ کەس، وەک نوێنەری لایەنێک

کەناڵەکانی تەلەفزیۆن دیداریان لەگەڵدا ئەکردن‌و ئیتر ئەمانیش وەک بڵێی سبەینێ لەبێروتەوە ئەگەڕێنەوە بۆ بەغدا بەو جۆرە قسەیان ئەکرد. ئەوەی ئێمەی زۆر نیگەران کردبوو. ئەو دەمارگیرییە مەزهەبی و یان ئەو عەقڵە شۆڤێنییە بوو، کە لەدەم و دووی زۆربەیاندا هەستت پێئەکرد. مەگەر تاک‌و تەرا ئەگینا ئیتر ناوی گەلی کوردو یان کوردستان لەگۆڕێدا نەبوو. "شمال الحبیب"و "العراق الموحد" و "الصحوه الاسلامیة" و "القومیه العربیه المجیده" و "الامبریالیة و الصهیونیة" و ئەم دەنگانە دەنگی زاڵبوون و کارگەیشتە ئەوەی لەدڵی خۆماندا بڵێیم "هەزار رەحمەت لە کفندز". سبەینێ ئەمانە حوکم بگرنە دەست ئەبێ چارەنووسمان چۆن بێ. ئیتر من ئەو ڕۆژانە ئیشێکم بۆ خۆم دۆزیبۆوە، بریتی بوو لەوەی، هەر کەسێ لەوانە دوای ئەوەی مایکرۆفۆنی بەجێئەهێشت‌و ئەهاتە خوارەوە، یان لەدوای چاپێکەوتنی ڕۆژنامەو ڕادیۆو کەناڵەکانی تەلەفزیۆن وەختێ ئەچووە ئەولاوە یەکسەر ئەچوومە لایەوەو یەخەم ئەگرت‌و بەپرسیار دامئەگرتەوە یان ڕاستەوخۆ ڕووبەڕوو تیروتوانجی خۆم تێئەگرتن و لەکۆڵیان نەئەبوومەوە! بەتایبەتی نوێنەری بزووتنەوەی ئیسلامییە سیاسییەکان بەشیعەو سوننەوە یاخود ئەوانەی نوێنەری بزووتنەوە عروبەچییەکان بوون. لەپێشدا مەرحەبایەکم لەو کەسە ئەکردو ئینجا پێمئەوت: "بتەوێ و نەتەوێ عێراق دوو وڵاتە!، کوردستان و عێراق، سنووری ئێمە تاشاخەکانی حەمرینە. ئاڵای خۆمان هەیە. ئێمە بەشێکین لەنەتەوەی کوردو ئێوەیش بەشێکن لەنەتەوەی عەرەب. ئێمە بەرلەوەی بووبین بەئیسلام یان مەسیحی یان جوو کوردبووین، گەورەترین قوربانیی لەعێراقدا کوردبووە، لەبەر ئەوە تەواوی هەقی خۆمان ئەوێت بەکەرکوک و نەوتی کەرکوکیشەوە. ئێمە برایەتی درۆزنەمان ناوێت ئەم قسانەی ئێوەیش بەپولێ ناکڕین!" دوای قسەکان ناوی تەواوی خۆم پێئەوتن و ئەڕۆیشتم .!

ڕەنگە بەمجۆرە لەگەڵ زۆربەی زۆری نوێنەری ئەو لایەن و گروپ و کەسایەتییە ئیسلامی و غەیرە ئیسلامیانەدا، کە هەقیان نەئەدا بەمەسەلەی کوردو ئەیانخستە پەراوێزی گوتارەکانیانەوە قسەمکردبێ. خۆ من ئەمزانی

ڕەنگە ئەم قسانە هیچ شوێنێکیش نەگرن. بەڵام لەداخاندا نەمئەزانی چیبکەم!،
هەرچی نوێنەرەکانی حزبە سیاسییەکانی کوردستانیش بوون. گوتارەکانیان
شەرمنۆکانە بوون. کۆمەڵێ بەرتیلی قسەیان ئەدا بەبرایەتییە درۆزنەکەی کوردو
عەرەب و بەو خزمەتکارییانەی کورد لەسەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلامەوە بۆ
ئەوانی کردووەو ئینجا باسیان لە ئۆتۆنۆمییەکەو دیموکراتییەتەکە بۆ عێراق
ئەکرد! گوتاری شەرمنۆکانەی ئەو نوێنەرانە، لەگوتاری مسکێنێ ئەچوو
لەبەردەمی ئاغاکەی خۆیدا!. کەس ئەوەندەی کورد لەو کۆنگرەیەدا باسی یەک
پارچەیی خاکی عێراقی نەئەکرد. بیرمئەکردەوە: ئاخر دوای ئەنفال و هەڵەبجەو
ئەو هەموو کارەساتە ئەم قسانە چەندی بەچەند؟! پێموایە "محمد المدرسی" بوو
یەکێک لەسەرکردە شیعەکان، قسەی بۆ کەناڵێکی تەلەفزیۆنی ئەکرد،
بەهەمانشێوە دوایئەوەی تەواوبوو چوومە بەردەمی و پێموت: "تۆ سەعاتێکە
باسی عێراق‌و ڕژێمی سەدام حسەین و ئایینی ئیسلام ئەکەیت‌و کەچی باسێکی
ئەو هەزاران هەزار کوردەت نەکرد، کە لەئەنفال و هەڵەبجەدا بوونە قوربانیی.
دووسێ جار وتت عێراق لەشیمالەوە بۆ جنووب. قوربان ئەوە شیمال نییە ئەوە
وڵاتی کوردەو ناوی کوردستانەو بەداخەوە بەدرۆیش بووبێت سەدام ناوی
ئەهێنێ و "بەڵام تۆی ئۆپۆزیسیۆن خۆتی لێ لائەدەیت!. تۆ هەر ئیسلامت
بوو، قەیناکا، ئەی مەسیحییەکان و جوولەکەکان و یەزیدییەکان و سوبییەکان؟!
مرۆڤ نین؟! خاوەنی ئایینی خۆیان نین؟! کوردستانی و عێراقی نین؟!. ویستی
قسە بکات، من ئیتر ڕۆیشتم‌و بەجێمهێشت."!

ئەو چەند ڕۆژی کۆنگرەیە تابڵێی بێتاقەت‌و بێ میزاجبووم، خوا خوام بوو
تەواوبێ و بگەڕێمەوە سوید.

ڕۆژێک سەر لەبەیانی نزیکەی سەعات دە بوو، لە هۆڵەکە دانیشتبووم. هەر
لەدوای دەرگای سەرەکیی ئوتێلەکەوە، دوای هاتنە ژوورەوە، بەدەستەڕاستدا،
هۆڵێکی تر هەبوو. سەرنجمدا هەر ژنەو خۆی ئەکات بەژووردا. بەڵێ هەر ژن و
یەک پیاوم نەدی بچێتە ئەو هۆڵەوە! بەڵام ژنان بە پۆل ئەهاتن. ئەمانە
هەموویان لوبنانی بوون و کۆبوونەوەکەیش چ پەیوەندیەکی بەکۆنگرەی

ئۆپۆزیسیۆنی عێراقەوە نەبوو. هاتنی ئەم هەموو ژنەو بێ پیاو بوو بەمەراق لەدڵماو هەستام و چوومە لای یەکێک لەوانەی لەبەر دەرگای ئەو هۆڵەدا ڕاوەستابوونو بەکورتی لێمپرسین: (ئەمە چییە بۆ هەر ژن خۆی ئەکات بەم هۆڵەدا؟!) لەوەلامدا پێیانوتم: (ئەوە کۆڕی ناو بەناوی شاعیرێکی لوبنانییە) "بەداخەوە ناوەکەیم لەیاد نەماوە."

شاعیرێکی پیاو، گوێگری هەر ئەبێ ژن بێ و پیاوی تیا نەبێ و لەچەند ساڵەوە ئەم شاعیرە بەرنامەکانی بەمجۆرەیە!. سەیرە! ئەم پیاوە لە فیمینیستەکانە؟! بەهەرحاڵ لەلایەکی تریشەوە زەوقێکی جوان و ناسکیشە و بۆنا؟! وتم: "واتە تەنها پیاو لەهۆڵەکەدا هەر شاعیرەکە خۆیەتی؟!" وتیان: "بەڵێ وایە."!

گەڕامەوە سوید؛ سەرەتای ساڵی (١٩٩١)، لەڕاپەڕینەوە بۆ کۆتایی مانگی مارتو ئینجا نیسانو مانگەکانی تر .

بەسەرهاتەکان زۆرو لەڕادەبەدەر خێراو پڕ لەڕووداوی ناکوو کوتوپڕبوون، لەخۆشیی ڕاپەڕینەوە بۆ ڕەوکردنی یەک ملیۆن کورد بەرەو چیاکان و گەڕانەوەی هێزەکانی دیکتاتۆر بۆ کوردستان و ئینجا وتوێژی بەرەی کوردستانی لەگەڵ ڕژێمی دیکتاتۆردا. بەلای منەوە یەکێک لەگەورەترین ئەو هەڵانەی کەسەرکردایەتی سیاسی کوردی بەرەی کوردستانی لەو سەرودەمەدا کردیان، ئەوەبوو چوون سەدامیان بینییەوەو کەوتنەوە گفتوگۆ لەگەڵیدا، دیارە بارودۆخەکە بۆ کورد زۆر خراپو نالەباربوو، بەڵام پێویست بوو سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی خۆی ڕابگرێو ئەو گەمە ترسناکە نەکات، کەتەواو پێچەوانەی ئەو بارودۆخە نێودەوڵەتییانە بوو، کە دژی بوونو مانەوەی سەدام لەئارادا بوون. ئەو پەلە پەلەو چوونەوەیە بۆ بەغدا نەکورد قازانجی لێکردو لەسەرێکی تریشەوە خۆمان خستە ناو گێژاوێکی دژ بەسیاسەتی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانەوە. بینینەوەی سەدام دوای ئەو هەموو کارەساتانە لەدیمەنە هەرە ناخۆشەکانی ئەو مێژووە بوو. ئیعتبارو متمانە دانەوەبوو بەگەورەترین دوژمنی میللەتەکەمان .

ناکرێ لێرەدا ئەوەیش نەڵێم تاڵترین ماچیش، ئەو ماچە ناهەموارەبوو، کە "مام جەلال" سەدامی ماچکرد! ئەو دیمەنەی لەڕۆژێکدا (C. N. N) دەیانجار دووبارەی ئەکردەوە، وەک ئەوەی پێمانبڵێ: (تەماشای قوربانییەکان بکەن، چۆن ماچی جەللادەکانی خۆیان ئەکەن!) .

ئێمە لەسوید لەڕێی تەلەفزیۆنەوە تراژیدیای کۆڕەوەکەمان بینی. دیارە بینینی ئەو دیمەنە خەماویو فرمێسکاوییانە بۆ ئێمەی ئاوارەو دوورە وڵات کاردانەوەیەکی دەروونی ئێجگار تاڵو بەسوێیان هەبوو لەدڵدا، زیاد لەوەی کەهاووڵاتییەکی ناو وڵات خۆی هەستی پێبکات، چونکە ئەو بەتەنها بەشێک لەو دیمەنانەی دەوروبەری خۆی ئەبینی، بەڵام ئێمە هەموو بەشەکانی تراژیدیاکەو تەواوی کاروانی ڕەوکردووی یەک ملیۆن مرۆڤمان لەچاوی کامێراکانەوەو لەهەموو گۆشەیەکەوە دورونزیک ئەبینی. ئێمە لەیەککاتدا لەزاخۆوە بۆ هەموو سنوورەکانی ڕۆژهەلاتمان هەنگاو بەهەنگاو ئەبینی. کۆڕەو دەربەدەرییو بەجێهێشتنی ماڵو حاڵو ڕەقبونەوەو مردنیش بوو لە پێناوی ئازادیدا. کۆڕەو ڕەتکردنەوەی ڕاستەوخۆی هەموو دەسەلاتێکی دیکتاتۆر بوو. گەروویەک بوو بۆ هاواری چەندین ملیۆن مرۆڤی کورد لەم بەشەی کوردستاندا. لەتراژیدیای هەڵەبجەو بەتایبەتی کۆڕەوەوە بۆ یەکەمجار وا بەئاشکراو بێ پەردە ڕاستەوخۆ مەسەلەی کورد چووە ناو هەموو ماڵێکی دنیاوە. کۆڕەو بانگەشەی خاکو خەڵکو قوربانییەکان بوو بۆ ئازادی و سەرفرازی، شۆڕشی کامێراکان بوون، دژی شاردنەوەی ڕاستییەکان و دژی پەردەو ئەودیو کەوالیسەکان. لە کۆڕەودا ئازارەکان بەڕووتو قووتی و بەپێخاوسی لەچیاکانی کوردستاندا چوونە بەرچاوی جیهان. کۆڕەو ساتەوەختی لەدایکبوونێکی تر بوو بۆ کورد. وەک کاری ئەوەیش هەڵبەت دواتر، لەچەندین کورتە شیعرو شیعری درێژدا، کۆڕەوەکە بوو بەچاوگێکی گەورەی بەخشین و بەردەوامبوونی نووسینم!

دوای ڕاپەڕین خولیای شەوو ڕۆژم ئەوەبوو ڕۆژێ زووتر بگەڕێمەوە بۆ کوردستان، بەڵام تائەوکاتەو دواتریش من پەساپۆرتی سویدیم وەرنەگرتبوو. جا بۆ ئەوەی ئەمکارە هەرچی زووترە جێبەجێبکەم. نامەیەکی پشتگیری یەکێتی نووسەرانی سویدم وەرگرت، کاک عومەر شێخ موس-یش لای خۆیەوە کەوتە هەوڵدانو پەیوەندیکردن بە'دایرەی هیجرەوە.'

لەولاتی سویددا هەموو پەناهێندەیەک دوای پێنج ساڵ مانەوە ئینجا ئەتوانێ پەساپۆرتی سویدی وەربگرێ. من سێ ساڵو چەند مانگێک بوو لەوێ بووم، بۆیە جێبەجێکردنی داواکەم کارێکی ئاسان نەبوو. نامەکەی یەکێتی نووسەران پاڵپشتێکی بەهێزو جێی بڕوای ئەوان بوو. ئەگەرچی من ئەمتوانی بە پەساپۆرتە کاتییەکەم سەفەری خۆم بکەم، بەڵام ئەوەم زۆر بەلاوە مەبەست بوو پەساپۆرتە سویدیەکە وەربگرمو دڵنیایانە سەفەر بکەمو کێشەی تازەکردنەوەی ساڵانەی پەساپۆرتەکەی ترم لەکۆڵبێتەوە. لەناوەڕاستی هەمانساڵدا خۆزگەکەم هاتەدیو وەک ئەڵێی بەکەمترین ماوەی پێوانەیی گوزەر نامەکەم وەرگرت. هەموو ئەوانەی ئەمناسین پێیان سەیر بوو، چۆن بەسێ ساڵو نیو پەساپۆرتی سویدی وەرئەگیرێت!. بەڵام وەک وتم پشتگیری یەکێتی نووسەرانی سوید بەپلەی یەکەم و دوایئەوەیش هەوڵ و تەقەللای کاک عومەر شێخ موس بوونە هۆی ئەوەی پێشوەخت وەریبگرم!

ئەو مرۆڤەی وڵاتی ئازادی خۆی نەبوو، دەوڵەتی نەبوو، گوزەرنامەی خۆی نەبوو، فڕۆکەخانەی خۆی نەبوو، ئەوسا ئەزانێ بەهاو نرخ و بوونیان چەند گەورەیە. هەموو ئەو سەفەرانەی ئێمەی کوردیش لەدنیاوە بەرەو کوردستان ئەیانکەین بۆ هەر بەشێکی داگیرکراو، لەپایتەختەکانی ئەو دەوڵەتانەوە تاسنوورەکان و تائەگەیتەوە شوێن مەبەست یان بەپێچەوانەوە، بریتین لەزنجیرەیەک زوخاو لەسککردن و بێزارکردن بەتایبەتی لەدوا بازگەکانی ئەو دەوڵەتانەدا بەپشکنینی نابەجێ و گەڕپێکردن و بیانوو پێگرتن وات لێئەکەن لەڕۆحی خۆت بێزاربی. هەڵبەت لە هەموویان قێزەونتر، دوا خاڵی پشکنینی تورکەکانە. هەڵسوکەوتی فاشییانەی ئەو ژەندرمانەیە لەگەڵ کورددا، لە چوون و گەڕانەوەدا، دەموچاوی گرژومۆنو قسەی ڕەق و هەندێجار جنێوو سوکایەتی پێکردنیان بەناوی کوردو کورستانو گورگ ئاسا گەمارۆت ئەدەنو لەبچووکترین بیانوو ئەگەڕێن بۆ ئەوەی بەئارەزووی خۆیان گاڵتەت پێبکەنو دواتبخەن. ڕووی بێ دەمامکی ئەو دەوڵەتانە لەبازگەی سنووررو فڕۆکەخانەو شوێنی پشکنینو گومرگو تەماشاکردنی پەساپۆرتو وەرگرتنەوەی کەلو پەلدا دەرئەکەوتن. دەمو دووی ناشیرین و بەرتیل خۆری و تەمەڵی و کەمتەرخەمی کارمەندەکانیانو بێڕێزیان بەرامبەر گەشتکەرو گەڕیدەکان وەک ئەڵێی بەڵگەی حاشا هەڵنەگرن، بۆ ئەوەی تێبگەی ئەو دەوڵەتانە چەند لەکاروانی شارستانی دواکەوتوونو چەند دەغەزارن!.

دوابەدوای ئەو دانووستانە بێ ماناو ڕەزا گران و مایە پووچەی، کە سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی لەگەڵ سەدامدا کردیان! هەموو سیاسەتێکی ئەو ڕۆژگارەو تەواوی سیاسەتمەدارانم لەبەرچاو کەوت. خومدایەوە تەماشاکردنی یاریەکانی وەرزش، بەتایبەتی تێنسی سەرزەوی. خۆم لەگەڵ خۆمدا ئەدوام. تۆ بڵێی سیاسەت شتێکی پاک و بێگەردی تێدا مابێتەوە؟! دواجار هەر ئەبێ پەنا بەرینەوە ژێر ساباتە جوانەکانی شیعرو هونەر. مرۆڤ لەوێدا وەک خەڵوەتی سۆفییەکان ئەتوانێ دڵ و دەروون پاک و خاوێن بکاتەوەو بەچاوێکی ترەوە بڕوانینە ژیان و داهاتوو. سیاسەت لەوڵاتی ئێمەداو لەڕۆژهەلاتدا بەگشتی هەمیشە کەللەڕەق و توندوتیژو ئەوپەڕگیربووە. سەدام؛ داڵی سەر لاشەمانەو بەلام خۆیشمان لەنێو خۆماندا، شۆڕشگێڕەکان لەگەڵ شۆڕشگێڕەکاندا، قوربانییەکان لەگەڵ قوربانییەکاندا، سێدارەکان لەگەڵ سێدارەکانو زیندانییەکانی ناو یەک زیندان لەگەڵ یەکتردا بەخوێنی سەری یەک

تینوون. من جاران و لەسەردەمێکدا، پیاوی وەک لینین و کاستڕۆ و ماوسی تۆنگ و جەمال عەبدولناسرم خۆشئەویست! بەڵام ڕۆژگارو ئەزموون فێریانکردم و وردبوونەوە لەژیننامەو سیاسەتی ئەو سیاسەتمەدارانە بۆیاندەرخستم، لەزۆر هەڵوێستدا، ئەوانەو دوژمنەکانیان، کرداریان بەرامبەر نەیارەکانیان، هەریەک شت بووە. کوشتن و بڕین و بەزۆری زۆردارەکی خۆسەپاندن و دەست بەکورسی سوڵتەوە گرتن، وەختێ کار گەیشتبێتە سەر دەسەڵاتی خۆیان، پەنایان بردۆتە بەرهەمان ئاگرو ئاسن. لەمێژووی دوای جەنگی دووەمی جیهانەوە، دوو سەرکردەی سیاسی، لەوانی تر نەچوون و نە کورسی و نە سوڵتەو نە پلەوپایەو نەهیچ شتێ لەمرۆڤایەتی نەخستوون و پەنایان نەبردۆتە بەر فرووفێڵ و سەرکوتکردن و پاشقولگرتن و هەموو ئەو کارە دزێوانەی سیاسەتمەدارانی دنیا کردوویانەو ئەیکەن، ئەو دوو سەرکردە مەزنەیش: "گاندی و نیلسۆن ماندێلا" بوون .

گاندی؛ سیاسی بوو بەڵام فریشتەیش بوو. سەرکردە بوو، بەڵام هاوڵاتییەکی هەژاریش بوو. ماندێلا شیعر و موزیکو سەمابوو لەسیاسەتدا، لەخواری خوارەوی ئەفریقادا ئەژیاو بەڵام لەسەری سەرەوەی دنیاو لەهەر چوار قوڕنەی جیهانەوە میللەتان ڕۆژانە گوڵ و ماچ و کۆترمان بۆ هەڵئەدا!

ئیستا قەسیدە درێژەکەی "دەربەنی پەپوولە"م تەواوکردووەو لەو کەسە ئەچم ڕێگایەکی دووروودرێژی پڕ لەهەڵەت و کۆسپ و سەختی بڕیبێ و گەیشتبێتە دوا مەنزڵ و دانیشتبێ و پاڵیدابێ بەدیوارێکەوەو قاچی درێژکردبێ و دەم بەزەردەخەنە بڕوانێتە ئاسۆیەکی کراوەو ڕوونی بەردەمی و پاش ئەو ماندوو بوونەیش کاسەیەک دۆی ساردی بەدەستەوەبێ و ناوبەناو قومێکی لێبدات .!

کە لەنووسینی پرۆژەیەک ئەبیتەوە وەک ئەوە وایە نەشتەرگەریەکی وردت کردبێ‌و تیاشیدا سەرکەوتووبووبی. بڕیارمدا ئەم قەسیدەیە نە بۆکەس بخوێنمەوەو نە نیشانی هیچ کەسێکی بدەم، تا ئەگەمەوە سلەیمانی و لەکۆڕێکدا ئەیخوێنمەوە. خەوم بەو کۆڕەوە ئەبینی. ڕۆژانەیش بەشێوەی پرۆڤەکردن، بۆ ئیلقاکردنی، خۆم بۆ خۆمم ئەخوێندەوە.

لەلاپەڕەکانی پێشوودا توزێک لەسەر مەسەلەی کێش و سەروا وەستابووم. لە "دەربەندی پەپوولە"دا، سێ شەپۆلی ئاهەنگ و ڕیتم هەیە .

یەکەمیان: کێشە خۆشەویستەکەی خۆم (٤ + ٤)، بەڵام بێنەوەی خۆم بەچەند برگەیەکی دیاریکراوەوە بەستبێتەوە. بۆ نموونە ئەو بۆ من مەرجێک نەبووە لەهەشت برگەییدا بوەستم، یان دوانزە، یان شانزە کەڕەنگە ئەمە درێژترین شێوەی (٤ + ٤) بێت، بەڵکوو لەهەندێ شوێنداو بەشێوەیەکی بازنەیی ئەم ئاهەنگە خولاوەتەوە بۆ دەجار چواری، یان زیاتر .

دووەم: کێشی (٣ + ٣) ئەمەیشیان بەهەمانشێوە لە هەندێ پەرەگرافدا جاری وابووە بەدەیان سێی یەک بەدوای یەکدا هاتوون‌و تاکۆتایی ئەو تابلۆیە یان ئەو دیمەنە .

سێیەمیان: هیچ جۆرە یاسایەک لەو یاسایانە نایانگرێتەوەو پەخشانن. یان پەخشانە شیعرن. من ناتوانم شیعری بێ ئاهەنگ بنووسم. چونکە شیعری بێ ئاهەنگ بۆ خوێندنەوەو ئیلقاکردن نابن، ئەگەر بشبن باڵیان نابێ و لەتەیری هەڵکورماو ئەچن. تەنانەت من لەپەخشانەکانیشدا بایەخ بەوەئەدەم جۆرێک لەئاهەنگ و سەماکردن بگرنە خۆ. من ئەمە ناکەم بەمەرج بۆ شیعری ئەمڕۆ، هەر شاعیرەو شێوازو فۆرمی خۆی هەیە. دنیای شیعریش لەوە بەرینترە پابەندی چەند کێشێک یان یەک جۆر ریتم و ئاهەنگ بکەین. بەهەرحاڵ بوونی ئاهەنگ شیعر جوانترو پڕجووڵەترو شیرینتر ئەکات.

ئەوەی ڕاستیبێ "نیشتمان" واتە ئەو شوێنەی کەمنداڵیت و بیرەوەریت‌و خۆشەویستەکانت نەخشەی بۆ ئەکێشن، ئەگەر ئەوانە نەبوون، نیشتمان ئەبێتە تارماییەک‌و هیچی تر. ئەو منداڵەی لەهەندەران لەدایک ئەبێ‌و گەورە ئەبێ‌و لەگەڵ کەلتووری تردا تێکەڵ ئەبێت. هەرگیز ئەو شەوق و سۆزو حەزو بیرکردنەی بۆ نیشتمانی دایک و باوک و باپیرانی نابێت، بەوجۆرەی، کەیەکێکی تری گەورەبوو لەنیشتماندا هەیەتی. هەر لەبەرئەوەیشە ئێمەو مانان زۆر درەنگ یان هەرگیز لەگەڵ ئەو کەلتوورانەی تردا ناتوانین ڕابێین. هەر تەواو وەک درەختێکی بەگەورەیی هەڵکەنراو لەزێدی خۆماندا، زۆر گران یان مەحاڵە لەنیشتمانێکی تردا سەرلەنوێ بڕوێینەوە. بیرکردنی نیشتمان و شارو گەڕەک و کەس و کارو هاوڕێیان، مێژوویەکی تایبەت بەخۆت، لەساتە وەختی فام کردنەوەوە سەرچاوەیەتی. هەر خاڵەو بەشێکی ئەو بیرەوەرییانە بریتین لەمێژووی بوونی تۆ، لەجووڵەو هەناسەو خەون و خۆشی و ناخۆشییانەی، کە لەڕابوردوویەکی دوورەوە ڕۆح و جەستەی تۆیان خولقاندووە، بۆیە کاتێ لەو ڕابوردووە، لەبیرەوەرییەکانی، ئەو شوێنانە دائەبڕێی کەبوونەتە دەمارو شا

دەمارەکانی ژیانت، ئیتر هەست بەجۆرێک لە بزربوون و لەهەمانکاتدا ناتەبایی‌و نەگونجان ئەکەیت لەگەڵ شوێنی تازەدا .
ئەم غوربەتە؛ بەدرێژایی وەخت لەگەڵتا ئەبێت‌و وەک سێبەرەکەت بەردەوام لەتەکتایە. هەتا لەتەمەنێکی هەڵکشاوتریشدا ئەم دابڕانە ڕوودات، بیرکردنەکە، یان سۆزی گەڕانەوە بۆ ڕابوردوو چڕتر ئەبێتەوە! من بۆ خۆم لەدوای چوار ساڵ، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، نائارامترو شپرزەترو بێ ئۆقرە تر ئەبووم. تەنانەت شتە هەر بێبایەخەکانی نیشتمان و شارەکەم، بایەخیان پەیدا ئەکردەوە لام و بەچاوێکی ترەوە تەماشام ئەکردنەوە .
ڕەشەبای سلەیمانی؛ دیاردەیەکی جوگرافی ناخۆش‌و وەڕسکەری ئەو شارەیە. نەجوانی تیایە و نەهیچ سوودو باشییەک، کەچی من بیرم ئەکرد! تەنانەت ئاواتم بەوە ئەخواست جارێکی دی بچمەوە شارەکەم و ئەویش هەڵبکات و سەرو قژم پڕبکاتەوە لەخۆڵ و تەپوتۆزو لەبناری گوێژەو تلمکاتەوە تاخوار سەرشەقام. حەزمئەکرد بچمەوە مەیانی ماستەکەو ژێر پردەکەو گوێم لەشەڕە جنێوی خەڵک بێ و چاوم بەشێتەکانی بکەوێتەوەو جارێکی تر لای 'ئەحەی گوڵە' دووسێ شیش جگەرو دڵ بخۆم. حەزمئەکرد جارێکی تر گوێم لەو سەوزە فرۆشە دەسگێڕانە بێت کە بەکۆڵانەکاندا ئەگەڕێن و هاواری بامێ و تەماتەو خەیارو ترۆزی ئەکەن !.
ئەزانم و دڵنیام ئەو کوڕو کاڵانەی بەمنداڵی چوونەتە هەندەران و لەوێ گەورە بوون، وەختێ گوێیان لەم قسانەی من ئەبێ پێئەکەنن و هەر تێشیناگەن! بەڵام ئەو دیمەنانە بۆ من جوانترین پانۆرامای ژیانمن. ئەو ساتە وەختانەی خەریکی نووسینی 'دەربەندی پەپوولە' بووم هەموو ئەو بیرەوەریانە داگیریاکردبووم، خۆیان بۆ خۆیان، وەک هەڵقولین لەناخمدا هەڵئەقوڵانەوەو لووزەویان دەکرد. من بەشوێنیاندا نەئەگەڕام، خۆیان لەودیوی نەستەوە پەنگیان خواردبۆوەو لەوەختی نووسیندا سەریان ئەکردو ئەڕژانە دەرەوە. ئەو کاتەی تەنیایی‌و غەریبێتی سەرئەنێن بەسەری یەکەوە، ئەوسا یادەوەرییەکان لەهەموولایەکەوە هورووژمت بۆ دێننەوە. ئەوەی تۆ ڕۆژێ لەڕۆژان لەوڵاتدا بیرت لێنەکردۆتەوە جارێکی تر دێنەوە بەرچاوت‌و زیندوو ئەبنەوە.

خواردنەوەی ئاوی کانییەک لەلەپی دەستا، کڕینی چەپکە نێرگزێ لەمنداڵی، خواردنەوەی چایەکی خەست دوای نان و کەبابێ، ئەو کۆلارەیەی بەمنداڵی

هەڵتداوە. تامی لەبزینە خۆشەکان. سەرتوێژی ماست. قومێ ترشیات. پارووێەک قاورمەی نۆک. بلووری چرایەکی دیوار، کە دووکەڵ نیوەی ڕەش ئەکرد. پەنجەکێشی سەرتەندوور. پینەیەک بەپانتۆڵەکەتەوە یەکەم بەرھەمت کەبڵاوئەبۆوە. یەکەم نامەی دڵداریت. یەکەم سەفەرت بۆ شارێکی تر. ئەو دەمو چاوانەی هەموو ڕۆژێ لەسەرەڕێدا ئەبینین. کچێکی جوانی دراوسێ، ترۆزی ناوک سوور بەترش‌و خوێوە. یەکەمجار، کە حوشترمان بینی. یەکەمجار، کە لەوێنەیەکدا ژنێکمان بەڕووت و قووتی بینی. یەکەم سیحرباز، کە لەبەرچاومان ئاردی ئەکرد بە کۆتر. ئەو کاسی زیوانەی لەیارییەکانی ساڵانەدا قوتابخانەکەمان بەدەستی ئەهێنا. بۆیەکەمجار کەبیستمان ئەیانوت فلان نەبووە بەزاواو لەپەردەدا گیراوە. شرووبی سەرینی تارای بووک. شایی و شاباشی شایەر. یەکەم خۆپیشاندان. حاجی لەقلەقی سەر منارەو دارتەلەکان. ئەو ئێوارانی هاوینانەی پەڕەسێلکە زۆر بەنزمی بە بەردەمماندا ئەفڕی. تۆپەڵە کەرەی ناو دۆ. فەریکە نۆک و فەریکە قەزوان. کەوەری گەلاپان. سوراوو سپیاوی ژنانن. ئەمانەو دەیان و سەدان دیمەن و شتی تر، کەهەر یەکەیان ئەتباتەوە بۆ دنیایەک لەیادەوەری. تائەوکاتەیش، کە تۆ دوورنەکەوتوویتەوەو دانەبڕاوی، ئەم یادەوەرییانە وا بەوردەکارییەوەو وابەگەرمی سەرهەڵنادەنەوە.

بۆ خۆم لەسەرودەمێکداو لەستۆکهۆڵم واملێهاتبوو کە پیاوێکی سویدیم ئەبینی، یان ژنێکی سویدی، لەکافتریایەکدا یان لەواگۆنی شەمەندۆفێرێکداو بەرامبەرم دائەنیشتن، شێوەیانم ئەبردەوە سەر ژنێک یان پیاوێکی شارەکەم، جا ئەمە بەخەیاڵی خۆمدا ئەموت ئەم پیاوە کوتومت بەم شەپقەیەوە لە کاک "ئەحمەد میرزا" ئەچێت. یان ئەم پیاوە هەر ئەڵێی کاک "عومەر"ی کتێبخانەی سلەیمانییە. یان لە کاک "حەمەی میرزا سەعید"ی دراوسێمان ئەچێ. یان ئەو ژنە ئەڵێی سێوێکن لەگەڵ ست "شەوقییە ئەحمەد"داو کراون بە دووکەرتەوە. یان ئەوەیان هەر ئەڵێی "قومر"ی خانی هاوڕێی دایکمە. یان ئەو کوڕە گەنجە لەجارانی "جەلالی میرزا کەریم" ئەچێ. یان ئەو پیاوە لاوازو باریکە هەر تەواو "جەمال شارباژێڕی" خۆیەتی. بەچەند مانگێک بەرلەوەی بۆ یەکەمجار بگەڕێمەوە کوردستان. هێندە بێزار بووبووم هەر لەخۆمەوە سواری پاسێک ئەبووم، جا ئیتر بۆ کوێی ببردمایە ئەیبردمو بەتەنگەوە نەئەهاتم. من لەگەڵ خولیاکانی خۆمدا بووم، زۆرجار ئەو شت‌و مەکانەی ئەمکڕین و ئەمخستنە زەرفێکەوە لەمێژوودا لێم بەجێئەمان. لەو ماوەیەدا دوو کتێبی کوردیم زۆر ئەخوێندەوە.

"توحفەی موزەفەرییە"و دوو بەرگی "ڕشتەی مرواری". هەموو ڕۆژێ لەبەر خۆمەوە چەند بەیتێکم لە شیعری "بادی خۆش مرووری" نالیی ئەوتەوە. نەمئەتوانی تێکەڵ بە زمان و کولتووری سویدی ببم. وە نەبێ من ئەم دوورە پەرێزییەی خۆم لەو زمان و کەلتوورە بەباش زانیبێ. بە پێچەوانەوە ئەبوو ببنە سەرچاوەیەکی زیندوو بۆ ئەزموونی من، بەلام وەک ئەوەی یەکێک بەزۆر خواردن‌و خواردنەوەیەکی دەرخوارد بدەن‌و خۆی نەیەوێ وابوو. بۆ نموونە مامۆستاکەم وانەی ئەوتەوەو بەلام من خەیالم لەشوێنێکی تربوو. ئەو درەختەی بەرامبەری پەنجەرەی پۆلەکە بوو، درەختێکی باخی گشتی سلەیمانی بیر ئەخستمەوە، کە لەوەختی خۆیدا دابووم بەو کچەی لەسلەیمانی خۆشمئەویست .

بەدرێژایی ئەو سالانەی لەسوید بووم، لەگەڵ خواردنی سویدیدا ڕانەهاتم. بەڕاستی کوردێکی کێوی بووم. هیچ شتێکی ئەوروپا مالیی نەئەکردم!. ئەشێ ئەمە تاڕادەیەکی زۆر گەوجێتیش بێ. تاک و تەرایش نەبێ، کە لەناو کوردە ئاوارەکاندا لەمن ئەچوون. ئیتر زۆربەی هەرە زۆر وانەبوون. تەنانەت هی وایان تێدابوو، زۆریان پێ سەیر بوو من بەو جۆرە خۆم گەوجکردووە!. تەنانەت جارێک ناسیاوێک پێی وتم: "ئەم شتانەی تۆ بیری لێئەکەیتەوە نەبەخەیاڵی مندا دێن و نە مەبەستیشمە!" من لە سوید، شەوانە، ئەو وەختەی تەنیا لەژوورەکەی خۆمدا دائەنیشتم و گوێم لەگۆرانییەکانی ماملێ یان مەزهەری خالقی یان ڕەزازی ئەگرت، یان گوێم لەگۆرانی "کە دەڵێی ئەمڕۆ دەشت و کێو شینە"ی مەلا کەریم ئەبوو. بەکوڵ زۆر بەکوڵ ئەگریام!. گەلێجار لێم ئەپرسن، ئەو بەرهەمانەی دواییت چۆن لەدەرەوەی ولات نووسیون؟!. لەوەلامدا ئەڵێم: "لەبەر ئەوەی تەنیایی و نامۆیی سەرچاوەیان بوون."

قسەیەک لەتیرۆرو جەهل؛
یادێک لە مەحمود خاکی..

نەسرین لەمن باشتر بوو، ئەوەندەی من پەرێشان نەبوو. ناوبەناو ئەگەر من قسەیەکم بکردایە ئەویش ئەیوت: (ئا... وابوو، ڕاستە)، ئەگینا ئەو خۆی نەئەچوو ئەو یادەوەرییانە بەسەربکاتەوە .

جارێکیان وتی: (لەو ساڵانەی دواییدا ئەوەندە زوخاومان چوو بەدڵدا، ئەوەندە ڕاویان ناین‌و ئەم شارو ئەو شارو ئەو ماڵ و ئەو ماڵیان پێکردین، ئەوەندە جاش و پیاوخراپی کوردمان بینی، هەموو شتێکمان لەبەرچاو کەوت!). تا ئەو کاتەی دایکم لەگەڵماندا بوو، گەلێجار پرسیاری گەڕەکە کۆنەکانی سلەیمانی و خزم و ناسیاوو داب و نەریتەکانی ڕابردووم لێئەکردو زۆرشتی بیر ئەخستمەوە. بەڵام دیسان دایکیشم هەر وەکوو من نەبوو. لاموایە بەشێکی ئەم بیرکردن‌و سۆزە زۆرەی من پەیوەندی بەشکستە سیاسییەکانی کوردەوە هەبوو یان بەهوشیارییەکی پڕ لەترسەوە، چونکە ئەوە چەندەمینجار بوو لەهەرەسی شۆڕشی ئەیلوولەوە تا ئەنفالەکان و کۆچڕەو، یەک لەدوای یەک تووشی نائومێدی‌و ناهەمواری ببووین، ئەو شکستانە باری دەروونی منیان تەواو لاوازو تەنک کردبۆوە. بەکورتی وەکوو منداڵیان لێکردبوومەوە، بەبچووکترین هەواڵ و بینینی دیمەنێکی خەماوی ئیتر منیش وەکوو پەڕی دەم بام لێئەهات. نیشتمان لای من و لەو دوورەوە بووبوو بەپێوانەیەکی بنەڕەتی بۆ هەموو شتێ.

سەرچاوەیەک بۆ هەر هەموو سەرچاوەکان. قەسیدەیەک بۆ هەموو قەسیدەکانو خۆشەویستییەک بۆ هەموو خۆشەویستییەکانی تر. هەندێ ڕەخنەگری سیاسی زۆر نابەڵەدو نەشارەزایانە ئەم هەست و نەستەی منیان لەشیعردا کردووە بەجۆرە پەیامێکی ئایدیۆلۆژی. لەکاتێکدا لای من هیچ جۆرە خۆبەستنەوەیەک نەبووە بەپەیامێکی سیاسی دیارەوە یان خەتو ڕێبازی حزبێکەوە. ڕووداوو بەسەرهاتەکان زۆر خێراو کاریگەرانە منیان ئەخستە ژێر ڕکێفی خۆیانەوەو ئەوەی لەبەرچاوی دڵم بوون، ئەبوون بە شیعر. ئەگینا ئەگەر وانەبێ بۆنموونە من کەخۆم کۆمەڵە نەبم و لەو ڕێکخراوەدا کارم نەکردبێ بۆ ئەبێ چەندینجار ناوی کۆمەڵە بەرم. لەبەرئەوەی من لەچاوی شیعرەوە تەماشای کۆمەڵەی ئەو کاتەم کردووە. وەک ڕەمزو هێمایەک، وەک ئەو ئاماژانەی لەفەزای داستانێکدا هەن، نەک وەک بەرنامەو پرۆگرامی حزبێ!

بەهەرحاڵ، هەڵەبووبم یان ڕاست، عاتیفەو سۆزو خۆشەویستیی ئەو ساتە وەختانەم ئەو شیعرانەیان پێنووسیوم، ساتەوەختی شیعریش لەهیچ ساتەوەختێکی تر ناچێ، لەساتەوەختێ هەورە بروسکەیەک یان شەستە بارانێ یان زریانێک ئەچن، کەجاری واهەیە هیچ دیاردەیەکی پێشوەخت نییە بۆ پێشبینی کردنو چۆنییەتی هاتن و ڕوودانیان .

هەر لەسالانی (١٩٩٠-١٩٩١)دا هەندێ لەو هەواڵانەی پێمئەگەیشتن یان لەملاو لەولا بلاوئەبوونەوەو لەبلاوکراوەی حزبە هەمە جۆرەکاندا چاپ ئەکران و بۆ من تازەو مایەی سەرسووڕمانو لێوردبوونەوە بوون، سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ئیسلامی سیاسی بوو لەباشووری کوردستاندا. واتە بزووتنەوەیەکی ئیسلامی بەرنامەدارو چەکدار، چونکە تائەوکاتەی من لەشاخ بوومو تا ئەنفالو دوای ئەنفالیش بزووتنەوەی ئیسلامی سیاسی دەسەلاتێکی ئەوتۆی نەبوو، شایانی مەترسیو باسکردن بێ. لە هەموو ئەو شەڕە خوێناوییانەدا، کە بەدرێژایی ئەو سالانە لەکۆتایی (١٩٨٤-ەوە تا ١٩٨٨) و ئەنفالەکان هێزێک نەبوو لەو بەرەی موقاوەمەتانەدا پێیبوترێ موقاوەمەتی بزووتنەوەی ئیسلامی سیاسی دژی فاشیزمەکانی بەعس. لەدوای ئەنفالیش لەتاریکترین ڕۆژگاردا، هەر چەند دەستەیەک لەʼپ. مʼەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەو ئەشکەوتو کونە گورگانەی ولاتدا مابوونەوەو لەبەرگریدا بوونو کەسی تر نەبوون، بەلام ئیتر بەر لەڕاپەڕین ئێرانی ئیسلامی کەوتەخۆیو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئەو بزووتنەوە ئیسلامییەی بەهێز ئەکرد .

ڕاسته بارودۆخەکە لەهەموو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا دوای ڕوخانی سۆفیەت‌و ژێرکەوتنی بزووتنەوە نەتەوەییەکان، بەگشتی زەمینەی چاکی ڕەخساند بۆ سەرهەڵدانی بزووتنەوە ئیسلامییە سیاسییەکان. بەڵام لەناو کوردستاندا هیچ جۆرە بنکەیەکی جەماوەری بەهێزیان نەبوو. ئەمەیش لەبەرئەوەی هەستی نەتەوایەتی‌و بیری کوردایەتی لەناو خەڵکیدا ڕەگوڕیشەیان قوڵتر بوو. ئامانجەکانی شۆڕشی کوردیش نەهاتبوونەدی، بەڵام سەرەتای لێدانی زەنگێکی خەتەریش بوو بۆ پاشەڕۆژی کوردستان. بەتایبەتی لەو ڕۆژگارانەیشدا باری ئابووری‌و دەرامەتی خەڵکی لەوپەڕی کزی‌و ناهەمواریدا بوو. ئێرانیش ئەیزانی ئەم گەمەیە چۆن ئەکات! دەستپێکی ئەم بزووتنەوەیەش لەشاری سلەیمانیدا بەزنجیرەیەک کاری تیرۆریستی هاتە ناوەوە، وەک ئەوەی بیانەوێ چاوترسێنی خەڵکی بکەن، قوربانییەکان کۆمەڵێ لەکەسانی پێشکەوتووخوازو زانست دۆست‌و کتێبفرۆش بوون .

مامۆستا "ڕەووف زوهدی" لەکۆمۆنیستە کۆنەکانی شاری سلەیمانی بوو، پیاوێکی پێشکەوتووخواز بوو، کتێبە بەناوبانگەکەی جەواهیر لال نەهرۆ "لمحات فی تاریخ العالم"ی لەعەرەبییەوە کردبوو بەکوردی .

یان کاک "عومەر تۆفیق"، یەکێک بوو لەو خوێندەوارانەی خەریکی وەرگێڕانی لێکۆڵینەوە زانستییەکان بوو. یان کاک "مەحمود خاکی" کتێب فرۆش، کە لەهەموو ژیانیدا ئازاری پەپوولەیەکی نەدابوو. بەڵام وەک مجێوری کتێبخانەی کوردی وابوو. ئەمانە کەوتنە بەر شاڵاوەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی سیاسی ئەمە جگەلەوەی چەندین سالۆنی قژبڕینی ژنان و کتێبخانەو دوکانی مەیفرۆشی کەوتنە بەر پەلاماری تەقاندنەوەو هەڕەشەو گوڕەشەی ئەو تیرۆریستانە. کچ و ژنە سفوورەکان کەوتنە بەر شاڵاوی جنێوو سوکایەتی پێکردن‌و تێزاب پیاکردن‌و بۆیە ڕشتن بەسەریاندا .

لەو سەردەمەوە، ژمارەی ژنانی لەچک بەسەر ڕوویان لەزیادبوونکرد، ئەمە جگەلەوەی لەدواییدا کارگەیشتە ئەوەی ئەم بزووتنەوەیە بچێتە ناو گەڕەکە میللیەکانەوەو برسێتی‌و نەدارایی و نەبونی ئەو خێزانانە بقۆزێتەوەو بەبڕێ پارەو هەندێ شەکرو چا، تەفەرەیان بدەن‌و بۆ گرتنەوەی هەر لەچکێکیش مووچەیەی کەم تەرخانبکاو بەنێوی ئیسلام‌و شەریعەتەوە، گەمە بازرگانییەکانی خۆیان پەرە پێدەن‌و لەپاڵ ئەمانەیشدا کۆمەڵێ مەلای دەسەنگەخۆری جاهیل، بکەنە بوقی خۆیان لەمزگەوتەکانداو خەڵکی سادەو ساکارو دڵپاک چەواشە

بکەن. حزبە کوردستانییەکان بەرامبەر بەم دیاردە خەتەرناکە، بێبەرنامە بوون، لەباتی ئەوەی لەڕێی قانون‌و مافی مەدەنییەوە شێلگیرانە ڕووبەڕوویان ببنەوەو نەهێڵن ئەم پەتای تیرۆریستییە تەشەنە بکات. کەچی کەوتنە دەست بەسەردا هێنانیان‌و پیشوازی کردنیان‌و پارەوپول پێدانیان‌و کۆمەکردنیان، نەیانئەزانی، ئەم سیاسەتە لەگەڵ ئەواندا بێئاکامەو بەم خیتابە شەرمنۆکانە ناتوانن بەرەنگاری ئایدیۆلۆجییە شمولییەکەی ئەوان هەرگیز ببنەوە. خۆش لەوەدابوو، لەو سەردەمەدا هەندێ لەسیاسەتمەداری حزبە کوردستانییەکان ڕۆژانی هەینی ئەچوون بۆ مزگەوتەکان‌و لەپشت ئیمامو خەتیبی موسڵمانانەوە نوێژیان دائەبەست، گوایە بەمکارە ئیتر ئەوان بەرەکە لەژێر پێی بزووتنەوە ئیسلامییەکان دەرئەهێنن. نەیانئەزانی ئەم شانۆگەرییەو ئەم سیناریۆ سواوانە خەڵکی پێکەنینیان پێیدێ. ئاخر ئەبێ کێ بڕوا بەسیاسەتمەدارێ بکات، کە هەموو ژیانی خۆی بۆ عیلمانیەت و ڕێبازی مارکسیزم، لینینیزم تەرخانکردبێ‌و کەچی ئەمڕۆ بێت‌و لەپشت مەلای مزگەوتێکەوە ئەلفاتیحاو قولوئەڵلا بخوێنێ .!

ئیسلامی سیاسی ئایینی بۆ ڕواڵەت‌و تەفرەدانی خەڵکە ساویلکەکە ئەوێ. ئامانجی ئەو گەیشتنە بەدەسەڵاتی سیاسی جا بەهەرشێوەیەک بێت! چونکە ئەو ئەتوانێ تاوانەکانیشی بەشەریعەتەکەی خۆی پاساوبداتەوەو نەیارەکانی بەکافرو زەندیق لەقەڵەم بدات‌و لەلایەن خەڵکی ناهوشیاریشەوە بڕوایان پێبکرێ. ئیسلامی سیاسی چۆنیان بوێ بەوجۆرە گەمە بەئایەتەکانی قورئانیش ئەکەن! بەڵام وەختێ حزبە کوردستانییەکان بێن‌و ئەم گەمانە بکەن، بۆیان ناچێتە سەر، چونکە ئەم ڕۆڵبینینە هەر لەسەرەتاوە ئاشکرایە درۆیەو دروستکراوە. بەلای منەوە بزووتنەوەی ئیسلامی سیاسی توندڕەوو ئەوپەڕگیر، ئەمڕۆ لەدنیادا بۆتە یەکێک لەگەورەترین مەترسییەکان بۆ سەر پاشەڕۆژی دیموکراسی‌و ژیانی مەدەنی‌و شارستانی‌و مافی مرۆڤ لەگشت جیهاندا بۆتە مەترسی لەبەرچاو دژی هەموو جوانی‌و داهێنان‌و هونەرو هەموو کەلتوورە ڕەنگینەکانی مرۆڤایەتی، دژی ئازادی ژن‌و مافی بەرامبەری‌و یەکسانی لەنێو هەموو کۆمەڵگاکانداو بەتایبەتی لەڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا. بەرەنگاربوونەوەی ئەم مەترسییە بەباشکردنی ژیانی ئابووری‌و ڕیفۆرمە کۆمەڵایەتییەکان‌و فراوانکردنی مەودای ژیانی دیموکراسی‌و هوشیارکردنەوەی خەڵک، چارەسەردەکرێ .

واتە بنەبڕکردنی هەموو ئەو هۆو هۆکارانەی، کە ئەم مەترسییەیان دروستکردووە، ئەگینا بەزەبروزەنگ‌و چەک‌و شەڕ کێشەکان کۆتاییان نایەت.

جیاکردنەوەی ئایینی لەسیاسەت و دەوڵەت، ئەو ئامانجە گەورەیەیە کەپێویستە هەموومان کاری بۆ بکەین‌و لەئێستاوە بەرنامەڕێژی بۆ ئەنجامبدەین .

بەر لەگەڕانەوەم بۆ کوردستان، ئەو چەند مانگەی دوایی لەسوید، لەلایەن کۆمەڵە ڕۆشنبیری‌و کەلتوورییەکانی کوردەوە بانگهێشتی چەند شارێکی دیکەی سوید کرامەوە. وەکوو مالمێ و یوتۆبۆری و کاترین هۆڵم و ئیسکلستوونە. بۆیەکەمجار لەکاترینا هولام لەڕێی کاک "نەبیلی نوری مەتی"یەوە، کەئەویش لەهەمانشار ئەژیا، مامۆستا "جەرجیس فەتحوڵلا"ی نووسەرو وەرگێڕم ناسی‌و چووم بۆلای. خۆی بەتەنیا لەماڵێکدا ئەژیا، هەرچەندە کەوتبووە تەمەنەوە، بەلام بەردەوام خەریکی نووسین‌و وەرگێڕان بوو. ئەوە یەکەمجار بوو لەنزیکەوە ئەم پیاوە بناسمن کە لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلوولەوە تێکەلاویی لەگەل بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورددا بووەو بەکتێب‌و وتارە سەنگینەکانی خزمەتێکی لەبەرچاوی مەسەلەی کوردی کردووە. من لەکۆتایی شەستەکانەوەو لەڕێی ڕۆژنامەی "التاخی"یەوە وتارەکانیم خوێندبۆوە، هەروەها وەرگێڕانی بۆ کتێبە بەناوبانگەکەی "لونگریک" کوردو تورک‌و عەرەب‌و گەلێ باس‌و لێکۆڵینەوەی گرنگی تری. دوایئەو یەکتر ناسینە ئاڵوگۆڕی نامە کەوتە بەینەوەو منیش هەندێ لەشیعرەکانی خۆم بۆ ناردو ئەویش ڕای خۆی بۆ نووسیمەوەو لەداڕشتنەوەی هەندێ لەو کورتە شیعرانەدا بەزمانی عەرەبی هاوکاریکردم. لەنامەیەکدا خۆشەویستیی خۆی بەرامبەر بەو کورتە شیعرانە دەربڕیبوو، ئەوەی بۆ نووسیبووم: (کە ئەم تازەگەرییەی تۆ دنیایەکی جیاوازە لەوەی "گۆران" لەکاتی خۆیدا کردبووی) تائێستەیش چەند نامەیەکی مامۆستا "جەرجیس فەتحوڵلا"م لای خۆم پاراستووە، ئومێد ئەکەم لەکاتی گونجاوو شیاوی خۆیدا بڵاویان بکەمەوە.

ناوی ئازادی و
خۆشەویستیی کوردستان کەس تێر ناکا!

ئێستە گەڕانەوەم بۆ کوردستان نزیکبۆتەوە. هاتنەدی خەونێکە، کە لەدەمێ ساڵەوە خۆزگەم بووە. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گەشتر ئەبوومەوە، وەک ئەوەی لەدایکبوونەوەیەکی تازەم نزیکبیمەوە، یان سەرلەنوێ دروستببمەوە. چەندین بەرنامەو پڕۆژەی ئەدەبیو هونەری لەخەیاڵمدا بوونو ڕۆژانە تاوتوێم پێئەکردن. ئەی جێو ماڵ؟! دیاربوو، کەئەبێ ڕووبکەمە لای نزیکترین کەسم، کە ماڵی "گەزیزە"ی خوشکم بوو. شادبوونەوە بە "خەسرەو"یش بۆ من مایەی خۆشییەکی تایبەتی بوو. بەتایبەتی دوایئەوەی، کە جوامێرانە لەزیندانی بەعسدا بەرگەی گرتو سەربەرزانە هاتە دەرەوە. هەروەها شادبوونەوە بەهاوڕێ نزیکەکانم چ ئەوانەی شارو چ ئەوانەی شاخ. ئەوەی لەو ڕۆژگارەیشدا لەهەموو شتێ زیاتر، دڵم پێیخۆشبوو، تەواوکردنی قەسیدەکەی "دەربەندی پەپوولە"بوو. دوایئەو هەموو دابڕانە نەئەبوو دەستبەتاڵ بگەڕێمەوە بۆ لای شیعردۆستانو خەڵکی شارەکەم.

دەربارەی وڵاتو گەڕانەوە بۆ وڵات، زۆرجار ئەو دۆستو ناسیاوانەی لەهەندەران ئەمبینین، بەشی زۆریان ئاواتەخوازی ئەوەبوون لەیەکەمین دەرفەتی دوای ڕزگاربوون لەدەسەڵاتی سەدامو ڕژێمی بەعس، بەئێجگاری بگەڕێنەوە بۆ کوردستان، بەڵام ئەم بەڵێنە سەرزاریانە لەگەڵ واقیعی تاڵی ژیانی ئابووریو

بارودۆخی ناجێگیری ئاسایش‌و دواتریش لەگەڵ تەقینەوەی شەڕی ناوخۆدا، نەئەهاتنەوە یەکو سەریان نەئەگرت، لەم ڕووەوە خەڵکە ئاوارەکە ناهەقیان نەبوو. جگەلەوەیش دوای دەردەسەری دەرچوون لەوڵات‌و گەیشتنە ئەورووپاو جێگیربوونی ئەو ئاوارانە لەم وڵاتانەوی دەرەوەدا، بەتایبەتی ئەوانەی خێزانداربوون‌و منداڵەکانیان ئەیانخوێندو تێکەڵ بەکەلتووری ئەو شوێنانە ئەبوون‌و لەگەڵ ژیانی ئەوێدا ڕائەهاتن. ئیتر دوایئەوە ئەبووە جۆرێک لەمەحاڵ بۆ ئەوەی بیر لەهاتنەوەی یەکجارەکی بکەنەوە. تەنانەت ئەگەر باوکو دایکەکەیش بیانویستایە منداڵەکانیان نەیان ئەویست‌و پێمواویە تائیستەیش یەکێک لەکێشە گەورەکانی ئەو خێزانانە بەم لایەنەوە بەستراوە. منداڵ کە لەو وڵاتانەدا چاویکردەوە چێژی لەو ژیانە وەرگرت‌و ئاسوودەبوو، ئیتر گوێ لە"کوردستانی خۆمان" و "گەڕانەوە" ناگرێت! چونکە لای ئەو ڕابوردویەک نییە، تا بەو خاکەوە خۆی ببەستێتەوە. لەدوای ئەنفالەکانیشەوە لێشاوی هاتنە دەرەوەی کورد ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەزیادبووندابوو. لەسەردەمی بەرەی کوردستانی‌و دروستبوونی حوکمەتی هەرێمی کوردستانیشدا بارودۆخەکە لەڕووی ئابووری‌و نائارامییەوە، یان نادڵنیایی لەپاشەڕۆژ، هۆیەکی تربوون بۆ ئەوەی کۆچی بەرەو هەندەران ڕەوینەوەی بۆ نەبێت .

لەڕاستیدا ئەم ڕەوە بەتەنها هەر چین‌و توێژێکی نەگرتبۆوە، ڕووناکبیرانیش چوونە ناو ئەم کاروانەوە، لەبەرئەوەی لەو ڕۆژگارانەدا ئاسۆیەکی ڕوون دیارنەبوو. ترس‌و دڵەڕاوکێ‌و گومان لەئایندەی سیاسی‌و هەروەها باری خراپی گوزەران‌و بژێوی لەوپەڕی ناهەمواریدا بوو. ئێ خۆ خەڵکیش بەتەنها ناوی "ئازادی" و یان خۆشەویستی "کوردستان" تێری ناکەن‌و ژیانی ئاسوودەو خۆش ناکەن. بۆیە هەموو قسەکردنێ لەو ڕۆژگارانەدا دەربارەی گەڕانەوە، یان کۆچ نەکردن لەناوەوە بۆ دەرەوە، بێ ئاکام‌و لەکۆلانێکی بنبەست ئەچوو. ئەوەی ڕاستیێ ڕاگەیاندنی دەسەلاتە سیاسییەکان، حزبەکان، هەر لەسەرەتاوە دەربارەی ئەم کۆچکردنانە، سیاسەتێکی هەڵەو نادروستبوون. تانەو تەشەری زۆر نابەجێ لەو کەسانە ئەدرا، کە ڕوویان ئەکردە هەندەران. ئەمە لەکاتێکدا

بێکاریو گرانی سەرتاسەری وڵاتی گرتبۆوە. خەڵکی نەیانئەزانی چارەنووسی سبەینێیان چۆن ئەبێو کوردستان بەرەو کوێ ئەڕواو چییان بەسەردێت؟ .

بەڵێ ڕاستە کۆچکردنی ئەم هەموو وزەیەی خەڵکی وڵات، بەتایبەتی گەنجەکان دیاردەیەکی ناخۆش بوو، خاڵیکردنەوەی نیشتمان بوو لەو بەهرەو توانایانە، بەڵام ئەو کاتەی مەسەلەی برسێتی و بێکاری و ئینجا سەرباریش مەسەلەی بارودۆخێکی سیاسی ئێجگار تەمومژاوی لەئارادابێت، ئیتر چۆن ئەتوانی ڕێگە لەئازادی سەفەرو کۆچی هاووڵاتیان بگریت! ئەمە جگەلەوەی ئەو ڕاگەیاندانە بەهیچ جۆرێک بیریان لەلایەنە پۆزەتیفەکانی ئەم کۆچکردنە نەئەکردەوە. بەتایبەتی ئەو لایەنەی، کە ژمارەیەکی زۆری گەنجی کورد ئەشێ لەو وڵاتانەدا بخوێنن و ئەگەر هەموویشیان نەبێ، بەشێکیان، هەڵبژاردەیان، خوێندنی باڵای خۆیان تەواوبکەن، یان فێری چەندین پیشەی گرنگ ببن. ئەمە جگە لەفێربوونی دەیان زمانی جیاجیای دنیا، کەڕەنگە لەپاشەڕۆژدا ببنە سامانێکی گەورە بۆ گەشەپێدانی کەلتوورو ڕووناکبیریی کورد. لەسەرێکی تریشەوە ئەو لێشاوە کوردەی ڕوویانکردبۆوە دەرەوەو کاریان ئەکردو ڕەنجیان ئەداو بەردەوام یارمەتی خاووخێزان و کەس و کاریان ئەدا لەکوردستانو بەشێکی ئەو داهاتەی خۆیان بۆ ئەناردنەوەو بەمەیش بازاڕی کوردستانیان تاڕادەیەک ئەبوژاندەوە. ڕەوکردنو کۆچی بەکۆمەڵ بۆ ئەورووپاو ئەمریکا بەوشێوە ئیقلیمیگرە، دیاردەیەکی تازە بوو لەمێژووی ئێمەو بەتایبەتی لەباشووری کوردستاندا. زۆرترین ژمارەی کۆچکردوو بۆ یەکەمجار لەدوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلولەوە، لەو کوردانەوە دەستپێیکرد، کە لەئێران مانەوەو نەگەڕانەوە بۆ عێراقو دواتر بەشێکی زۆریان ڕەوانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کران. لەدوای بۆردومانی هەڵەبجەو کارەساتەکانی ئەنفالیش شەپۆلە گەورەکانی کۆچکردن لەڕێی قاچاغی بەرەو ئەرمنستانو جۆرجیاو لەوێوە بەرەو ئەورووپاو لەملایشەوە لەڕێی تورکیاو یۆنانەوە دیسان بەرەو ئەورووپا درێژەی هەبوو. لەم کۆچکردنو سەرهەڵگرتنانەدا بەدەیان کارەساتی لەناوچوونو کوشتنو ڕەقبوونەوەو خنکانو گرتنو زیندانیکردنو سنووڕداشکردنو دزیو دەسبڕینو

نەهامەتی زۆر تووشی کورد بوو. هەر خێزانێ لەو خێزانانە بگری، کە گەیشتوونەتە ئەوروپا چەندین حیکایەتی بەناسۆری ئەم ڕەوکردنانەت بۆ ئەگێڕنەوە. ژەندرمەکانی تورک ڕەوە گورگی دڕو برسی ئەو سەر سنوورانە بوون بۆ لاشەی کوردو بەدەیان خێزان و گەنجی کوردیان لەو چۆڵەوانییانەدا خلتانی خوێنو سەرنگومکرد.

بڕیارمدا کەبەئێجگاری بگەڕێمەوە، چونکە گیروگرفتی منداڵی کچکەو هەرزەکارم نەبوو. لەگەڵ ئەوەیشدا، نەئەکرا ئەم گەڕانەوەیە بەبێ ڕەزامەندی نەسرین و منداڵەکانم ئەنجامبدەم، بۆیە بەرنامەی خۆم بۆ باسکردن و پێموتن کە من بۆ خۆم بڕیارێکی لەو جۆرەم داوە، ئەوەی ڕاستیبێ، ئەوانیش ئاگایان لەخراپی باری دەروونم بوو، ئەیانزانی، ئەوە تەنها چارەسەرە بۆ ئەوەی ئاڵۆزتر نەبم. لەبەرئەوە، ئەوانیش پێیانخۆش بوو ئەم بڕیارەمداوە.

وێنەکانی ئۆجەڵن؛

وێنەکانی سەدام-یان بیرخستمەوە !

لەو یەکدووساڵەی دواییدا زوو زوو سەفەری "برۆکسل"م ئەکردو ئاموشۆی تەلەفزیۆنی "مەد"م ئەکردو ئاشنایەتیم لەگەڵ بەشی زۆری ئەو کارمەندانەدا پەیدا کردبوو، کە لەوێ کاریان ئەکرد. ستودیۆکانی تەلەفزیۆنی "مەد" گەورەو مۆدێرن بوون. لەدڵدا زۆرم پێخۆش بوو کورد خاوەنی کەناڵێکی وا گەورەیەو توانیویێتی ئەم بنکە گرنگە لەدەرەوەی وڵات دروستبکات چالاکی و لەخۆبوردوویی ئەو کارگێڕانە سەرنجی هەموانی ڕاکێشابوو. لەمیوانداریکردنیشدا ڕێکوپێکو بە بەرنامەو لەئان و ساتی خۆیدا ئیشەکانیان ئەنجامئەدا. هەر لەسەرەتاوەو بۆ ساڵانی دواتریش لەگەڵ چەند کارگێڕێکی بەشی کرمانجی خواروودا، کەبێژەرو نووسەرو بەرنامەڕێژی چالاکییە ئەدەبی و هونەرییەکانی ئەو بەشە بوون، دیکۆریستو دەرهێنەربوون. ئاشنایەتیم پەیدا کردوو بوونە هاوڕێی نزیک و لەهەموو سەردانێکیشدا لەماڵی ئەواندا ئەمامەوەو لەگەڵیاندا ئەگەڕام و لەتۆمارکردنی قەسیدەکانیشمدا ماندوو ئەبوونو بەدڵ کارەکانیان ڕائەپەڕاند، ئەو برایانەیش کاک "سیروان ڕەحیم" و کاک "بەکر-باهۆز" و کاکە "سامان عەلی قادر"ی دراوسێی دێرینی گەڕەکی ئیسکان بوو، لەوساتەوەو هەتا ئێستەیش ئەو پەیوەندیو دۆستایەتیو خۆشەویستییەم لەگەڵیاندا بەردەوامە. ئەو وەختانەی ڕێم ئەکەوتە برۆکسلو ئەچوومە

تەلەفزیۆنی مەد، ئەگەر کارم نەبوایە، زۆربەی کات لەکافتریا خۆشەکەیان دائەنیشتم، کچ و کوڕە گەنجە کارگێڕەکانیان، کە بەشی هەرە زۆریان خەڵکی باکووری کوردستانو یان کوردستانە کچکەکەی سوریا بوون، ئەهاتن بۆلام پێکەوە ئەدواین .

بەرپرسەکانیانم ئەبینی و گەلێ جاریش کەباس ئەهاتە سەرباسی سیاسەت و حزبایەتی ڕووبەڕوو ڕەخنەم لێئەگرتن، بەتایبەتی دەربارەی ئەو تاک پەرستییەی زیاد لەپێویست بەرامبەر "ئۆجەلان" هەیانبوو. چونکە هەموومان هەستمان بەوە ئەکرد لەکۆڕو کۆبوونەوەو قسەو بڵاوکراوەکانیاندا ئەوەندەی بەشکووە ناوی ئۆجەلانیان ئەهێنا، ئەوەندە ناوی کوردستانیان نەئەهێنا! جارێکیان لەیەکێک لەگۆڤارەکانیاندا ژماردم "٢٥" وێنەی ئۆجهلانی تێدا بوو پێموتن: (ببوورن بەڕاستی ئەم گۆڤارە هەندێ لەگۆڤارەکانی بەغداو وێنە زۆرەکانی "سەدام حسەین"م بیرئەخاتەوە! کارێکی خراپ ئەکەن ئەگەر لەسەر ئەم ڕێبازە بەردەوام بن). گیروگرفتی گەورە لەگەڵ ئەندامانی پەکەکەدا ئەوەبوو، گوێیان لەهیچ نەئەگرت، چییان پێوترابوو، هەر ئەوەبوو، لەبەر ئەوە هەرچیت بوتایە بریتی بوو لەئاسنی سارد کوتان. وەکیتر ئەو هەموو کادیرو کارگێڕە لاوانە ئەتوت شانەی هەنگن و سرەوتنیان بۆ نەبوو. پێشمەرگانە ئەژیان. جێدەستی کارکردنو بەرهەمیان دیاربوو، لەساڵانی دواتریشدا ئەو تێکەڵاوییەم لەگەڵ ئەم کەناڵەدا بەردەوام بوو. بوومە ئەندامی کۆنگرەی نەتەوەییش، بەڵام دوای گرتنی ئۆجەلانو ئەو قسە سەیرو سەمەرانەی کردیو دوایئەوەی لەو ئەزموونەدا سەرنەکەوتو بەرگەی نەگرت. منیش دەستکێشانەوەی خۆم لەئەندامێتی ئەو کۆنگرەیە ڕاگەیاندو دەقی وازهێنانەکەیشم لەڕۆژنامەکاندا بڵاوکردەوە.

ئەو نزیکەی پێنج ساڵەی دەرەوەی وڵاتو مانەوەم لەسوید، بۆ ئەزموونی ئەدەبیو دەوڵەمەندکردنی بەرهەمەکانمو دنیا دیدەییم، هەر ئێجگار بەبڕشتو سوودمەندبوون. وەک ئەوەی لەنێو قەفەزێکەوە چووبمە ئاسمانێکی بەرینەوە. ئەو هەموو گەشت و سەفەرو تێکەڵاوبوونو بینینە تازانە بەرچاویان ڕۆشنتر

کردمەوەو زەینمیان تیژترو ورياتر کردمەوە. لەهەموو سەفەرێکی تازەدا، هەستمئەکرد شتێکی تازەتر فێر ئەبم. من تا ئەوکاتە نەمئەزانی ولاتێکی دیموکراسی چۆنە؟! سیستەمی کارکردن و بیروڕای جیاوازو هەڵبژاردن‌و ڕاپرسیی چۆن چۆنی لەمەیدانی کاردا بەڕێوە ئەچن؟ نەمئەزانی شێوەی دیالۆگ و یەکتر قبولکردن چۆن ئەبێ؟ من نرخی ئازادی تاکەکانی کۆمەڵم لەوێ بینی‌و هەر لەوێش مانای سنگ فراوانی‌و لێبوردن‌و ئارامگرتن چاکتر تێگەیشتم. هەر لەوێش قوڵترو هەمەلایەنتر لەوە گەیشتم کە 'ڕاستیی' بەتەنها لەلای یەکێک یان بیروباوەڕێک یان پەیامی یەک حزب‌و یەک سەرکردە نییە. بەڵکوو لای هەموانە، لای هەموو ئەو کۆمەڵ‌و ڕێکخراوە ئینسانییانەی ، ئەو ڕووناکبیرە چالاکانەی، کە لەبونیادنان‌و دروستکردن‌و گەشەپێدانی کۆمەڵدا، لەپاراستنی مافی ئازادی تاکەکەسدا، بەڕەنگ‌و دەنگە جیاوازەکانی خۆیان، پاشەڕۆژی ئاسوودە ترو جوانتر بەرهەمدێنن. مرۆڤ لەولاتێکی دیموکراسی وەک سویددا تێئەگات، نرخی 'ئەویتر' چەندە! ئێمەومانان بەرهەمی ئەو سیستەمی خوێندن‌و داب‌و نەریتە بەردینانە بووین، کە بەردەوام یەک دەسەلاتی ڕەهاو یەک حاکم و یەک بیروباوەڕی شموولی پێوانەی تاقانەبووە بۆ هەموو ژیان، هەر لەبەرئەوە ئێستە لەناخی هەریەکێکماندا، چەندیش ڕووناکبیربێ، هێشتا خڵتەیەک لەپاشماوەی ئەو پەیامە شمولیانە ماوەتەوە. من بۆ خۆم لەسوید باشتر لەوەگەیشتم، کە بۆچی لەبەشی هەرە زۆرماندا، کارەکتەری ئێمە واتووڕەو دەمارگیرو کەللە ڕەق هەڵکەوتووە. چونکە هەمیشە ئێمە لەکۆمەڵێکدا ژیاوین کە بەتەنها هێزو دەسەلاتی سەرکوتکردن‌و سڕینەوەی ئەویترو یەک پێوانەیی سیستەمی باڵای بووە. لەدینەوە بۆ دەوڵەت و لەدەوڵەتەوە بۆ حزب و پێشتریش لەبونیادی خێزان و پەروەردەی باوک و دایکەوە .

هەر لەسوید من باشتر لەوەگەیشتم، هیچ گۆڕانێکی گەورە لەژیانی هیچ کۆمەڵێکی وەک کۆمەڵی ئێمەدا ڕوونادات، ئەگەر عەقڵەکان نەیەنە گۆڕاندن. واتە لەڕەگ و ڕیشەکانەوە، ئەوە ئازادی عەقڵە ئەتوانێ دڕ بەهەموو تاریکییەکان بدات. لەکۆمەڵی ڕۆژهەلات ڕۆژهەلاتی ئیسلامیدا، مرۆڤ لەعەقڵەوە کۆیلەیە،

لەدینەوە کۆیلەیە، لەشەریعەتەکانەوە کۆیلەیە، ئەگەر ئەو "کۆتانە" لەو گەردنانەوە نەشکێ، هەرچیەکی تر بکرێ نیوە ناچڵ ئەکرێ. ئەو چوار پێنج ساڵەی سوید، لەڕووی ئەزموون و بینینەوە، بۆ من خوێندنگایەک بووە، کە بەگەورەیی فریای کەوتمو لەگەڵ ئەوەیشدا ژیانی ئەوێ فێری هەندێ بیرکردنەوەی تازەی کردم و لەسەرسام بوونەوە تووشی جۆرێ لەڕاچڵەکینی نوێی عەقڵی کردم. شتە بچووەکانی ئەو دنیایەی ئەوێ، کە لەدنیای ئێمەدا نەبوون، سەرنجیان بۆ ئەوە ڕائەکێشام، کە شتە گەورەکان لەوانەوە زاون. ئەوکاتەی ئەمبینی چ ڕێزێک لەمنداڵ و پیر ئەگیرێ، هەستم بەشکانەوەیەک ئەکرد لەناوخۆمدا، چونکە بیرمئەکەوتەوە نە بەمنداڵی ڕێز لەمنداڵیم گیراو نەخۆیشم وەک پێویستو وەک ئەوێ، ئەو ڕێزەم لەمنداڵی خۆم گرتووە!. ئەوکاتەی لە سیمینارێکدا یان لەمێزگردێکدا ئەمبینی چ ڕێزێک لەکات ئەگیرێ و لەشوێنی خۆیدا سەرەک وەزیرانێ بێدەنگ ئەکرێ و ئەویش یەکسەر بێدەنگ ئەبێ، بەشی هەرە زۆری سەرکردەکانی کوردم بیرئەکەوتەوە، کە نەک هەر بێدەنگ نابێ، بەڵکوو کاتی کەسانی تریش ئەخۆنو دەربەستیش نین. ئەو ڕۆژەی سەرۆکی پەرلەمانی سویدم بینی لەڕیزێکدا بۆ شتومەک کڕین لەبازاڕێکدا ڕاوەستابوو، وەزیرو بەرپرسەکانی خۆمانم بیرکەوتەوە، کە نەک خۆیان بەڵکوو یاوەرەکانیشیان ئەوە قبوڵ ناکەن هەرگیز بچنە ڕیزەوە. ئەو ساڵەی "مۆسناسسالین"ی ژنە ئەندامی سۆسیال دیموکراتو پاڵێوراو بۆ سەرۆک وەزیرانی سوید بەهۆی هەڵەیەکی بچووکەوە وەختێ کارتی پارە ڕاکێشانی خۆی پێنەبووەو لەباتی ئەوە کارتی دەوڵەتی بۆ ئەو مەبەستە بەکارهێناوەو بەڵام هەر بۆ سبەی پارەی خستۆتەوە جێگەی خۆی، کەچی لێیکرایە هەڵڵایەک ئەوسەری دیارنەبێو نەیانهێشت ئەوپۆستە وەربگرێو وتیان "نەخێر تۆ بۆ ئەو شوێنە نابیت!"، ئەم ڕووداوە، نەک هەر لای خۆمان هەموو ڕۆژهەلاتی بیرخستمەوە، کە چۆن گایش بەکونی دەرزیدا تاودیو ئەکەن! ئەو پیرەمێردانەی پەکیان کەوتووەو تا دوا نەفەس خزمەتیان ئەکەن. ئەو قوتابیو خوێندکارانەی مامۆستایەکیان بەدڵ نییەو گوێیان لێئەگرن و بۆیشیان ئەگۆڕن.

ئەو پیرێژنەی پاشماوەی خواردنێ یان قوتویەکی بەتاڵی بەدەستەوەیەو ئەگەڕێ تا ئەگاتە سەبەتەی تایبەتی و ئەیخاتە ناوی و ئینجا دڵی ئۆقرە ئەگرێ!، کەچی لەسەیرانگەکانی ئێمەیشدا سەیرانکەران پاشماوەو پاشەڕۆی خواردنو خواردنەوەی خۆیان بێ باکانە بەجێئەهێڵنو بەرمیلو تەنکەکانیش هەر لەتەنیشت خۆیانەوە دانراون! قوتوە بەتاڵەکان لەپەنجەرەی ئۆتۆمبیلەکانیانەوە فڕێ ئەدەنە سەر شەقامەکان! دەوەرە خەفەت مەخۆو ئینجا مەزەندەی ئەوە بکە چەندمان ماوە؟ ..!

ئەمانەو بەسەدان نموونەی تر لەم شتە بچووکانە، کە لەڕاستیدا گەورەن و شارستانییەت لەم خاڵانەوە دەستپێئەکات. هەر لەو ساڵانەی دواییاو لە ستۆکهۆڵم و لەبەردەم شاشەی تەلەفزیۆندا دوو ڕووداوی گەورەم بینی، کە دنیایان هەژاندو لەگەڵ خۆیاندا دوو قەڵای سەختی دیکتاتۆرییان ڕاماڵی و لە هەمانکاتدا ئاسۆی تازەیان لەبەردەم ئایندەو ئازادی مرۆڤدا کردەوە.

یەکەمیان: ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشە لەناکاوەی لەڕۆمانیادا ڕویداو لەچەند سەعاتێکدا ڕژێمی دیکتاتۆری "شاوشیسکۆ" ڕوخاو دیکتاتۆرو ژنەکەی دەستگیرکران و دوای دادگاییکردنیان بەسزای شایستەی خۆیان گەیشتن. ئەو فیلمەی نیشاندرا لەساتە وەختەکانی یەکەمەوە وێنەکانی گیرابوون. ئاپوورەی خەڵک لەمەیدانی کۆشکدا کۆبووبوونەوە، شاوشیسکۆ لەسەر تارمەی کۆشکەوە قسەی ئەکرد، لەپڕ لەناو خەڵکەوە دەنگی نارەزایی بەرزبۆوە، شاوشیسکۆ شڵەژاو لەپاش چەند چرکەیەک چووەوە ژوورەو ئیتر وەک ئاگر لەپوش بەربێ وابوو. کۆپتەرێک شاوشیسکۆی فڕانو ئەوەندەی نەخایاند خەڵکی تووڕە گەیشتنە سەر کۆشک و ناو کۆشک و دەست بەسەر هەموویدا گیرا. ئەو دیکتاتۆرەی تاچەند سەعاتێ پێشتر بڕو بکوژی یەکەمی ئەو وڵاتەبوو، جێگەیەک نەما بتوانێ خۆی تێدا حەشاربدا. بۆ ڕۆژی دووەم لەنزیک بۆخارست خۆیو ژنەکەی گیران و لەفیلمەکەدا ئەو دیمەنەمان بینی، کە لەناو دەبابەیەکەوە ئەیانهێننە دەرەوەو ئەیانبەنە ئەو هۆڵەوە کەبۆ دادگایی کردنیان تەرخانکرابوو. دوای دادگاییکردنێکی بەپەلە حوکمی کوشتنیان دەرچوو. بەدەست بەستراوی

هەردووکیان بردنە ناو حەوشەی هەمان ساختمانەوەو دەستڕێژیان لێکراو کوژران .

بەدرێژایی ئەو فیلمە بیرم لەوە ئەکردەوە تۆ بڵێی ئێمەیش ڕۆژێ بێت سەدام بەوجۆرە ببینین؟! هەر بەوشێوەیە ئاوا بەزەلیلی و دەست بەستراوی بەسزای ئەبەدی خۆی بگات! دووەمیان: ڕووخانی دیواری بەرلین بوو. دیواری ترس و مردن، دیوارێکی تری حوکمی دیکتاتۆری و ڕژێمێکی پاڵپشت و دۆستی بەعس و سەدام حسەین. دیوارێک، کە یەک کەلتوورو یەک زمانو یەک ئاواتو خواستی کردبوو بەدووکەرتەوە. ژیانی یەک میللەتی لێکدابڕیبوو. ڕوخانی دیواری بەرلین، ڕووخانی مێژوویەک بوو، کە تا ئەو کاتە چۆکی لەسەر سنگی ئەڵەمانیا دادابوو، کۆتایی هێنان بوو بەدیوارەکانی ستالینیزمو شوورەی ئاسنینی سۆڤیەت لەڕۆژهەڵاتی ئەورووپادا. هەردوو ڕووداوەکە، مێژوویان گۆڕیو لەئاسۆی سیاسەتی نێو دەوڵەتیو جیهانیشدا بەراییەک دەرکەوت. کە ئیتر سەردەمی دیکتاتۆرەکان لەئاوابووندایەو دیموکراسییەت لەهەڵهاتنداو ئەمەیش چ بۆ گەلی کوردستان و چ بۆ میللەتانی لەئێمە چوو، لەدنیادا، مایەی ئومێدو گەشانەوەو هەڵسانەوە بوو!

لەمانگی نۆی (١٩٩١) دا لەگەڵ برایان "د. حسەین محەمەد عەزیز" و کاک "شێرکۆ جاف"دا ڕێکەوتین پێکەوەو هەر لەڕێگەی ئێرانەوە بەرەو کوردستان بگەڕێینەوە .

بۆ وەرگرتنی ڤیزە، چووین بۆ سەفارەتی ئێرانی لەستۆکهۆڵم و دوای هەفتەیەک ڤیزەمان وەرگرتو بلیتی فڕۆکەمان بڕی و ئیتر هەر ئەوە مابوو لەڕۆژی سەفەردا بەرەو تاران هەڵفڕین و بگەینەوە وڵات.!

ئەو چەند ڕۆژەی بەر لەگەڕانەوە، بەپێچەوانەی کەش و ئاوو هەوای ستۆکهۆڵم"ەوە، هەوا لەکرانەوەدا بوو، هەستمئەکرد ئەو تەمومژەی چەندین ساڵە لەگیانم ئاڵاوە وردە وردە خەریکە بڕەوێتەوە. خەریکە شینایی ڕۆحم دەربکەوێ و لەبەر ئاوێنەی ساماڵدا ئەو جریوانە ببینم، کە لەدەمێکەوە چۆوبوونە پشت گەواڵە ڕەشەکانەوە. ڕۆحم بووبوو بەڕۆحی بەهار، لەچاومەوە سەرنجی تازە هەڵئەقوڵاو لەنێو پەنجەکانی دەستەوە گەڵای سەوز ئەڕسکاو لەخەیاڵما شنەبایەک هەڵیئەکرد، کە کزەو شنەبای گوێژەو ئەزمڕو بازیان بوو. ستۆکهۆڵم؛ شاری هەزاران دوورگەیەو لەتەختاییدایە. من لەهەر شوێنێ بم کەشاخم نەبینی وائەزانم نیوەی ژیان نابینم. سروشتێ ئەبینم نوقسانە. شاخ لانکەی شیعری منەو نهێنییەکانی زمانی من لەو دەراڵو گەوەو کەوێڵانەدایە کە

بوون و ژیانی شاخ و کێویان لەئامێزدایە. مێژوومیان لەباوەشدایە، کەلتووری منیان لەهەناودایەو حیکایەتی ئەبەدیی من ئەگێڕنەوە .

شاخ؛ تەلیسمی گەورەی بوونو ئەفسانەی مانەوەو بەردەوام بوونی هەناسەکانی وشەو ژیانمە. لە پلەو بەرزی و نزمی و لاپاڵ و ڕک و ماهییەکانی شاخدا داستانەکانی یەکەمین جاری دروستبوونی گەردوون ئەخوێنمەوە. لەتەختایی و سەحرادا تەماشا زوو وەڕس ئەبێ. بەڵام لەنێو کێوەکاندا تەماشا زوو زوو تازە ئەبێتەوە. دیمەنی بیابان یەک ڕەهەندییە. بەڵام دیمەنەکانی نێو چیاو ڕەوەزەکان بەردەوام لەگۆڕاندان، وەک ئەوەی لەدەیان ڕوانگەوە تەماشای سروشت بکەیت و لەهەر ڕوانگەیەکیشەوە ڕەنگێکی جیاواز بەدی بکەیت.

کاتی سەفەرهات و فڕۆکەکەمان جوڵاو لەپاش چەند دەقیقەیک بەرزبووینەوەو لەپەنجەرەکەی تەنیشتمەوە تەماشایەکی خێرای ستۆکهۆڵمم کردوو لەدڵەوە ماڵئاواییم لێکرد! سوپاس بۆ ئەو وڵاتەی لەتاریکترین ڕۆژگاردا چرای دڵدەدانی بۆ هەڵکردینو لەسەردەمێکدا باوەشی بۆ ئێمە کردەوە، کە زۆرینەی وڵاتانی تر دەستیان پێوە ئەنانو دەریانئەکردین. سوپاس بۆ هەموو ئەو ژن و پیاوە سویدییانەی، لەخۆشەویستیی خۆیان پێدامو مرۆڤ دۆستانە هاوکارییانکردین و لەپارووی دەمی خۆیان گرتەوەو دایان بەماڵو منداڵی ئێمە. سوپاس بۆ ئەو مامۆستایانەی کەفێری کۆمەڵێ وشەی سویدییان کردم. سوپاس بۆ یەکێتی نووسەرانی سوید، کە بێ جیاوازی لەنێوان نووسەرانی خۆیان و نووسەرانی بیانیدا، ڕێزیان لێگرتم و لەڕێی یادداشت و خەڵاتەکانییانەوە، وورەی زیاتری بەردەوامبوونیان پێبەخشیم. ئەم ماڵئاواییکردنەم ئێجگاری نییە، چونکە من کە وڵاتی دووەمم سوید بێتو پەساپۆرتی سویدیشم وەرگرتبێ و ماڵ و منداڵیشم لەوێ بژین و لەوێ کاربکەن، دیارە هەر ئەبێ لەدەرفەتی گونجاودا سەردانی بکەمەوەو نەهێڵم ئەو پەیوەندییە ڕوحییە هەرگیز بپسێ.!

گەیشتینە تارانو هەرسێکمان خواخوامان بوو لەم شوێنانە ئەوەندە نەمێنینەوەو سەعاتێ زووتر بگەینەوە سلەیمانی. بۆ ئەو ڕێوبانە دوورودرێژانەی نێوان تاران و وڵاتیش بەهۆی قسەی خۆشو گێڕانەوەی نوکتەو گاڵتەوگەپەوە تاقەتمان نەئەچوو، نەیشمانئەزانی وەخت چۆن ئەڕوا. لەم سەفەرەدا نوکتەی "سەتڵە دۆکەی" "ڕەفیق"ی قسە خۆش، بەناوبانگ بە"ڕەفیقە کوێر" بوو بەسەرتلی هەموو نوکتەکان. چیرۆکەکەیش بەمجۆرەیە :

(ڕەفیق: لەهاویناندا دۆی ئەفرۆشت، لەم شەقامەوە بۆ ئەو شەقام، سەتڵەکەی لەگەڵ خۆیدا ئەگێڕاو هاواری دۆی ساردو کەللە تەزێنی ئەکرد. هاوینێکیان لەقرچەی گەرمای نیوەڕۆدا پیاوێکی شارەزووری پاڵتۆ لەبەر دێتو لەسەر چیچکان دائەنیشێ و بە ڕەفیق ئەڵێ: "ئا جامێکم بۆ تێکە". جامەکەی بۆ تێئەکاو ئەیبێ بەسەریەوەو دەستێ بەڕیشا ئەهێنێو ئەڵێ. "ئادەی بۆمتێکەرەوە"، بەمجۆرە سێ چوار جام ئەخواتەوە، لەدواییدا دەستئەکات بە باخەڵیا پێنج دیناریەکی پەنجاکان دەرئەهێنێو ئەیداتە دەست ڕەفیق. ئەویش تۆزێ ڕائەمێنێ و بەکابرا ئەڵێ زۆرباشە تۆ بەدیار سەتڵە دۆکەوەبەو من ئەبێ بچم وردی بکەمەوەو باقییەکەیت بۆ بێنمەوە!. کابرای لەسەر چیچکان دانیشتوویش ئەڵێ باشە). ڕەفیق ئەڕواو چارەکێک و نیو سەعات و سەعات و ناگەڕێتەوە، دوای ساڵێک ڕەفیق خۆی گێڕابوویەوەو وتبووی: (لاموایە کابرا تائێستەیش هەر لەسەر چیچکان دانیشتووەو چاوەڕوانە باقییەکەی بۆ بەرمەوە!). من لەکاتی خۆیدا ئەم نوکتەیەم بۆ کاک "حسەین محەمەد عەزیز" گێڕابۆوە، دووسێ جاری تریش بەئامادەبوونی ئەو لەچەند دانیشتنێکی تردا، هەرهەمان نوکتەم گێڕابۆوە. لە فرۆکەکەدا وەختێ سواربووین من کەوتمە لای یەکێکی ترەوە، ناوبەناو لەگەڵ کابرادا قسەمان ئەکرد، کاک حسەینیش لەپێشترەوە دانیشتبوو، جاربەجار ئاوڕی لێئەدامەوەو پێئەکنی. لەڕێگا، کاک حسەین هەستا بۆ ئەوەی بچێت بۆ توالێت، ئەبوایە بەلای مندا تێپەڕیایە، هات و وتی: "ها لەچیدایت؟!" وتم: "وەڵڵا هیچ! بەڵام نوکتەی سەتڵە دۆکەم بۆ ئەم کابرایەیش گێڕایەوە!". ئیتر لەوەو دوا بچووینایە بۆ هەر شوێنێ باس هەر باسی سەتڵکە دۆکەبوو.!

گەیشتینە "مەریوان"، ئەو شارۆچکەیەی لەساڵی (١٩٧٤)دا، نزیکەی شەش مانگێ لەگەڵ نەسرین و منداڵەکاندا تیا ژیابووم و هەر لەوێش دوا هەواڵی نوشوستی شۆڕشی ئەیلولم پێگەیشت و ناخۆشترین ڕۆژانی دوای ئەو هەرەس و نوشوستیەم تێدا بەسەر بردو لەمەزاتخانەکەیدا، کەلوپەلی ناوماڵەکەم فرۆشت بۆ ئەوەی پێی بگەڕێینەوە بۆ سلەیمانی. وەختێ بەناو مەریواندا تێئەپەڕین ئەو دیمەنە خەماویانەی ئەو سەردەمەم بیر ئەکەوتەوە. ئەو ژوورەی بەکرێمان گرتبوو، چایخانە گەورەکەی بەرامبەر سینەماکە، لەو سەردەمەدا لەمەریوان پێکەوە بووین. دوای مەریوان چووینە دوا خاڵی پشکنینی سەر سنوور لەباشماخ و ئیتر هەر لەوێوە ئۆتۆمبێلێکمان بۆ سلەیمانی بەکرێگرتو کەوتینەڕێ. بەناو پێنجوێندا تێپەڕین، بەڵام وێرانەیەک بوو بۆخۆی، بەعس گەیشتبێتە هەر شوێنێ

تا نەیکردبێت بەکەلاوە وازی لێنەهێناوە. من هەر کاتێ پێنجوین ببینم، یان ناوی پێنجوین ببیستم، یەکسەر کاک "حەمە سدیقی پێنجوینی" هاوڕێم بیر ئەکەوێتەوە. کە بە "حەمە سدیقی یەک دەست" ناوی دەرکردبوو. گەنجێکی ئەسمەری چالاک، لەبزووتنەوەی یەکێتی قوتابیانی کوردستانی ئەوسەردەمەدا، ڕێبەرێکی جوامێرو چاونەترس بوو. لەساڵی (١٩٦٣)دا دوای کودەتا ڕەشەکەی هەشتی شوبات لەلایەن فاشیستەکانەوە ئەگیرێ و دوایئەوەی هیچ نهێنییەک نادرکێنێ، لەژێر ئەشکەنجەدا لەتوپەتی ئەکەن!

وەرنەوە ناو گلێنەکانم؛
ئەی ئەرخەوان و گەڵاڕێزان

ئێستا؛ ئەوەندەمان نەماوە بگەینە ئەزمڕو لەوێشەوە بەرەو ناوگردان شۆڕبینەوەو خۆمان بکەینەوە بەو شارەدا، کەچەندین ساڵە خەونی پێوە ئەبینین. وەختێ گەیشتینە چایخانەکەی ئەزمڕ، ئۆتۆمبێلەکەمان وەستاندو هاتینە خوارەوەو چووینە سەر کانی و ئاوەکەو هەر لەناو لەپی دەستمدا چەند قومێکمان لەو ئاوە سازگارە خواردەوەو دەمو چاومان شتو سواربووینەوە، بەڵام چەند دیمەنێکی نائاساییمان بینی، کۆمەڵە خەڵکێ لەوێ بوون وەک لەشارەوە باریانکردبێ وابوو، لێمانپرسین "چییە؟!" لەوەڵامدا وتیان: (لەناوچەی گەرمییان، هێزی پێشمەرگەی کوردستان شەڕی پاشماوەکانی سوپای عێراقی ئەکات، بۆ ئەوەی ئەو ناوچانەیان لێپاکبکاتەوە، کە هێشتا دەستیان بەسەردا گرتوون). ئەو کاتەی ڕوومانکردە سەرەوە، لەڕێگا هەندێ پیکاب و ئۆتۆمبێلی ترمان بینی، کە دیاربوو لەشارەوە بەرەو گوندەکان کۆچیان ئەکرد. ئێمە لای خۆمانەوە وتمان: "چی ئەبێ باببێ و ئێمە بەرەو شار ئەچینو ناوەستین". لەسەر ترۆپکی ئەزمڕو لەو ئاستەدا، کە سلێمانیت لێدەرئەکەوێ، سەرنجماندا، لەدەشتاییەکانی خوار سلەیمانی، لەبەراییەکانی بەردەم گڵەزەردەو تانجەرۆدا، لەئەنجامی تۆپ بارانکردنەوە، لەسەریەک هێڵی ڕاست، لەچەندین شوێندا دووکەڵ و تەپ و تۆز بەرزئەبێتەوە. دواتر ئەم هەڵمەتەی پێشمەرگە بۆسەر پاشماوەکانی بەعس، لەناو خەڵکیدا بەڕاپەڕینی سێیەم ناوبانگی دەرکرد.

ئێوارەیەو خۆر لەدابەزیندایەو ئێمەیش لەدابەزیندا. دوای ئەو دابڕانە دورودرێژە، واخەریکم باوەش بەخۆشەویستترین شاری ئەم دنیایەدا بکەمەوەو چاوم بەزەردەی ئەم ئێوارەیە بڕێژمەوەو بچمەوە ناو دڵی شوێنی لەدایکبوون و منداڵی و هەرزەکاری و ماچی ئەو یەکەم لاپەڕەی دەفتەرە بکەم، کە یەکەمین شیعری خۆم لەسەر نووسیی. خۆر لەدابەزیندایەو ئێمەیش لەدابەزیندا. ئەو بەتیلماسکێ لەڕەنگی پرتەقاڵی کەناری ئاسمانی خۆرنشین ڕەنگ ئەکاو ئێمەیش بەچەند دڵۆپێ فرمێسکی سەر ڕوومەت هەموو یادگارو خەونەکانمان سەرلەنوێ پاراو ئەکەینەوە .!

نەوە لەدوای نەوە دێت و ئەڕواو بەڵام گوێژە ناڕواو لەهەڕووتەوە بەردەوام چاوی بڕیوەتە ئاسکەکانی کانی ئاسکان و تەختایی نێوان خۆی و گڵەزەردەو لەوەرزەکانی خەمدا گەڵاڕێزان باڵای دائەپۆشێ و لەوەرزەکانی خۆشی و شکۆفە کردنیشدا بەدەم نێرگزەکانی دامێنەوە پێئەکەنێ. خۆر لەدابەزیندایەو ئێمەیش لەدابەزیندا. ئەوەتا هەموو ئەو شتە بچووکو گەورانە ئەبینمەوە، کە لەغوربەتدا خەوی پچڕپچڕو ژاکاوم پێوە ئەبینین و ئێستە لەلایانم. ئەم هەتاوە لەشوێنێکی تر نییە، ئەم درەختانە لەشوێنێکی تر نەمدیون. ئەم مرۆڤە ستەمدیدەو ماڵ بەکۆڵانەم لەشوێنی تر نەبینیوە. ئەم وڵاتە خەمەکانیشی هەر جوانن‌و بەردەکانیشی هەر ناسکن! نزیکتربنەوە! ئەی ئەو کۆڵان و شەقامانەی ڕۆژێک نەبووە لەناو دیدەکانمدا نەبن. نزیکتر بنەوە!. ئەی ئەو باخ و گەڕەک و بازاڕو ماڵانەی، کە بەهیچ باخێکی ناو دنیاوو هیچ گەڕەک و ئەپارتمان و بازاڕێکی پۆشتەی ناو وڵاتانی ترم نەگۆڕیونەتەوە. نزیکتربنەوە! ئەی کتێبەکانی سەر شۆستەو ئەی منداڵە بۆیاخچییەکانی بەردەرکی سەراو ئەی پۆلەکچی پڕ لەکازیوەی بەیانیانی شارەکەم. نزیکتربنەوە .!

ئەی ئەو هاوڕێ خۆشەویستانەی لەنێو ئەو هەموو زریانانەی ڕۆژگاردا بەرگەتان گرت‌و سەربەرزانە لێیان هاتنەدەرەوەو نەگۆیژەو نەپیرەمەگرون و نەسەفین و نەهەڵگوردتان ڕوو زەرد نەکرد. نزیکتربنەوە! ئەی شاعیرانی شارەکەم! ئەی ئەو کلوە بەفرانەی هەر بەبێگەردی مانەوە. نزیکتر بنەوە! ئەی منداڵانی ڕووتەڵەی خانوە قوڕەکان و ئەی هەژارانی گەڕەکە میللییەکان! ئەی ژنانی ئەودیو دەرگا داخراوەکان. ئەی بێوەژنانی ئەنفال‌و ئەی پەرەسێلکەکانی ئاسمانی هەڵەبجە نزیکتر بنەوە!. باسەر لەنوێ لەدایکببمەوە. وەرنەوە ناو ئەم ڕۆحە پەژموورەدەیەو سەوزمکەنەوە. وەرنەوە بەردەمم، ئەی گاڵوڵ و پرچە

ڕەشەکانی کچانی شار، بادەستتان تێوە دەم و بەبۆن و بەرامەتان هەناسەکانم تازە بکەمەوەو ئەوسا جوانترین شیعرتان لەسەر هەورە سپییە نزمەکانی ئەم مەڵبەندە بۆ بنووسم و داکەمەوە باران و ببمەوە بەئەستێرکی خەونەکانتان و لەدوایشدا دیسانەوە بەهەڵمی مەراقتان و هەمدیسان بەتاوە لێزمەی بارێزەو زریان. وەرنەوە ناو گلێنەکانم ئەی دار ئەرخەوان و ئەی گەلاڕێزان و ئەی بێدەنگی گردەکەی سەیوان! نزیکبنەوە! ئەی حەوزە سەوزەڵەکەی مزگەوتی حاجی خان و ئەی ماسییە بچکۆلەکان و ئەی سایەقەی بەرزبووەی شەوانی هاوینان! نزیکبەرەوەو نزیکتر ئەی ئازادی! ئەی شاری تازەی دوای ڕاپەڕینو ئەی زەردەخەنەی چاوی شەقام و ئەی پەنجەرەی کراوەی سەر زامەکانمانو ئەی ڕیزە مۆمی گیانی شەهیدانی بەردەرکی سەراو ئەی دایکە ڕەشپۆشەکانی لێوانلێو لەفرمێسک و لەبۆنی ڕەشەڕیحانان. نزیکتربەرەوە نزیکو نزیکتر، ئەی شاری بێ بەعسو بێ جاش و بێ جەیشی شەعبیو بێ مونەزەمەو بێ ئەمنە سورەکەو بێ پیکابە زەردەکانی ئەمنو بێ گوڵی ترساوو بێ ئەستێرەی ڕاونراو .!

هاتوومەتەوە بۆ ئەوەی سەرم بکەم بەچاوگێکی تری داگیرساوی سەر جادەکانت، بۆ ئەوەی ئەم دەستانەم بکەم بەگوڵە هێرۆی ناو دەفتەری شیعرەکانت و هەناسەیشم بەسروەیەکی تری ناو ڕۆحە سپییەکەت! ئەزانم ماندوویتو ئەزانم برسیتو ئەزانم پرپریت لەخۆڵەمێش و لەسوتماکی جەستەی ئازیزان، بەلام من لەگشت وەرزێکدا، لەئاگر باران و لەهەڵوەرین و لەتەمتوومان و لەوەیشوومەکانی زریاندا، هەر کوڕی خۆت بووم، کوڕی بەفرتو کوڕی سرودەکانت و کوڕی شەوت بووم. ڕەنگە ترسابم، بەلام چۆکم دانەداوە. ڕەنگە تووشی نوچدان بووبم، بەلام چاوم دانەخستووە. ڕەنگە لاوازبووبم، بەلام شکستم نەخواردووە، ڕەنگە بێزاربووبم بەلام هەرگیز لەخۆشەویستیت لامنەداوە! شیعرم لەبەیانی تۆدا چاوی پشکوت و لەگڤەگڤی تۆدا گوێچکەی کرایەوەو لەڕێوبانی ئازارە دووردرێژەکانتا پێرەوکە بوو. هاتوومەتەوە بۆ ئەوەی وشەم بکەمە پەنجە بۆ سارێژکردنەوەی برینێکت و دەنگم بکەمە سروودێ بۆ شەقژنی ئاواتەکانتو ئەم چاوانەیش بەدوو زنەی ڕووناک لەوەرزی تینوێتیدا .

نزیکبەرەوە! نزیک و نزیکتر، چون نزیکی خاک و خۆڵ و نالیی، چون نزیکیی هەورامان و مەولەوی، چون نزیکیی گۆران و فرمێسک و هونەر! بمکەرەوە

بەمنداڵە زیت و سەرسامەکەی نێو دەواڵەکانی چیای چەرماوەند. بمکەرەوە بە پەپوولە خاڵخاڵەکەی دەوری کانی عاشقانی هەڵەبجەی جاران!

خۆر لەدابەزیندایەو ئێمەیش لەدابەزیندا. خۆشەویستیی گرتووینی و هەرسێکمان کرو بێدەنگ. خۆشەویستیی ئەوقی بەردەمی دوا پێچەکانی ئەزمڕی کردووین و خەریکە بگەینە دوا سەرەولێژی ناوگردان. چەند ساڵە بۆ ئەم ساتەوەختە ئەنووسم. چەند ساڵە بۆ ئەم خۆشەویستییە بومەتە زێوانی شیعرو بۆ ئەم دەقیقەی بەدیدار شادبوونەوەیە بەڕۆحی تۆ، بوومەتە قەقنەسیی سەرگەردانی هەندەران .

ئێستا؛ خەریکم دەست بۆ پرچە ئاڵۆزکاوەکانت بەرم و هێواش هێواش ڕایانکێشمو ماچیانکەم .

ئێستا لەسەر سەربانی ماڵێکی دوور، ژنێک بەدیەکەم تەنافێک ئەگێڕێو بەباو جووڵەیدا دایکمەو جلە شۆراوەکانی هەڵئەخات.

لەبەردەمی ڕیزە ماڵێکی قەراغ شاردا، ئەو منداڵە ڕووتەڵانە ئەبینم قاووقیژیانەو شوێن تۆپێک کەوتوون و منداڵیی خۆم دێننەوە بەرچاوم و زەردەخەنەیەکی خێرا دێتو دەمو چاوم ڕووناک ئەکاتەوە .

ئێستا لەڕیکۆردێکی دوورەوە، وەک لەپشت هەورێکەوە بێت، لەپشت ئەرخەوانەکانی سەیوانەوە، لەپشت مێژوویەکی خوێناوییەوە، دەنگە سیحراوییەکەی "بەهجەت یەحیا" ئەبیستم کەشیعرە پاییزیەکەی من، شیعرە غەمگینەکەم، "چل منداڵم چل جگەرم" ئەڵێت و دوازەردەی ئەم ئێوارەیەی لێئەچوڕێتەوەو هەموو جەستەم ئەکا بەمێرگی خەزانی ئاخ و ئۆفەکانی خۆی .

من ئەم ڕۆحە نەسرەوتەم هەر لێرەبووە! وشە چاوتەڕەکانم هەر لێرەبوون. هەناسە ساردەکانم هەر لێرەبوون. کوا من لەتۆ جیابوومەتەوە ئەی شاری ئەوینو خۆڵەمێشو گوڵو ئەی جریوەی غەمگین. کوا من لەتۆ دابڕوام. ئەوەتا منت کردووە بەشمشاڵ و ئەمژەنی. منت کردووە بەقەڵەمێکی کەسک و پێمئەنووسی .

خۆر لەدابەزیندایەو ئێمەیش لەدابەزیندا. ئەو تێکەڵاوی هەورە ئاڵ و نارنجی و پەمەییەکانی کەنار ئاسمانێکی خامۆش بووەو ئێمەیش تێکەڵی ئەو خەوە سپییەی واهاتۆتەدی .

سڵاو! ئەی چیمەنەکەی یانەی مامۆستایان! تۆ ئێستە بۆنی کۆڕی یاران‌و بۆنی هاوینانی جاران و بۆنی قسەی خۆشی "شێرزاد"ی هاوڕێمان و بۆنی فەرەنجی و جلە فۆلکلۆرییەکانی مامۆستا "عومەر عەبدولڕەحیم" و بزەی سمێڵەکانی "خاڵە شەمۆ"م بۆ دێنی !

سڵاو پەیکەرەکەی کاوەی ئاسنگەر!. سڵاو شەقامی تووی مەلیک! سڵاو ئەی یەکەم پۆلە کچی چاوڕەشی ئەم ئێوارە جوانەی "هەوارە بەرزە."

بەر لەوەی بگەمە بەر دەرگای ماڵی "گەزیزە" زنجیری جانتا دەستییەکەم ڕاکێشاو چاوم کەوتەوە بە "دەربەندی پەپوولە" و دڵنیابووم ماوەو ئامادەیە بۆ ئەوەی لەداهاتوویەکی زۆر نزیکداو لەئێوارە کۆڕێکی خۆشەویستی و شیعردا هەرچی پەپوولەی ناو دەربەندەکەی هەیە، هەڵیانڕژێنێتە سەر شانۆو ناو هۆڵ و ناو قژو ناو دڵی ئازیزان و بەدەنگی من دایانپۆشن .

**خۆر لەئاوا بووندایەو**

**بەڵام من تازە لە هەڵهاتندام!**

شێرکۆ بێکەس

٢٠٠٥/٤/٢٦

شێرکۆ بێکەس لە شازدەساڵیدا

شێرکۆ بێکەس لە حەڤدەساڵیدا

له ڕاستەوە: جەلال دەروێش/ شێرکۆ بێکەس

له ڕاستەوە: شێركۆ بێكەس/ محەممەد مەهدی جەواهیری/ ٣...
١٩٧٠

له ڕاستەوە: ڕەووف بێگەرد/ شێركۆ بێكەس/ جەلیل زەنگەنە

له ڕاستەوە: حەمەدییە میسری/ ئازادی تۆفیقی سەعاتچی/ سەباحی غالب/
هێمن موکریانی/ کامەران موکری/ شێرکۆ بێکەس/ محەممەدی حەمەباقی/
شەهاب عوسمان
دوانیشتووەکان: فوئاد حەمەئەمین سەڕاج/ جەمال حەسەن کوردە

لە کاتی خوێندنەوەی دەربەندی پەپوولەدا- ١٩٩١

لە کاتی پێشوازیی ژنەگوێگرێکدا

ڕەووف بێگەرد، لە کاتی خوێندنەوەی گوتاری دەستپێکی کۆڕی دەربەندی پەپوولەدا

قوتبەدینی سادقی/ شێرکۆ بێکەس/ ئەحمەد شاملوو
تاران- ١٩٩٦

بێگەرد/ بێکەس/ موکری- ١٩٩٨

له ڕاستەوە: بێگەرد/ حسێن عارف/ مام جەلال/ بێکەس/ موکری

قەلاچوالان- ١٩٩٩

له ڕاستەوە: جەمال غەمبار/ ڕەووف بێگەرد/ شێرکۆ بێکەس/ سەلام مەنمی

١٩٩٩

شێرکۆ بێکەس/ مام جەلال
ئەزمەڕ- ١٩٩٩

له ڕاستەوە: حەمە شوان/ جەمال عەبدول/ بێکەس/ سەعدی یووسف

د. فالح عەبدوولجەبار/ عەباس بەیزوون/ بێکەس

شێرکۆ بێکەس/ نەوشیروان مستەفا

مولازم عومەر عەبدوڵڵا/ بێکەس/ نەوشیروان مستەفا

شێرکۆ بێکەس لە ئۆفیسەکەی خۆی/ سەردەم- ٢٠١٣

( لە نێوان ئەو یادەوەرییانەدا، کە بووە بە گەنجینەی
هەر یەکێکمان یادەوەری وایان تێدایە تەنیا بۆ
هاوڕێکانمانی باسدەکەین.یادەوەری واشیان تێدایە
تەنانەت بە هاوڕێشی نالێین و تەنیا بۆ خۆمانی
دەگێڕینەوە. بە نهێنیش نەبێت بۆ خۆمانی ناگێڕینەوە.
بەلام یادەوەری وا هەیە تەنانەت مرۆڤ بۆ خۆیشی
دانی پیدانانێت.
دۆستۆیفسکی)